مراد حەکیم محەمەد

# ناکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی راگواستنی کورد لە عیراق لەسەردەمی بەعس دا

سەنتەری لیکۆلینەوەی ستراتیجیی کوردستان

مراد حەكیم محەمەد

# ئاكامە كۆمەڵایەتییەكانی سیاسەتی
# راگواستنی كورد
# لەعیراق لەسەردەمی بەعس دا

سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیجیی كوردستان
سلیمانی ٢٠٠٤

- مراد حەکیم محەمەد.
- ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاگواستنی کورد لەعیراق لەسەردەمی بەعس دا.
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستان.
- سلێمانی ٢٠٠٤.
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە.
- ژمارەی سپاردن: (٤٣٠)ی ساڵی ٢٠٠٤.
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی سەنتەر: ٧/٢٥/٤.

# پێشەکی

هەڵبژاردنی هەر بابەتێك بۆ نووسین، وێڕای چەند هۆکارێکی بابەتی زۆرجار پێویست دەکات پەیوەندیەك لە نێوان بابەتەکە و نووسەرەکەدا هەبێت. کەم وا ڕێدەکەوێ توێژەر بابەتێك هەڵبژێرێت بۆ توێژینەوە، هیچ پەیوەندیەکی بەخۆیەوە نەبێت. ئەو بابەتەی ئێمەش (ڕاگواستن) هەڵمانبژاردووە، لەم ڕێسایە بەدەر نییە. ڕاگواستن بابەتێك نییە تەنیا لەبەر ئەوە هەڵمانبژاردبێت کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بایەخ بە بابەتەکانی کۆچ و ڕاگواستن دەدەن، یاخود کۆچ ئەمڕۆ باسێکی گەرمی نێوەندە توێژینەوەیی و زانستیەکانە لە جیهاندا، هەروەها تەنیا لەبەرئەوەش نییە کە ڕاگواستن ستەمێکی دیکەیە لە کورد کراوە، هەروەکو هۆیەکە تەنیا ئەوەش نییە تا لە ڕێگەی ڕاگواستنەوە زێتر ستراکتوور و پێکهاتەی بەعس بناسین و ستەمەکانی بەرجەستە بکەین. جگە لەم هۆکارانەی لەسەرەوە ریزکران، ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی لە ئەنجامی ڕاگواستنی سەرتاپاگیر و درێژخایەنی کوردەکان لە کۆمەڵگای کوردیدا دروست بوو هۆکارێکی دیکەی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بوو. سەرباری ئەو هۆکارە بابەتیانەی لەسەرەوە ناویان هات، هۆکاری زاتیش ڕۆڵێکی بەرچاوی لەم نێوەدا هەبوو- ئەویش کورت دەبێتەوە لەو پەیوەندییەی توێژەر لەگەڵ ڕاگواستندا هەیەتی. توێژەر تەمەنی تەنیا سێ ساڵان بوو کاتێك لە لادێیەکی (ستۆپێ) سەر سنووری نێوان تورکیا ـ عێراق ڕاگوێزرا، جگە لە وردە بیرەوەریەکی زۆر کەمی ژیانی گوند تا تەمەنی بە ١٦ ساڵان گەیشت

نەیتوانی زێدەکەی ببینێتەوە ـ ئەو شوێنەی دایك و باوکی ١٣ ساڵ بەحەسرەتەوە چاوەڕێیان کرد تاکو دووبارە ڕەز و باغ و کانیاو و کێوەکانیان ببیننەوە. تۆژەر لە دێیەکەوە ڕاگوێزرا کە زستانان چەند مەتر بەفری لێ دەباری، بۆ شوێنێك کە بەدەگمەن لە ساردترین ڕۆژەکانی ساڵدا پڕوشکە بەفر ببینێت، هەروەها لە جەنگەڵستانێکەوە بۆ دەشتێکی رووتەن، وێڕای جیاوازی نێوان شێوەزار و دابونەریت و ڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان. هەموو ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی وەك ڕەسووڵ هەمزاتۆڤ دەڵێت: نە تەنیا تەپڵە ببێتە شەبقە، بەڵکو مێشکی ژێر سەرپۆشی لاوانیش بگۆڕێت و گۆڕی کورەکانیش لە گوندی باوکانیان دوور دوور بکەونەوە.

ئەو گۆڕانەی ڕوویدا ئەو جیاوازییەی نێوان نەوەی خۆی و باوکی و لێکچوونی دوو نەوەی باوك و باپیری پاڵنەرێکی بەهێزی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بوو.

لێرەدا پێویست دەکات ئاماژە بەوە بکەین کە لە توانای ئەم تۆژینەوەیەدا نییە وەکو پێویست باس لە سروشتی ئەو دوو جۆر ژیانە (ژیانی پێش ڕاگواستن و ژیانی دوای ڕاگواستن) بکات، یاخود پرۆسەی گۆڕانەکە و میکانیزمەکانی ڕوونبکاتەوە و ڕاڤەیەکی وردی ئەو ئاکامانەش بکات کە لە ڕاگواستنی کوردەکان کەوتوونەتەوە. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ: کەمی سەرچاوە و ئامارەکان، فرەوانی بابەتەکە، کەمی ماوە، نائارامی و پەشێوی بارودۆخی عێراق، گیروگرفتی دارایی و هاتووچوو، لە هەمووشی گرنگتر زۆربەی جاران نووسین لە گێڕانەوەی ئەزموونداکورت دەهێنێت، چونکە ئەم تۆژینەوەیە هەرچەندەش زانستی بێت، دواجار لە ئەزموونێك دەکۆڵێتەوە، ئەزموونی ژیانی ئەوانەی بەبێ ویستی خۆیان ڕاپێچی ناوچەی دیکە کران و فێرە شێوازی ژیانی دیکە بوون.

به چاوپێداخشاندنێکی سەرپێیانە بە ناوونیشانی تۆژینەوەکە (ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی راگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا) جۆرێك ناتەباییی لە ناوونیشانەکەدا تێدا بەرچاو دەکەوێت چونکە لەماوەی سالآنی ١٩٦٣ـ٢٠٠٣ تەنیا رژێمی بەعس فەرمانڕەوایی عێراقی نەکردووە، بەڵکو دوو برا (عەبدولسەلام عارف و عەبدولرەحمان عارف) کە لە سالآنی نێوان ١٩٦٣ـ١٩٦٨ سەرۆك کۆماری عێراق بوون بەعسی نەبوون، کەچی لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەشدا راگواستنی کوردان لە عێراقدا هەر هەبووە. بۆیە دەکرێ ئەوە چاوەڕێ بکرێت کە لە جیاتی ئەوەی لە ناوونیشانەکەدا ناوی رژێمی بەعس بێت، ناوی رژێمەکانی عێراق هاتبا، بەڵام ئێمە پێمانوایە ئەوەی یەکەم راستترە، واتە سیاسەتی راگواستنی کورد لەلایەن رژێمی بەعسەوە چونکە تەنیا بەعسیەکان وەکو سیاسەتێك راگواستنیان پیادە کردووە، نەك رژێمەکانی عێراق.

تۆژینەوەکەمان بۆ حەوت بەش دابەش دەبێت. لە بەشی یەکەمدا (میتۆد و رەهەندەکانی تۆژینەوە) هەوڵدراوە ئەو میتۆدانەی لە تۆژینەوەکەدا پەیرەو کراون، هەروەها ئامانج و پرس و گرفتەکانی تۆژینەوەکە وێڕای چەند مەسەلەیەکی دیکە کە پەیوەندیان بە شێوازەکانی لێکۆڵینەوەوە هەیە، بخرێنەڕوو.

لە بەشی دووەمدا: چوار چەمك، کە چەمکە سەرەکیەکانی تۆژینەوەکەن راڤەکراون. ئەو چەمکانەش بریتین لە: راگواستن، ئاکامی کۆمەڵایەتی، گۆڕانی کۆمەڵایەتی و بەعسیزم. لە راڤەی هەر یەکێك لە چەمکەکاندا تۆژەر مەبەستی بووە ئەوە روون بکاتەوە کە ئەم چەمکانە لەم تۆژینەوەیەدا چ دەلالەتێکیان هەیە و مەبەست چییە لێیان.

بەشی سێیەمی تۆژینەوەکە تایبەتە بە رەوشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی بەر لە ساڵی ١٩٧٠، زێتریش جەخت کراوەتە سەر ئەو ماوەیەی لە ماوەی زەمەنی تۆژینەوەکەمانەوە نزیکە، واتە پەنجا و شەستەکانی سەدەی رابردوو. ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەشکراوە، یەکێکیان لادێی کوردی و ئەویتر شاری کوردی. لە هەر یەکێك لەم دوو باسەدا چەند بابەتێك کە بە پێویست زانراون باسیان کراوە. مەبەست لەم بەشە ئەوەیە تیشکێك بخرێتە سەر کۆمەڵگای کوردی لەو کاتەی کە هێشتا زۆر سادە بوو. بۆ ئەوەی کاتێك لە بەشەکانی دواتردا باس لە کاریگەری راگواستن لەسەر کۆمەڵگای کوردی دەکەین، باشتر هەست بەو ئاکامانە بکرێت کە لە سیاسەتی راگواستن کەوتوونەتەوە.

بەشی چوارەمی تۆژینەوەکەمان تایبەتە بە راگواستن و قۆناغەکانی راگواستنی کورد لە عێراقدا. ئەم بەشەش دیسان بەسەر چەند باسێکدا دابەشکراوە. باسی سێیەمی ئەم بەشە تایبەتە بە سێ قۆناغی راگواستن: ١٩٦٣ـ١٩٧٤، ١٩٧٥ـ١٩٩٠ و ١٩٩١ـ٢٠٠٣. ئەم باسە لە دوو باسەکەی دیکە درێژترە و بەپشت بەستن بەو داتا و ئامارانەی دەستمان کەوتوون (وێڕای ئەوەی کەموکوڕیان زۆرە) بەپەیڕەوکردنی خرۆنۆلۆگیا راگواستنی لادێنشین و شارنشینە کوردەکان روونکراوەتەوە.

بەشی پێنجەم، یەکەم بەشی لایەنی مەیدانی تۆژینەوەکەیە، ناوونیشانەکەی بریتیە لە: ((دوای راگواستن: ئوردووگای زۆرەملێ، شار و لادێ))، سەرەتا لەم بەشەدا هەوڵمانداوە بەکورتی چەند ئاکامێك دەستنیشان بکەین کە زۆر گشتین و نەدەکرا لە یەکێك لەو سێ باسانەدا جێگەیان بکەینەوە کە ئەم بەشەیان لێ پێکدێت. دواتر لە باسی یەکەمدا باس لە ژیانی نێو ئوردووگا کراوە. ئۆردووگاکان

فۆرمێکی نوێی نیشتەجێبوونن لە کوردستانی خواروو. لە باسی دووەمدا بەمەبەستی دەستنیشانکردنی کاریگەری راگواستن لەسەر شارەکانی کوردستانی خواروو کارکراوە. لە دوا باسیشدا تیشکێك خراوەتە سەر گوندی سەر لە نوێ ئاوەدانکراوە.

درێژترین بەش لە تۆژینەوەکەدا، بەشی شەشەمە. لە دوو باس پێکهاتووە. لە باسی یەکەمدا خەسڵەتە گشتیەکانی نموونەی تۆژینەوەکەمان خراونەتەڕوو، لە باسی دووەمیشدا هەوڵدراوە خەسڵەتە تایبەتییەکانی نموونەی تۆژینەوەکە راڤە بکرێن. دوابەشی باسەکەشمان خستنەرووی ئەنجامەکانی تۆژینەوە و راسپاردە پێشنیارەکانن.

لەکۆتاییشدا هیوادارین ئەم تۆژینەوەیە توانیبێتی کەلێنیکی بچووك لە کایەی لێکۆڵینەوە لە کوردستانی خوارووداا پڕ بکاتەوە.

دانەر

# بەشی یەکەم

## میتۆد و رەهەندەکانی تۆژینەوە

### باسی یەکەم: پرس و ئامانج و گریمانەکانی تۆژینەوە

**١ـ پرسی تۆژینەوە**

کوردستانی خواروو لەدوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ بەشێوەیەکی بەرفرەوانتر و سیستماتیکتر لە جاران لەلایەن رژێمی بەعسەوە رووبەڕووی سیاسەتی راگواستن بووەوە. راگواستن وێڕای سیاسەتەکانی دیکە (بەعەرەبکردن، پاکتاویی رەگەزی، کیمیاباران و ئەنفال) کردەیەکی دوژمنکارانە بوو و لە میانەیدا دانیشتووانی کوردستان لەڕووی دەروونییەوە شۆکی گەورەیان بەرکەوت و لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە دووچاری زۆر دەردی کۆمەڵایەتی هاتن. هەروەها لەڕووی کولتووری و ئابووریشەوە زیانێکی زۆریان پێکەوت. زۆرترین ژمارەی کوردەکان لە سەر ئاستی وڵاتی عێراق جێگۆڕکێیان پێکرا، بەشێکیان بەرەو باشوری عێراق و بەشێکی دیکە بەرەو ناوەڕاست بەلای سنووری رۆژئاوادا و بەشێکی زۆریشیان هەر لە کوردستانی باشور نیشتەجێکرانەوە. وێڕای ئەوەی بەشێکی بەرچاوی کوردەکانیش بەرەو سنوورەکانی تورکیا و ئێران راپێچ کران یاخود ناچارکران بەرەو ئەو دوو وڵاتە کۆچ بکەن. بەکورتی زۆربەی دانیشتووانی کوردستانی باشور راگواستنیان بەجۆرێك لە جۆرەکان ئەزموون کردووە.

جێگۆڕکێی دانیشتووان لە جیهاندا پێشینەیەکی مێژوویی هەیە، هەروەها لەمێژیشە سەرنجی تۆژەر و باسکارانی راکێشاوە، چونکە تەنیا بە گۆڕانی شوێنی نیشتەجێبوون ناوەستێت، بەڵکو تاکە راگوێزراوەکان رووبەڕووی گۆڕانکاری گەورە دێن لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، کولتووری، دەروونی، ئابووری و... هتد.

پرسی ئەم باسە لەو ئاکامە کۆمەڵایەتییە جیاجیایانەدا کورت دەبێتەوە کە لە ئەنجامی راگواستنی کوردەکان لە عێراقدا لەلایەن رژێمی بەعس لە چل ساڵی رابردوودا سەریان هەڵداوە. چونکە هەموو شوێنگۆڕکێیەکی دانیشتووان چ بەویستی خۆیان بێت یاخود بە زۆرەملێ ئاکامگەلێکی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. ئەم توێژینەوەیە دەیەوێت تیشك بخاتە سەر ئەو ئاکامانە و بەشێوەیەکی روون و شەفافتر بیانخاتەڕوو، چونکە هێندەی ئێمە ئاگادارین بەشێوەیەکی زانستی لێیان نەکۆڵراوەتەوە و هیچ هەوڵێکی شیلگیر نەدراوە بۆ ئەوەی ئەو ئاکامانە بە وردی دەستنیشان بکرێن.

**٢ـ ئامانجی توێژینەوە**

هەموو باسێکی کۆمەڵایەتی ئامانجی تایبەت بەخۆی هەیە، توێژەری کۆمەڵایەتی هەوڵدەدات بیهێنێتەدی. ئەم توێژینەوەیەی ئێمەش چەند ئامانجێکی هەیە کە دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

١ـ دەستنیشانکردنی بەشێکی گرنگ و بەرچاوی ئەو ئاکامە کۆمەڵایەتیانەی لە سیاسەتی راگواستنی کوردان کەوتوونەتەوە. ئەویش بەسەرنجدان لە بونیادی کۆمەڵگا و شێوەی گوند و شارەکان و ستراکتووری خێڵی کوردی و بەپشت بەستن بە چاودێریکردنی رەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکان. هەروەها لەمیانەی ئەو داتایانەی لە رێگەی پرسیارنامەکە دێنەدەست و بەشێوەی ژمارە ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی راگواستن روونده‌کەنەوە.

٢ـ بەپشتبەستن بەو ئامار و زانیاری و سەرچاوانەی لەبارەی راگواستنەوە هەن، دەمانەوێ قۆناغەکانی راگواستنی کوردان لەلایەك و جۆرەکانی راگواستن لەلایەکی دیکەوە روونبکەینەوە، وێڕای هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی میکانیزمەکانی ئەو سیاسەتە و هەوڵدان بۆ خستنەڕووی زانیاریی ورد لەبارەی ژمارەی گوندە خاپورکراوەکان و راگوێزراوان.

٣ـ دەمانەوێ لە کۆتایی تۆژینەوەکەدا بگەینە چەند ئامانجێك و لەمیانەیدا زۆرتر روونده‌بێتەوە راگواستن چ گۆڕانکارییەکی لە کوردستانی باشوردا دروست کردووە و هەوڵدەدرێت ئەو دیاردە و ئاکامە نێگەتیڤانەی بەهۆی راگواستنەوە دروست بوون دەستنیشانیان بکەین و لە رێی پێشنیار و راسپاردەی تایبەتەوە هەوڵبدرێت بۆ کەمکردنەوەی کێشە و گرفتەکانی راگوێزراوان.

٤ـ زێتر تیشك خستنە سەر بابەتی راگواستنی کوردەکان و راکێشانی سەرنجی باسکار و تۆژەرە کورد و بیانییەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە لایەنە جیاجیاکانی راگواستنی کوردان، بەوەی بابەتێکە ئەوە دەهێنێت لەلایەنی زانستیەوە بایەخی پێبدرێت.

### ٣ـ گریمانەکانی تۆژینەوە

گریمانەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو پرسیارانەن کە لە سەرەتای هەر باسێکدا لەلای تۆژەری کۆمەڵایەتی گەڵاڵە دەبن. دارشتنی گریمانە لە ناوەندەکانی باس و تۆژینەوەدا بایەخێکی تایبەتیان پێدەدرێت، چونکە تۆژەر سوود لە گریمانەکان وەردەگرێت بۆ دەستنیشانکردنی ئەو تۆژینەوەیەی ئەنجامی دەدات. گریمانەکان تۆژەری کۆمەڵایەتی ئاراستە دەکەن بۆ ئەو راستیانەی کە پێویست دەکات لێیان بکۆڵێتەوە، هەروەها یارمەتی تۆژەر دەدەن بۆ دەستنیشانکردنی

ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان دیاردەکاندا دروست دەبن.[1]

دەکرێ گریمانەکانی ئەم تۆژینەوەیەش لەم چەند خاڵانەی خـوارەوەدا ریز بکەین:

١ـ لە کوردستانی باشور لە ئەنجامی راگواستنی کورداندا رێژەی لادێنشینەکان زۆر کەم بووەوە، لە بەرامبەریشدا بەشێوەیەکی بەرچاو رێژەی شارنشینان زێدە بوو.

٢ـ لە ئەنجامی راگواستندا خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی باشـور زۆرتـر تێکـەڵاوی یـەکتر بـوون و بۆچوونیـان سـەبارەت بەیەکتر گۆڕا.

٣ـ لـەدوای راگواسـتن بـەها کۆمەڵایەتییـەکان، داب و نـەریت و رەفتارو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا گۆڕانیـان بەسەردا هاتووە.

٤ـ بە شوێنگۆڕکێی رێژەیەکی زۆری خەڵك و دوورخستنەوەیان لـە شـوێنی نیشـتەجێبوونیان و تێکـەڵاوبوونیان لەگـەڵ یـەکتر دابونەریتەکانیشیان رووبەڕووی گۆڕان هاتن.

٥ـ لە کۆمـەڵگای کوردیـدا کێشـە و گرفتـە کۆمەڵایەتییـەکان لەدوای راگواستن پەرەیان سەند.

٦ـ کەسایەتیی تاکە راگوێزراوەکان هەمان کەسایەتی جاران نییە.

٧ـ لەگەڵ راگواستن و خاپوورکردنی گوندەکان ئابووری کوردستانی باشور رووبەڕووی تەنگژەیـەکی گـەورە هـات و ژێرخانـە ئابوریەکـەی لەبەریەك هەڵوەشایەوە.

---

1 عبدالباسط محمد حسن، اصول البحث الاجتماعي، مكتبة الانجلو المصرية، الطبعة الثالثة، القاهرة، ١٩٧١، ص٣٧.

## باسی دووەم: میتۆدی تۆژینەوە

زاناکانی کۆمەڵناسی هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی کۆمەڵناسی وەك زانستێك، داوایان لە تۆژەر و باسکاران کردووە لە باسە کۆمەڵایەتییەکاندا میتۆدە زانستیەکان بەکاربهێنن.[2] میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە، تەکنیکە راستەقینەکانی تۆژینەوەن کە بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی بەکار دەهێنرێن.[3] گرتنەبەری میتۆدێکی زانستی یان زێتر، بەپێی پێویستی تۆژینەوەکە دەبێت. دەشێ لە میتۆدێك زێتر لە لێکۆڵینەوەی بابەتێکدا بەکاربهێنرێت، ئەویش بەپێی ئەو پرەنسیپەی داوادەکات لە لێکۆڵینەوەی هەر دیاردەیەك یاخود گرفتێکدا تەنیا پشت بە تاك میتۆدی نەبەسترێت.[4]

پێمانوایە تۆژینەوە لە ((ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی سیاسەتی راگواستنی کورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا)) پێویست دەکات لەسەرێکەوە بگەڕێینەوە بۆ پێش ئەو ماوەیەی دەستنیشانمان کردووە، هەم بۆ زانینی پێشینەکانی راگواستنی کوردان لە عێراقدا و لە سەرێکی دیکەشەوە بپرژێینە سەر چۆنییەتی پیادەکردنی سیاسەتی راگواستن و دیارخستنی ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی لەو ماوەیەدا روویداوە، وێڕای باسکردنی شێوە نیشتەجێییەکانی کۆمەڵگای کوردی و ئەو گەشەسەندنەی بەخۆیانەوە بینیویانە. بۆ ئەم مەبەستەش پێویست دەکات زێتر لە میتۆدێك لەم تۆژینەوەیەدا بگرینەبەر.

لەم باسەدا لەبەر ئەوەی هەوڵدەدەین ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی

---

[2] لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: هەمان سەرچاوە، ل ٨٣ـ١١٣.

[3] انتونی گیدنز، جامعەشناسی، ت: منوچهر صبوری، نشر نی، تهران ١٣٧٣ (١٩٩٤)، ص ٧٠٩.

[4] د. غريب محمد سيد احمد، تصميم و تنفيذ البحث الاجتماعی، دار المعرفة الجامعية، القاهرة، ١٩٨٩، ص ٩٥.

راگواستنی کوردان بخەینەڕوو، لەگەڵ دەستنیشانکردنی ئەو گۆڕانانەی لە بونیادی کۆمەڵگای کوردی و شار و لادێدا دروست بووە، هەروەها چۆنییەتی تێکەڵاوبوونی خێڵەکان و ئەو ئاکامانەی لەم تێکەڵاوی و شوێنگۆڕکێ جوگرافییە کەوتوونەتەوە، ئەوا دەبێت سوود لە میتۆدی وەسفی (Descriptive Method) وەرگرین، چونکە بەکارهێنانی ئەم میتۆدە لەو جۆرە باسانەدا کە پێویستیان بە زانیاری زۆر و فرە هەیە بەسوود و گونجاوە. لەو لێکۆڵینەوانەشدا کە ئەم جۆرە میتۆدە بەکاردێت هەوڵدەدرێت پەیوەندی نێوان گۆڕاوەکان بدۆزرێتەوە.

میتۆدێکی دیکە کە وادەخوازرا بەکاربێت، بەتایبەتی لە بەشی سێیەم و چوارەمی تۆژینەوەکەدا میتۆدی مێژوویییە (Historical Method)، چونکە ئەو دوو بەشە زێتر پەیوەندیان بە رابردووی کۆمەڵگاکەمانەوە هەیە. تۆژەرە کۆمەڵایەتییەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە بزاڤ و گۆڕانکاری و شۆڕشەکان، لە ڕێی ئەم میتۆدەوە هەوڵدەدەن لە چۆنییەتی لایەنە جیاوازەکانی ژیان تێبگەن و فاکتەر، پەیوەندی، هۆ و ئاکامی ئەو ڕووداوانەی بوونەتە هۆی گۆڕانی کۆمەڵگا درك بکەن.[5] لەم ڕووەوە سوود لە سەرچاوە یەکەمەکانی وەك ئامارەکان و کتێبە مێژووییەکان لەلایەك و سەرچاوە دووەمینەکانی وەك چاوپێکەوتنی تاکەکەسان لەلایەکی ترەوە وەرگیراوە.[6]

سێیەم میتۆد، میتۆدی بەراوردکارییە (Comparative Method). لە دوو بەشی سێیەم و پێنجەمدا سوود لەم میتۆدە وەرگیراوە. بەتایبەتی لە بەراوردی نێوان شار و لادێی کوردی لە دوو ماوەی زەمەنی جیاوازدا.

---

5 د. مهدی طالب، شیوهای عملی مطالعات اجتماعی، انتشارات دانشگاه تهران، تهران ١٣٨٠ (٢٠٠١)، ص ٢١.

6 پەروین سازگارا، ئاوردانەوەیەك لە کۆمەڵناسی، و: جەواد مستەفا ستۆپەیی، زنجیرەی هزر و کۆمەڵ، هەولێر ٢٠٠٣، ل ٦٣.

میتۆدی ئاماری (Statistical Method)، تەنیا لە لایـــەنی مـــەیدانیدا بەکارهاتووە. هەروەها میتۆدی رووپێـــوی کۆمەڵایـــەتی (Social Survey Method) ش هەر لەو لایەنەدا بـــەکار هـــاتووە. ئـــەم میتـــۆدەی دوایـــی بەیـــەکێك لـــە میتـــۆدە ســـەرەکیەکان دادەنرێـــت لـــە لێکۆڵینـــەوە وەسفیەکاندا.[7]

لەلایەنی مەیدانیدا تەنیا پشتمان بە زانیاری ناو خشـــتەکان (ئـــەو داتایانەی لەرێگەی پرسیارنامەوە بەدەســـت دێـــن) نەبەســـت، چونکـــە پێمانوایە شێوازی چەندێتی (Quantitative) بـــە داتـــا ئاماریەکانییـــەوە بەس نییە بۆ تێگەیشتن لـــە هـــەندێ دیـــاردەی کۆمەڵایـــەتی. بۆیـــەش رێچکەی ئەو توژەرانـــەمان گرتەبـــەر کـــە پـــەنا دەبەنـــە بـــەر شـــێوازی چۆنییەتی (Qualitative) لەپاڵ شێوازی چەندێتیدا.[8] شتێکی نوێ نییـــە کە توژەران بەبـــەکارهێنانی شـــێوازی مـــەیدانی لـــە کۆمـــەڵگاکانیان بکۆڵنەوە. واتە توژەر خۆی داتا و زانیاری کۆبکاتـــەوە بـــە گرتنەبـــەری تەکنیکی چـــاودێریکردن بەبەشـــداربوون (الملاحقـــه بالمشـــارکه)، ئـــەم بایەخدانی توژەران بە کۆمەڵگاکانیان لە شەستەکانی سەدەی رابـــردوو گەشەی سەند.[9]

هەرچـــەندە ئـــەو پێشـــکەوتنانەی ئـــەمڕۆ لـــە شـــێوە جیاوازەکـــانی توژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا روویانداوە، ئەگەری ئەوەیان رەخســـاندووە

---

7 عبدالباقی عبدالجبار الحیدري، الاثار الاجتماعیة و الدیموغرافیة للنمـــو الحضـــري فـــی العـــراق، اطروحـــة دکتـــوراه، کلیـــة العلـــوم الانســـانیة والاجتماعیـــة، جامعـــة تونـــس، ۲۰۰۱ـ۲۰۰۲، ص ۱۹.

8 د. حسن الساعـاتی، تصمیم البحوث الاجتماعیة، دار النهضة العربیة، بیروت ۱۹۸۲، ص ۱۹٦.

9 لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ:د. کامیلیا فوزی، الصلح والاخریـــات، في وطـــني ابحث- المـرأة العربیة في میدان البحوث الاجتماعیة، ت: اسعد شریف، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت، ۱۹۹۳، ص ۱۸ـ۱۹.

زۆر لەو گۆڕاوانەی لـــە ڕواڵـەتدا چۆنیـەتین، لـە شـێوەی چـەندێتیدا دەرکـەون و ئـەمڕۆ زۆرینـەی تۆژینـەوە کۆمەڵایەتییـەکان بەشـێوەی تۆژینەوە چەندێتییەکان دەخرێنەڕوو، بەڵام هێشتاش هـەندێك دیـاردە یاخود هەندێ لە لایەنـەکانیان ئەگـەری گۆڕانیـان بـۆ نەرەخسـاوە و ناکرێ بە ژمارە دەستنیشانبکرێن، وەك ئەو دیاردانەی ئەتنۆگرافیسـت و ئەنترۆپۆلۆجیستەکان بایەخیان پێدەدەن.[10] لە بیست ساڵی رابـردوودا جۆرێك لە پەرچە کردار لەدژی شێوازە چەندێتییەکان لـە تۆژینـەوەی رەفتاری مرۆییدا سەریهەڵدا، ئەم پەرچەکردارە تا ئێستاش لەدژی ئـەو بانگەشە گەورانەی بۆ ئەم شێوازانە دەکرێـن لـە ئارادایـە. لەلایـەکی دیکـەوە ئـەتنۆگرافیا کـە هەمیشـە شـێوازە چەندێتییـەکان کـەم لەبارەیەوە بەکارهێنراون، بووەتە مۆدێلێك و هەندێ لە کۆمـەڵناس و مێژوونووسان دەیانەوێ ئەو رێچکەیـە بگرنـە بـەر.[11] ئێمـە نـەك بـۆ پەیڕەوی کردن لە ئەتنۆگرافیا پشتمان بـە شـێوازی چۆنیـەتی لـەپاڵ شێوازی چەندێتیدا بەستووە، بەڵکو ئێمـە لـەو بڕوایـەدایـن لـە رێـی بەکارهێنانی دوو شێوازەکە بە ئەنجامی وردتر دەگەین.

---

10 لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: مهدی طالب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

11 پیـتر بـرك، تـاریخ و نظریـة اجتمـاعی، ت: دکتر غلامرضـا جمشـیدیها، انتشـارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٨١ (٢٠٠٢)، ص ٤٨-٤٩.

# بەشــــی دووەم

## چـــەمکەکـــانی تـــوێژینەوە

### باسی یەکەم: ڕاگواستن

لە زمانی کوردیـــدا ڕاگواســـتن لـــە بەرامبـــەر زاراوەی ئینگلـــیزی ((Deportation)) دێـــت کـــە لـــە بنـــەڕەتدا لـــە زاراوەی ((Deportatio))ی ڕۆمانی وەرگیراوە. ئەمـــەی دواییـــان شـــێوەیەکی ســـزادان بـــوو، جـــۆری سزایەکەش نەفیکردن یاخود تاراوگە (ســـرگوون) بـــوو، ئـــەو کەســـەی حوکمـــی Deportatioی بەســـەردا بدرایـــە مـــافی هـــاوولاتیبوونی لێ دەسەندرایەوە.[1]

لـــە ئینســـکلۆپیدیای بـــەریتانیدا ((Deportation)) بریتییـــە لـــــە: دەرکردنی بێگانەیەك کە هەبوونی ئەو لە ولاتـــدا لەگـــەڵ بـــەرژەوەندی گشتی ڕێـــك نایەتـــەوە. ڕاگواســـتن زۆربـــەی کـــات مانایـــەکی فرەوانـــتر دەبەخشێ و نەفیکردن و دوورخستنەوە و گواســـتنەوەی تاوانبـــاران بـــۆ مۆڵگەی سزادانیان دەگرێتەوە.[2] هەروەها ئەنیسکلۆپیدیای ئەمریکیش پێناسەیەکی وەك ئەمەی سەرەوە بـــۆ ڕاگواســـتن دەکـــات. بـــەم پێیـــەش دەتوانـــین بڵێـــین ڕاگواســـتن لـــە زۆر لـــە ناوچـــەکانی جیـــهان تـــەنیا

---

1 THE ENCYCLOPEDIA AMERICANA, Vol.. 5 , International Edition, 1975, p. 746.

2 ENCYCLOPEDIA BRITTANICA,Vol. 4, U.S.A,1979, p. 474.

دوورخستنەوەی تاوانباران، بێگانەکان و یاساشکێنان دەگرێتەوە، واتە راگواستن وەك سزا پیادەدەکرێت و هیچ سزایەکیش بێتاوانان ناگرێتەوە. بۆیە لە سەردەمی مۆدێرندا کە راگواستن بە بەرفرەوانی ئەنجام دەدرێت، جیاوازی لە نێوان تاوانبار و بێتاواندا ناکرێت. پێویستە پێناسەیەکی دیکە بۆ راگواستن بکرێت.

هەندێ تۆژەر Deportation بە راگواستنی بێگانەکان پێناسەی دەکەن، واتە پرۆسەی راگواستنی کەسێکی بیانی لە ولاتێکەوە دوای ئەوەی فەرمانی دەرکردنی لە ولات دەردەچێت بەوەی کە کەسێکی نەویستراوە لە ولاتدا.[٣] بەلام نووسەر و تۆژەری دیکەش هەن کە وشەکانی ((Displacement or Expulsion)) لە جیاتی Deportation بەکاردەهێنن،[٤] کەچی لە پێناسەکردنی راگواستندا جەخت لەسەر گواستنەوەی تاکەکەس دەکەن لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە.[٥]

ئەمڕۆ Deportation تەنیا بەمانای راگواستنی هاوولاتیان بۆ ولاتێکی دیکە نایەت، بەلکو Deportation دەکرێ لەناو چوارچێوەی سنووری ولاتێکیشدا بەفرەوانی ئەنجام بدرێت. بەعس لە کوردستانی خواروو لە هەردوو گەڕی گرتنە دەستی دەسەلات لە عێراقدا (١٩٦٣ و ١٩٦٨) بە هەردوو ماناکە پیادەی کردووە.

---

3د. عبد الوهاب الكيالي و كامل الزهيري، الموسوعة السياسية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٧٤، ص ١٥٠.

4 عامر رشيد المبيض، موسوعة الثقافة السياسية الاجتماعية العسكرية، دار المعارف، دمشق، ١٩٩٩، ص ٣٤٧.

5 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە. هەروەها بگەڕێوە بۆ: عامر المبيض، معجم مصطلحات التنمية الاجتماعية والعلوم المتصلة بها، الامانة العامة لادارة العمل الاجتماعي، بلا، ١٩٨٣، ص ٤٩.

Deportation به کورتی واته راگواستنی زورەملێی دانیشتووان.[6]
هەروەها دەشێ بڵێین راگواستن: ((گواستنەوەی جوگرافی یا شوێن گۆڕینی بەزۆر دەگەینێ لەڕێی بەکارهێنانی توقاندن و فشار خستنەسەر و هێز بەکارهێنانەوە، کە گۆڕینێکی هەمیشەیی لەجێی نیشتەجێبوون و ماڵی ئاسایی لە یەکەیەکی جوگرافی بۆ یەکەیەکی جوگرافی تر لەخۆ دەگرێت.))[7]
لەم باسەدا مەبەست لە راگواستن: راگواستن و کۆچپێکردنی دانیشتووانی کوردە بە دەستی رژێمی بەعس لەناو سنووری دەوڵەتی عێراقدا، بۆ ناوچەیەکی دیکە لە ناوەوەی عێراق یان دەرەوەی. بەم پێیە ئێمە لە کوردستانی خوارووا زیدەتر لە جۆرێکی راگواستنمان هەیە. بۆ ئەوەی خوێنەر لە مەبەستی ئێمە باشتر ئاگادار بێت بە پێویست دەزانین ئاماژە بەم جۆرانەی خوارەوە بکەین:
١ـ حکومەت بە هۆیەکانی گواستنەوەی خۆی راگوێزراوەکان دەگوازێتەوە و رێگەیان پێدەدات کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، وەك ئەوانەی لە ساڵی ١٩٧٥ راگوێزران.
٢ـ حکومەت بە هۆیەکانی گواستنەوەی خۆی راگوێزراوەکان دەگوازێتەوە و جگە لەوەی رێگەیان پێدەدات هەموو کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، بەجۆرێك لە جۆرەکان قەرەبووشیان دەکاتەوە، خانووی نوێیان لە ئوردووگای نوێ دروست کراودا بۆ ئامادە دەکات، وەك ئەوانەی لە ساڵانی ١٩٧٧ـ ١٩٧٩ راگوێزران.
٣ـ حکومەت بە هۆیەکانی گواستنەوەی خۆی راگوێزراوەکان

---

6 مجدى وهبة و وجدى غالى، معجم العبارات السياسية الحديثة، الطبعة الثانية، مكتب لبنان، بيروت، ١٩٩٢، ص ٨٧.
7 سلێمان عەبدوڵلا، راگواستنی گوندنشینەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، سەنتەری برایەتی ، ژمارە ١٢، هەولێر حوزەیرانی ١٩٩٩، ل ٤.

دەگوازێتەوە، بەڵام ڕێگەیان پێنادات کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن. هەروەها ناچاریان دەکات خاکی عێراق بەجێ بهێڵن، وەك کوردە فەیلییەکان یاخود کەسوکاری پێشمەرگەکان لە ساڵانی ١٩٨٥، ١٩٨٧.

٤ـ حکومەت بە هۆیەکانی گواستنەوەی خۆی ڕاگوێزراوەکان دەگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دیاریکراو و ڕێگەیان پێدەدات کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن و بڕێك پارەشیان پێدەدات بۆ ئەوەی بۆ خۆیان خانوو دروست بکەن، وەك دانیشتووانی شاروچکەی قەڵادزێ و دەوروبەری ساڵی ١٩٨٩، هەروەها دانیشتووانی ناوچەی مێرگەسوور ساڵی ١٩٩٠.

٥ـ حکومەت ڕاگوێزراوەکان ئاگادار دەکاتەوە کە دەبێت شوێنی نیشتەجێ بوونیان بەجێ بهێڵن و لەو شوێنانەشدا نیشتەجێ نەبن کە ئەو دیاریان دەکات و جگە لەوەی کە پێویستە بەرەو باکور یان بەرەو باشور کۆچ بکەن هیچ شوێنێکیان بەوردی بۆ دەستنیشان ناکات. لەم جۆرە ڕاگواستنەدا، ڕاگوێزراوان هەندێ کات بۆیان هەیە هەموو کەلوپەلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، هەندێ کات هیچ کەلوپەلێك و هەندێ کاتی تر بەشێك لە کەلوپەلەکان، وەك ڕاگوێزراوەکانی شاری کەرکوك، مەخموور، مووسڵ و ...هتد لەساڵانی دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١.

٦ـ ڕاگوێزراوەکان لە ئەنجامی ترس لە پەلاماری حکومەت زۆربەی زۆری کەلوپەلەکانیان بەجێدەهێڵن و ملی ڕێگا دەگرنەبەر بۆ ڕزگارکردنی گیانیان لە دوژمن، وەك ئەوەی لە نسکۆی ساڵی ١٩٧٥، ئەنفالەکان یان کۆڕەوی ساڵی ١٩٩١دا ڕوویدا.

٧ـ دوای ئەوەی خەڵکێکی زۆر لەلایەن سوپاوە دەگیرێن بەبێ ئەوەی ڕێگە بدەن هیچ کەلوپەلێکی خۆیان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن لە شوێنێك بەند دەکرێن، هیچ شتێکیشیان پێ نابەخشن، نە پارە،

نەکەرەستەی خانووبەرە و نەهیچ شتێکی دیکە وەك ئەوانەی لە ئەنفالەکان دەستگیر کران و دواتر لە ئوردووگاکانی بەرحوشتر، جیژنیکان لە پاریزگای هەولێر یان ئۆردووگاکانی گەرمیان نیشتەجێ کران ساڵی ١٩٨٨.

ئێمە بۆ ئەوەی بزانین راگواستن چییە یان راگوێزراو کێیە، ئەم دوو مەرجەی خوارەوە رەچاو دەکەین:

١ـ راگواستن مەرجە کردەیەکی بە کۆمەڵ بێت، واتە راگواستن ناکرێ تاکەکەسی بێت، بەڵکو پێویستە کۆمەڵە کەسێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە راگوێزرا بن.

٢ـ حکومەت راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ دەستی لە چۆڵکردنی شوێنێك یاخود راگواستنی کۆمەڵە کەسێکدا هەبێت. مەبەست لە وشەی ((راستەوخۆ)) واتە حکومەت بڕیاری راگواستنی راگوێزراوەکان بدات و پیادەی بکات. هەروەها مەبەست لە ((ناراستەوخۆ)) ئەوەیە کە راگوێزراوەکان لە ئەنجامی رەفتاری دوژمنکارانەی حکومەت یان ترس لە گرتن و مردن بڕیاری چۆڵکردنی ناوچەیەك دەدەن یاخود بە کۆمەڵ کۆچ دەکەن واتە "کۆچی ناچاری".

هەر لێرەدا پێویستە ئێمە جیاوازی لە نێوان دوو جۆر ((کۆچ))دا بکەین، کۆچی زۆرەملێ و کۆچی ناچاری. مەبەست لە کۆچی زۆرەملێ ئەو کۆچەیە کە کۆچەرەکان راپێچدەکرێن و دەگوازرێنەوە بۆ شوێنێکی دیکە. لەم جۆرە کۆچەدا لایەنێکی بڕیاردەر هەیە کە لەم سەردەمەی ئێمەدا حکومەت یان دەوڵەتە. حکومەت بە مەبەستێکی سیاسی، گەشەپێکردنی و... هتد بڕیاری گواستنەوەی کۆمەڵە خەڵکێك لە دەڤەرێکەوە بۆ دەڤەرێکی دیکە دەدات. کۆچپێکراوەکان هیچ ویستیان لەم کۆچەدا نییە، بەڵکو لە سەرووی ویستی ئەوانە. ئەوان جگە لە

ملکەچ کردن بۆ بڕیارەکە هیچ مافێکی دیکەیان نییە و پێویستە بۆ ئەو شوێنە بکەونەڕێ کە بۆیان دیاری کراوە.

لە بەندی ٩ی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤدا هاتووە: نابێ هیچ مرۆڤێك بە شێوەیەکی زۆردارانە دوور بخرێتەوە. لە بەندی ١٣ شدا هاتووە کەوا هەموو مرۆڤێك بۆی هەیە شوێنی نیشتەجێبوونی لەناو سنووری هەر دەوڵەتێکدا هەڵبژێرێت، هەروەها مافی جێهێشتنی هەر وڵاتێکی هەیە تەنانەت وڵاتی خۆی، وێڕای ئەوەی مافی گەڕانەوەشی هەیە بۆی.[٨]

ڕەنگە ڕاگواستنی لادێنشینانی کوردستان لە سالآنی ١٩٧٥، ١٩٧٧ـ ١٩٧٩ دیارترین نموونەی ئەو کۆچە زۆرەملێیە بن لەناو سنووری وڵاتێکدا کە عێراقە. لە یەکێتی سۆڤیەت لە سەردەمی جۆزێف ستالین، ملیۆنان کەس دووچاری ڕاگواستن بوونەوە، هەر لە جووتیارەکانەوە بگرە تا زیندانییە سیاسییەکان، بەڵام زۆربەیان بێ تاوان بوون، لە کەمپەکانی دەست بەسەری سێبیریادا و بە لەڕولاوازی لە بارودۆخێکی ترسێنەردا ژیانیان دەبردەسەر. زۆر لەمانە هەرگیز نەگەڕانەوە. هەرچەند دوای مردنی ستالین کەمپەکان داخران، بەڵام سێبیریا* هەر وەك مەنفایەك بۆ زیندانییە سیاسییەکان مایەوە، بەڵام سەبارەت بە جێگۆڕکێی دانیشتووان لە نێوان دوو وڵات یان زێتردا کە هەمان ئەو کۆچە زۆرەملێیەیە، ئەوا بەپێی ڕێکەوتنێك یان پەیمانێك کە لە نێوان دوو دەوڵەت یان زێتر دەبەسترێت، بەئەنجام دەگات. بۆ نموونە لەدوای شەڕەکانی بەلقان (پەیمانی بۆخارست، ١٩١٣) و شەڕی

---

[٨] جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٨ و ٩.

* سێبیریا هەر لە سەردەمی قەیسەرەوە مەنفا بووە، واتە ستالین سێبیریای نەکردە مەنفا، بەڵام لە سەردەمی ستالیندا زۆرترین خەڵك بەرەو ئەوێ ڕاپێچ کران.

یونـان ـ تورکیـا (پـەیمانی لـۆزان، ١٩٢٣*) یـاخود لـەدوای چـەند پەیمانێکی تایبەتی لە ١٩٢٥، ١٩٣٦ لە نێوان تورکیـا، بۆلگاریـا و رۆمـانیا، ٢٧٠ هەزار بۆلغار، ٥٥٠ هەزار تورك و ١\٣ ملیۆن یونـانی ئیجە، ئەنادۆڵ و پۆنتی جێگۆڕکێیان پێکرا.[9]

ژمارەی پەناهەندەکان بۆ ئـەوروپا لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩١٤ ـ ١٩٢٢، نزیکەی ٥ ملیۆن کەس مەزەند دەکرێن. لە ئەنجامی جـەنگی نـاوخۆیی ئیسپانیاشـدا نزیکـەی ٥٠٠ هـەزار کـەس ئـاوارەبوون و جێگۆڕکێیان پێکرا.[10]

بەدرێژایی جەنگی دووەمی جیهانی، ئەم شێوازە هەر بەردەوام بـوو: لە یەکـەم بزاڤـی لـەم جـۆرەدا، ٧٠٠ هـەزار ئـەڵمانیایی ئـەوروپای رۆژهەڵات لە ساڵانی ١٩٤٠ـ ١٩٤١ بۆ ئـەڵمانیا راگوێـزران، پاشـان نۆرە بە ٤٠٠ هەزار فنلەندی کارلی ـ کـە لـە ١٩٤١دا بـە سـۆڤیەت راسپێردرابوون ـ گەیشت، ئـەو کـات کـە گۆڕانکاریـەکانی پێکـەوە بەسـتنی نەمسـا لەگـەڵ ئـەلمانیا لـە سـاڵانی ١٩٣٩و ١٩٤١ کـە سـنوورەکانی بـەلقانی گۆڕیـن، ٢٣٠ هـەزار مەجـەری، ٣٢٠ هـەزار رۆمـانی، ٦٠ هەزار بۆلگار، ٣٠٠ هەزار سربی، ٧٠ هـەزار کرواتـی و ٩٠ هەزار یونانی جێگۆرکێیان پێ کرا.[11]

---

*هەرچەند ئەمانە لـە ئـەنجامی پـەیمانی نێـوان دوو دەوڵـەت یـان زیـاتردا شـێوەیان وەرگرت، بەڵام چونکە مـەرج نییـە بـە خواسـتی خەڵکەکـە بـێ، ئـەوا بـە ڕاگواسـتن لەقەڵەم دەدرێ.

9 رولان برتون، قـوم شناسـی سیاسـی، ت: نـاصر فکوهـی، نشـر نـی، تـهران ١٣٨٠ (٢٠٠١)، ص ١٩١

10 ایو میشو، خشونت دست اموز، ت: بابك سید حسـینی، مرکـز چـاپ و انتشـارات صحیفه وزارت امـور خارجه، تهران ١٣٨١ (٢٠٠٢)، ص ٣٨.

11 رولان بارتون، هەمـان سەرچاوە، هەمـان لاپەڕە.

ئیۆڤ میشۆ پێی وایە جێگۆڕکێی دانیشتووان بە یەکێك لە دیارترین تایبەتمەندیەکانی توندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا لەقەڵەم دەدرێت. پاکسازی نەتەوەیی و جێگۆڕکێی دانیشتووان کە لە ئەنجامی ئەم پاکسازیەوە دێتە پێش لە ڕەنگدانەوە بەرجەستەکانی ئەم جێگۆڕکێیانەن. ئەمە قەیرانێك نییە لە سەردەمی تەنگەژەی یۆگۆسلافیا یاخود تەڤکوژیەکانی ڕوەندا دەستی پێ کردبێت. سەدەی بیست سەدەی ڕاگواستنی دانیشتووان و گواستنەوەیان بووە بۆ ئوردووگاکان.[12]

لە کوردستانی خواروو جێگۆڕکێی دانیشتووان هەمیشە تەنیا بە گواستنەوە و چۆڵکردنی ناوچە کوردنشینەکان کۆتایی نەدەهات، بەڵکو شوێنەکەیان پڕدەکرایەوە بە هێنانی عەرەب بۆ شوێنی کوردەکان لەو ناوچە کوردنشینانەی کە هاوسنووری ناوچە عەرەبنشینەکانن یاخود هەردوو نەتەوەکە لێی نیشتەجێن. ئەمەش هاوشێوەی ڕاگواستنی فەلەستینیەکان و نیشتەجێکردنی جوولەکە بوو لە شوێنیان لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا کاتێك ١,٣ ملیۆن فەلەستینی ئاوارەبوون.[13]

دووەم جۆری کۆچ کە ئێمە دیسان بە ڕاگواستن لەقەڵەمی دەدەین، کۆچی ناچاریە، واتە ناچارکردنی تاکەکەسان لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە بۆ بەجێ هێشتنی شوێنی نیشتەجێ بوونیان بەمەبەستێکی سیاسی نەك بۆ مەبەستی گەشەسەندن و پەرەپێدان، یان لەبەر کارەساتێکی سروشتی وەك لافاو یان گڕکان. لە فەرهەنگی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هاتووە: ئەم جۆرە کۆچکردنانە تایبەتن بەو

12 ایو میشو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥.
13 هەمان سەرچاوە، ل ٣٨.

کەسانەوە کە لە ڕێگەی کۆچکردنەکانەوە لە وڵاتەکانیان ڕاپێچ دەکرێن، یان کراون بە کۆیلە و گیرودەی گواستنەوە ناچاریەکانی دانیشتووان هاتوون؛ یاخود وابەستەیە بەو کەسانەوە کە لە ئەنجامی دژایەتی ئایینی و سیاسی ڕێگەی پەناهەندەییان گرتوتە بەر.[14] ئێمە تەنیا دوابڕگەی ئەم پێناسەیە بە ڕاست دەزانین سەبارەت بەم جۆرە ڕاگواستنە، بڕگەی یەکەمی پێناسەکە هەمان ڕاگواستنی زۆرەملێیەکە پێشتر ئاماژەمان پێکرد. ئەم جۆرە ڕاگواستنە (کۆچی ناچاری) لە فەلەستین[15]، لوبنان[16] و لە کوردستانی خوارووادا بەباشی دەردەکەوێت کە بەزەبری هێز خەڵکەکە ناچار دەکرێن شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان بەجێ بهێڵن. لە کوردستانی خوارووادا ئێمە چەندین حاڵەتی لەو شێوەیەمان هەیە وەك ڕژانی بە لێشاوی دانیشتووانی کوردستانی خواروو بۆ ناو سنووری ئێران لەدوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥، ئەو خەڵکانەی شار و لادێی کوردستان کە لە ساڵەکانی نێوان ١٩٨٠ـ ١٩٨٧دا ماڵ و حاڵیان بەجێ دەهێشت و ڕوویان دەکردە ناوچە قەدەغەکراوەکان (ئەو شوێنانەی بەدەست هێزی پێشمەرگەوە بوون) یاخود وڵاتی ئێران، کۆڕەوی بەهاری ساڵی ١٩٩١. ئەم نموونانە و چەند حاڵەتێکی دیکە لەم باسەدا بە ڕاگواستن لەقەڵەم دراون، چونکە ناڕاستەوخۆ دەستی حکومەتی عێراق لە ڕاگواستنیاندا

---

14 جولیوس گولد و ویلیام ل. کولب،.فرهنگ علوم اجتماعی، ت: باقر پرهام ودیگران، انتشارات مازیار، تهران، ١٣٧٦ (١٩٩٧)، ص ٢٢٦

15 لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ:د. منصور الراوی، دراسات فی السکان والعمالة والهجرة فی الوطن العربي، دار الکتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل ١٩٩١، ص ٢٧٢.

16 لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: د. زهیر الحطاب، الانعکاسات الاجتماعیة والنفسیة لمشکلة التهجیر، دراسات عربیة، العددان ٨ - ٩، السنة الثالثة عشر، حزیران و تموز، بیروت ١٩٧٧، ص ٧٤ ـ ٧٦.

هەیە؛ ئەوان بەناچاری کۆچیان کردووە.

ئێمە بەر لەوەی هەوڵبدەین ژمارەی گوندە خاپوورکراوەکان و دانیشتووانی راگوێزراو بدەینە دەست، پێمانوایە باشترە ئاماژەیەك بەو هەوڵانە بدەین کە لەو پێناوەدا دراون. دەشێ بڵێین ئەو هەوڵانە تا ئەمڕۆ دوور نین لە کەموکووڕی و نەیانتوانیوە ژمارەیەك بدەنەدەست کە دوور بێت لە گومان. یەکەم هەوڵ لەم بارەوە کتێبی ((ئەمنی ستراتیجیی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس))ە، نووسینی ((ئەمین قادر مینە))[17]. بەشی دووەمی ئەو کتێبە (ل ١٣٧ـ ٢٢٥) تایبەتە بە راگواستن، وێڕای ئەوەش ناوی زۆربەی گوندە راگوێزراوەکانی کوردستانی خوارووی لەدوای ساڵی ١٩٧٥ تاکو ساڵی ١٩٨٦ لەخۆ دەگرێت. ئەم کتێبە ئێستاش نرخی خۆی هەر ماوە، ئەگەرچی هەندێك کەموکووڕیشی هەیە، لە دیارترین ئەو کەموکوورییانەش: یەکەم، لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨٧ چاپ بووە، تەنیا ئامارەکانی راگواستنی نێوان ساڵەکانی ١٩٧٥- ١٩٨٦ لەخۆ دەگرێت. دووەم، ژمارەیەکی زۆری ناوی ئەو گوندانەی لەو ماوەیەدا راگوێزراون نەزانراوە و تۆمار نەکراون. بەداخەوە لەچاپی دووەمیشدا ئەم کەموکووڕیانە چارەسەر نەکراون، هەر بۆیە لەڕووی ئامارەوە کەموکووڕی هەیە.

دووەمین سەرچاوە لەم بارەیەوە کتێبی ((وێرانکردنی وڵاتێك)) لە

---

17 ئەمین قادر مینە، ئەمنی ستراتیجیی عێراق و سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل تەبعیس تەعریب، چاپی دووەم، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩. ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٨٧ وەك سێیەم کتێبی زنجیرەی لێکۆڵینەوەی دەزگای رۆشنبیری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بڵاوکرایەوە. هەروەها دوای ١٢ ساڵ سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان بۆ جاری دووەم بەبێ دەسکاری لە چاپیدا.

نووسینی شۆڕش ڕەسولە[18]، ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٩٠ لە ئەمەریکا چاپ بووە. لەم کتێبەدا وەك نووسین و ڕاڤە لەمەڕ ڕاگواستن هیچ نەنووسراوە، بەڵکو تایبەتە بە خستنەڕووی ئامارەکانی گوند، بنکەی تەندروستی، قوتابخانە، مزگەوتە خاپوورکراوەکان لە کوردستانی خواروو لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ـ١٩٨٩، ئەم کتێبە بە زمانی ئینگلیزی نووسراوە و وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی. هەروەها لە سەر ئاستی دەرەوەش باوەڕپێکراوە. ئەم سەرچاوەیە لەڕووی داتاکانەوە زۆر لە کتێبەکەی پێشتر دەوڵەمەندتر و وردترە، بەڵام دیسان ئامارەکانی ناو ئەم کتێبەش کەموکووڕیان هەیە و نووسەر تەنیا ناوی ٣٨٣٩ گوندی ژماردووە، لەکاتێکدا ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکان لەوە زێترە. ئامارەکانی ئەم کتێبە لەبارەی ژمارەی گوندە خاپوورکراوەکان لە کوردستانی خواروو بووە بە یەکێك لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، تەنانەت هەندێ نووسەر و توێژەر بڕوای تەواویان پێ هەیە و وەك تاکە سەرچاوە لە خستنەڕووی زانیاریەکاندا پشتی پێ دەبەستن. لەوانەش بۆ نموونە نوری تاڵەبانی، خەلیل ئیسماعیل، هەروەها سلێمان عەبدوڵڵا لە باسەکەیدا ((ڕاگواستنی گوندنشینەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا)) (سلێمان عەبدوڵڵا، هەمان سەرچاوە) وەك تاکە سەرچاوە وەریگرتووە و لەم بارەیەوە دەڵێت: ڕەنگە گرنگترین لێکۆڵینەوە لەمەڕ ڕاگواستن ئەوەی ((شۆڕش ڕەسووڵ)) بێت لە بەیاناتی ژمارەیی لەبارەی گوندە خاپوورکراوەکان و... درێژەی پێدەدات و دەڵێت: ((ئێمەش لێرەدا لەبەر گرنگی و وردیی بەیاناتەکان پشت بەو زانیاریانەی کە لەخشتەکانی ئەو ئامارانەدا هاتوون دەبەستین، پاش ئەوەی لە ڕاستی هەندێ لەو زانیاریانەمان کۆڵیەوە)). هەروەها لە

18 Shoorsh M. Resool. Statistics of Atrocities in Iraqi Kurdistan, U.S.A. 1990.

باسێكی دیكەشدا بە ناوی ((گۆڕانكاری چەندێتی جێنشینە دێهاتیەكان لە هەرێمی كوردستانی عێراق)) (سەنتەری برایەتی، ژمارە ١٧، پایزی ٢٠٠٠، ل ١٥٩ ـ ١٨٣) لە خستنەڕووی داتاكان زۆرترین پشت بەم سەرچاوەیە دەبەستێت. بە پێی ئەم كتێبە بێت دانیشتووانی تەنیا ٤٠ گوند لە ساڵەكانی ١٩٧٧ـ١٩٧٨ لە پارێزگای دهۆك راگوێزراون. لەكاتێكدا ئێمە لە كتێبی ((ئەمین قادر مینە))دا دەخوێنینەوە كە لەو دوو ساڵەدا زیاتر لە ٢٠٧ گوند لە پارێزگای دهۆك خاپووركران لە كاتێكدا ئەم ژمارەیەش ژمارەیەكی ورد نییە و گوندە خاپووركراوەكان لەم ڕێژەیەش زیاترن. لە راستیدا دوای ئەوەی ئێمە لە زانیاریەكانی ناو ئەم كتێبەمان كۆڵیەوە، بۆمان دەركەوت ئەو زانیاریانە لەبەر چەند هۆیەك لە هەندێك رووەوە كەموكوڕیان هەیە.* بۆیەش ناكرێت هیچ باسكارێك تەنیا پشت بەم كتێبە ببەستێت بەتایبەتیش ئەو بەشەی كە تایبەتە بە پارێزگای دهۆك و مووسڵ، هەروەها هەردوو ناوچەی مێرگەسوور و سیدەكان. لە هەموویشی خراپتر ئەوەیە كە ئەم توێژەرانە گەیشتوونەتە ئەو راستیەی كە ئەم كتێبە زۆربەی هەرە زۆری گوندە راگوێزراوەكان لە خۆی دەگرێت، لە ئەنجامی ئەوەشدا خوێنەران و چاودێرانیش دەگەنە ئەو باوەڕە هەڵەیە.

پێمانوایە ئەو ژمارەیەی شۆڕش رەسووڵ تۆماری كردووە ژمارەیەكی كەمە بۆ گوندە خاپووركراوەكانی كوردستان. میدل ئیست وۆچ ئاماژە بە ئامارێكی وەزارەتی ئاوەدانكردنەوەی** حكومەتی هەرێمی

---

*ئەم كتێبە سەرەڕای هەموو كەموكوڕیەكانی تا ئێستاش متمانەپێكراوترین و تەنانەت وردترین سەرچاوەیە.

** ئەو ئامارەمان دەست نەكەوت.

کوردستان کردووه، کە لەو ئامارەدا ناوی ٤٠٤٩ گوند تۆمار کراون.[19]
لە بەرامبەر ئەوەشدا ئەو ژمارەیەی کە دەسەلاتی کوردی زۆربەی جاران ئاماژەی پێدەکات بەبێ ئەوەی ئامارێکی رەسمیان هەبێت هێندەی ئێمە ئاگاداربین، واتە ٤٥٠٠ گوند، راسترە.

وەك ئامارێکی سەرەتایی دەتوانین هەندێك ئامار بخەینەڕوو بەم شێوەیەی خوارەوە:

- لە ساڵەکانی ١٩٧٥ـ ١٩٧٦ نزیکەی ٦٨٠ گوند خاپوورکران.
- لە ساڵەکانی ١٩٧٧ـ ١٩٧٩ نزیکەی ٩٠٠ گوند خاپوورکران.
- لە ساڵەکانی ١٩٨٠ـ ١٩٨٦ نزیکەی ٤٠٠ گوند خاپوورکران.
- لە ساڵی ١٩٨٧ نزیکەی ٨٤٠ گوند خاپوورکران.
- لە ساڵی ١٩٨٨ نزیکەی ١٦٧٠ گوند خاپوورکران.
- لە ساڵەکانی ١٩٨٩ـ ١٩٩٠ زێتر لە ٧٠ گوند خاپوورکران.*

کەواتە بەپێی ئەم ئامارە سەرەتایەی ئێمە نزیکەی ٤٥٦٠ گوند لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٥ـ١٩٩٠ خاپوورکراون،** جگە لەم حاڵەتانەی خوارەوە: یەکەم، ئەو گوندانەی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ـ١٩٧٥دا خاپوورکراون. دووەم، شاروچکە راگوێزراوەکان، هەروەها ئەو ئوردووگایانەی کە دانیشتووانەکانیان بۆ جاری دووەم راگوێزران. سێیەم، دانیشتووانە راگوێزراوەکانی ناو شارەکان.

---

19 میدل ئیست وۆچ، جینۆساید لەعێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و: سیامەندی موفتی زادە، چاپ و پەخشی خاك، سلێمانی ١٩٩، ل ٥٣٠.

* بۆیە سەرچاوەکان ناخەینە ڕوو. چونکە یەکەم، سەرچاوەکان زۆرن جێگەیان نابێتەوە لێرەدا. دووەم، لە بەشی سێیەمدا هەوڵدەدەین بەدرێژی و وردی هەموو ژمارەکان و هەروەها سەرچاوەکان بخەینە ڕوو.

** تۆژەر ناوی نزیکەی ٤٢٥٠ گوندی هەیە.

هەڵبەت ئەم ئامارەی سەرەوە ئامارێکی ورد نییە و ئێمە پێمانوایە لە توانادا نییە هیچ ئامارێکی ورد لەبارەی راگواستنەوە لەم دۆخەی ئێستادا بکرێت، چونکە مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزترە لەوەی کە بیری لێ دەکەینەوە، سیاسەتی راگواستن زێتر لە ۳۵ ساڵ بەردەوام بوو، خەڵکی هەندێك ناوچە چەندین جار و بۆ چەندین شوێنی جیاواز راگوێزراون...هتد. ئێمە لەو بڕوایەداین لە داهاتووشدا ئەگەری ئەوە زۆر کەمە ئامارێکی وردی راگواستن بکرێت. ئەوەی ئەو ئامارە زەحمەت دەکات جگە لەو هۆیانەی لەسەرەوە باسکران، هۆی دیکەش هەن، لەوانەش: ئەو گوندانەی بۆ نموونە لە ساڵانی ۱۹۷۵ یاخود کۆتایی حەفتاکان خاپوورکران، هەروەها هەمان ئەو گوندانە دووبارە لە ساڵانی ۱۹۸۷_۱۹۸۸ خاپوورکرانەوە، ئێمە بە زۆری بە یەك گوند لەقەڵەمی دەدەین، بەبێ ئەوەی رەچاوی ئەوە بکەین بەزۆری ئەمەی دوایی هەمان ئەو خەڵکە نییە ئەو گوندەی ئاوەدانکردووتەوە، دەشێ تەنیا چەند خێزانێك بن دوای چەند ساڵێك ئەوێیان ئاوەدان کردبێتەوە. هەروەها ئەو خەڵکە دوو جار زیانی بەرکەوتووە. هۆیەکی دیکە ئەوەیە بەدرێژایی‌ی هەشتاکانی سەدەی رابردوو ئێمە بۆ ئاماری گوندە خاپوورکراوەکان بەزۆری پەنا دەبەینە بەر نەخشە و ئامارە رەسمیەکان، لەکاتێکدا بەدرێژایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو سەدان گوندی کوردی لە ناوچە *قەدەغەکراوەکان* ئاوەدانکرانەوە. بەشێکی زۆریان لە شوێنی جاران ئاوەدان نەکرانەوە لەترسی فرۆکە جەنگیەکان و بۆمباباران، هەروەها زۆر لەم گوندانە ناوی نوێیان هەبوو. ناوی ئەم گوندانە لەهیچ ئامارێکدا تۆمار نەکراوە و لەسەر هیچ نەخشەیەکیش ئاماژە بەم گوندانە نەکراوە.

## باسی دووەم: ئاكامە كۆمەڵایەتییەكان

ئاكام واتە ئەو ئەنجامەی لە كردە، پرۆسە، مامەڵە و هەڵسوكەوت، هەڵویست، رووداو، وتوویژ، بڕیار یاخود سیاسەتێك دەكەوێتەوە. ئاكامە كۆمەڵایەتییەكان ئەو ئاكامانەن كە كۆمەڵایەتین یاخود رەهەندێكی كۆمەڵایەتیان هەیە.

پێمانوایە بۆ باسكردن لەو ئاكامە كۆمەڵایەتیانەی لەهەر بارێك لەوانەی لەسەرەوەدا ناویان هات، پێویستە چەند خاڵێك لەبەرچاو بگرین:

١ـ مەرج نییە لەهەر یەكێك لەو بارانەی سەرەوە تەنیا ئاكامێك بكەوێتەوە، بەڵكو بەزۆری لەهەر یەكێك لەو بارانە ئاكامگەلێكی كۆمەڵایەتی سەرهەڵدەدەن و ئەو ئاكامانە پەیوەندیان بەیەكەوە دەبێت.

٢ـ دەكرێ لەسەرهەڵدانی هەر ئاكامێكدا زێتر لە فاكتەرێك ئامادە بێت، یان فاكتەری دیكە لەپاڵ فاكتەری سەرەكیدا راستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ رۆڵی لە دەركەوتنی ئاكامەكەدا هەبێت.

٣ـ مەرج نییە هەموو ئاكامەكان لەهەمان ماوەدا یاخود لەگەڵ بەكۆتاهاتنی ئەو بارەی ئاكامەكانی لێكەوتوونەتەوە دەركەون. دەشێ هەندێ ئاكام لەسەرەتای بارەكەدا و هەندێكیان لەگەڵ بەكۆتاهاتنی و لەهەمان كاتدا هەندێكیان تاڕادەیەك درەنگتر سەرهەڵدەن. واتە مەرج نییە هەموو ئەو ئاكامانەی لەبارێك دەكەونەوە هاوكات و پێكەوەبن.

٤ـ ئەو ئاكامانەی لەبارێك دەكەونەوە مەرج نییە هەموویان نێگەتیڤ یاخود هەموویان پۆزەتیڤ بن، دەشێ زۆرتریان نێگەتیڤ و هەندێكیان پۆزەتیڤ بن یاخود بە پێچەوانەوە.

٥ـ هەروەها هەر یەكێك لە ئاكامە كۆمەڵایەتییەكان لە یەكێك

لەم بوارانەشدا کولتووری، دانیشتووانی، پـەروەردەیی، تەندروسـتی...
جێگـەی دەبێتـەوە، واتـە ئێمـە ئاکامـە کولتـووری، دانیشـتووانی،
ئابووری... یەکان بە ئاکامە کۆمەڵایەتییەکان لەقەڵەم دەدەین.

٦ـ دەشێ ئـەو فاکتـەرەی ئاکـامی کۆمەڵایـەتی لێ دەکەوێتـەوە،
بارێکی سروشتی یاخود مرۆیی بێت.

٧ـ ئاکامـەکان لـەڕووی چـەندێتی و چۆنایەتیانـەوە پشـت بـە
کۆمەڵێك فاکتەری وەك شوێن، کات، باری کۆمەڵایەتی دەبەستن.

لـەم باسـەدا مەبەسـت لـە ئاکامـە کۆمەڵایەتییـەکان،
دەستنیشانکردن و ئاماژەکردنە بەو ئاکامانەی کـە کۆمەڵایـەتین یـان
ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتیان هەیە و لە ئەنجامی پیـادەکردنی سیاسـەتی
ڕاگواسـتنی کـوردان لـە عـێراقدا سـەریانهەڵداوە. ڕاگواسـتن وەك
سیاسەتێك کە بەشێوەیەکی بەرفرەوان هەم لەڕووی دانیشتووان و هـەم
لـەڕووی ڕووبـەری زەویـەوە وێـڕای درێـژی مـاوەی ئەنجامدانەکـەی،
دەرهاوێشـتە، ئاکـام یـاخود ئەنجامگـەلێکی هەیـە. زۆربـەی ئـەو
ئاکامانەش کۆمەڵایەتین یـاخود ڕەهـەندێکی کۆمەڵایـەتیان هەیـە...
بەدەستەواژەیەکی دیکە: هەندێك لە دیاردەکان تەواو کۆمەڵایەتین، بۆ
نموونە گۆڕینی شوێنی حەوانەوەی دانیشتووان، تێکـەلکردنی خـەڵکی
چەند گوندێك یان زێتر لە عەشرەتێك لە ئوردووگایەکدا و... بەشێکی
تری ئاکامەکان بۆ نموونە زۆربوونی بێکاری یاخود گۆڕانـی پیشـە لـە
مـەڕداری و جووتیاریـەوە بـۆ کارمـەندی کـەرتی گشـتی. هـەروەها
دروستکردنی قوتابخانەی زۆر و هەوڵدان بۆ خوێندەوارکردنی زۆرتریـن
ژمارەی ڕاگوێزراوان. وێـڕای ئـەوەی کـە بێکـاری و گۆڕانـی پیشـەی
هاووڵاتیان دیاردەی کۆمەڵایـەتین و ئـەنجام و ئاکـامی کۆمەڵایـەتیان
هەیە پەیوەندیەکی پتەویان هەیە بە کایەی ئابووریەوە و ئابووریناسان
بە چاوێکی دیکەوە سەیری دەکـەن، بەهـەمان شـێوەش سـەبارەت بـە

بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و زۆربونی قوتابخانەکان کە دیاردەی کۆمەڵایەتین، پەیوەندیەکی راستەوخۆ و توندوتۆڵیان بە بواری پەروەردەوە و فێرکردنەوە هەیە... لەهەمان ئەو سەروبەندەدا دەکرێ ئاماژە بە ئاکامی دیکەش بکەین وەك کەمبوونەوەی مردن بەتایبەتی مردنی منداڵان یاخود گۆڕانی باری دارایی راگوێزاوان. دیسان دەکرێ بڵێین راگواستنی دانیشتووان و تێکەڵبوونیان بە خەڵکی ناوچەکانی دیکە و هاتنی توخم و رەگەزی نوێ بۆ ناو ژیانیان ئاکامگەلێکی کولتووری خۆی هەبوو، لەوانە گۆڕانی دابونەریت، سەرهەڵدانی بەهای نوێ و لاوازبوونی بەهای دیکە...

ئێمە لەم باسەدا بەپێی توانا هەوڵدەدەین پەنجە بخەینە سەر ئەو ئاکامە کۆمەڵایەتیانەی لە ئەنجامی کردەی راگواستن لە کوردستانی خوارووودا دەرکەوتن. بۆ نموونە کۆکردنەوەی خەڵکی لە چەند ئۆردووگایەکی نزیکداو دوورخستنەوەیان لە گوندە دوورەدەستەکان و کەمبوونەوەی ئیش و کاری راگوێزراوەکان و بوونی قوتابخانە لە هەموو ئۆردووگایەکدا دەشێ بڵێین ئەوەی لێ کەوتەوە کە زۆربەی زۆری منداڵەکان ئەگەر نەڵێین هەموویان دەرفەتی خوێندنیان بۆ بڕەخسێت. کەمبوونەوەی نەخوێندەواری لەنێوان مناڵاندا لە پشتێنەی سنووری راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ ئاکامێکی سیاسەتی راگواستن بوو. هەروەها راگواستنی گوندنشینەکان و دوورخستنەوەیان لە زەوی و زاری خۆیان پیشەی زۆربەی راگوێزراوانی گۆڕی لە شوانکاری و داچاندنی زەویەوە بۆ کارمەندی یاخود کرێکاری و...هتد

بەکورتی لە رێی دەستنیشانکردن و پەنجەدانان لەسەر ئاکامەکان دەتوانین بسەلمێنین کە گۆڕانێك رووی داوە و ئەم گۆڕانە چەندە ریشەیی بووە.

## باسی سێیەم: گۆڕانی کۆمەڵایەتی

چەمکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەوانەیە یەکێك بێت لەو چەمکانەی زۆر بە فرەوانی لە زانستی کۆمەڵناسیدا بەکاردێت، بە رادەیەك کە رەنگە هیچ زانایەکی کۆمەڵناسی نەبێت بە جۆرێك لە جۆرەکان کاری لەسەر ئەم چەمکە نەکردبێت. هەر بۆیەشە دەبینین تیۆرگەلێکی زۆر لەبارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەلایەن کۆمەڵناسە هەرە بەناوبانگەکانەوە دارێژراون.

کۆمەڵگا بە پێکهاتەکەیەوە هەروەها کایە جیاوازەکانی، پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان، بەها و نۆرمەکان، دابونەریت... بەردەوام لە گۆڕان دایە. هیچ کۆمەڵگایەکی مرۆیی وەستاو و جێگیر نیە، تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورتیش. رەنگە نەتوانین هیچ یاسایەك لەبارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە بگشتێنین و جەختی لە سەر بکەینەوە، وەك ئەوەی کە گۆڕان خۆی پرۆسەیەکی بەردەوامە، بەڵام ئەوەی کە چەندە بەردەوامە، خێراییەکەی چەندە، بە چ ئاراستەیەکدا هەنگاو دەنێت، هۆیەکانی چین و کوسپ و تەگەرەکانی بەردەمی کامانەن، ئەو هۆکارانە چین کە گۆڕان دروست دەکەن و گۆڕانەکە چەندە بەرفرەوان و سەرتاپاگیرە ... هتد؟ ئەمانە هەموویان لەلای کۆمەڵناسێکەوە بۆ کۆمەڵناسێکی دیکە، لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر، یاخود لەنێوان کایە جیاوازەکانی کۆمەڵگایەکدا بە جۆرێك لە جۆرەکان جیاوازن.

ئەمرۆ لە کۆمەڵگای کوردیدا دەبینین باوکان گلەیی لە کوڕەکانیان دەکەن بەوەی لەسەر رێچکەی ئەوان ناڕۆن و رەفتاریان لە رەفتاری ئەوان جیاوازە؛ خەڵکێکی بەتەمەنی زۆر دەبینین گازەندە لە زەمەن دەکەن و پێیانوایە زەمەنی ئەمرۆ لەگەڵ زەمەنی ئەوان جیاوازە؛ خوێندنەوەی رۆمانێك کە مێژووی رووداوەکانی لە سێ دەیە

زێدەتر نیە ، یان بیرەوەری نووسەرێك یاخود مێژووی شۆڕشێکی کوردیی زوو ، بینینی فیلمێکی عەلی ئەفەندی، سەیرکردنی ئەلبۆمێکی فۆتۆگرافی برادەرێك لە دەیەی حەفتاکان ـ هەموویان باس لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکەن کە بەسەر کۆمەڵگای ئێمەدا هاتووە.

پێموایە باسکردن لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی وەك ئەوەی لە کۆمەڵگای کوردیدا روویداوە، لە قورسترین کارەکانە ، لەبەر ئەوەی یەکەم، هیچ تۆژینەوەیەك کە شیاوی باس بێت لەبارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە لە کۆمەڵگای کوردیدا نەکراوە، یاخود ئێمە لێی ئاگادار نین. دووەم، کتێبخانەی کوردی خاوەن سەرچاوەگەلێك نییە کە لە توانایان دابێت تیشك بخەنە سەر دیاردە کۆمەڵایەتییەکان، رەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان بەر لەوەی دووچاری ئەو گۆڕانە بێنەوە کە ئێمە مەبەستمانە لێی بکۆڵینەوە. سێیەم، گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەنجامی تاکە فاکتەرێك نیە ، بەڵکو وەك هەموو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان چەند فاکتەرێك پێکەوە بەرێژەی جیاواز دەستیان لە دروست کردن یاخود خێراکردن و رەخساندنی بواری ئەو گۆڕانەدا هەبووە. لێرەشدا ئەرکی ئێمە زەحمەتتر دەکەوێت کاتێك دەمانەوێت بپەرژێینە سەر رۆڵی تەنیا هۆکارێك (راگواستن) ، چونکە راگواستن لە کوردستانی خوارووda بە هیچ شێوەیەك تاقە هۆکاری ئەو هەموو گۆڕانە گەورانە نییە کە کۆمەڵگای کوردی بەخۆیەوەی بینیون. کۆمەڵگای کوردی دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ گەلێ زێتر لە دەیەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینیوە ، کەچی راگواستن زێتر لەهەشتاکاندا پیادە کراو و رووبەرێکی زۆر زێتری گرتبووەوە. بۆیە دەستنیشاکردن و جیاکردنەوەی تەنیا ئەو دیاردەو ئاکامانەی کە بەرهەمی سیاسەتی راگواستنن کارێکی قورسە. دواجاریش ئەوەی

ئەرکی ئێمەی قورستر کردووە ئەوەیە کە ئەگەرچی کوردستانی خوارو
تاکە خاڵێك نییە لە جوگرافیای جیهاندا راگواستنی تێدا
ئەنجامدرابێت، بەڵام هیچ لێکۆڵینەوەیەکمان دەست نەکەوت کە
شیاوی ئاماژە پێ کردن بێت لەبارەی رۆڵی راگواستن لە گۆڕانی
کۆمەڵایەتیدا لە کوردستانی خواروو.

دەکرێ بڵێین مەبەست لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەو جیاوازیەیە کە
لە بارەکانی پێشوتری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، دامەزراوەکان،
دابونەریت... کۆمەڵگایەکدا دەردەکەوێت تا شوێنێك کە ئەو
گۆڕانکاریە یەکەم، ئەنجامی یاسادانان یاخود هەنگاوگەلێك بێت بۆ
کۆنترۆڵ و رێنوێنی کردنی کۆمەڵگا؛ دووەم، ئەنجامی گۆڕان بێت لە
کایەیەکی تایبەتی، یاخود بەشی زۆری کۆمەڵگا؛ یان لە سروشت
یان ژینگەی کۆمەڵایەتی.[٢٠] لەم پێناسەیەدا دەردەکەوێت کە مەرجی
گۆڕانی کۆمەڵایەتیبوونی جیاوازیە لەنێوان بونیادی کۆمەڵایەتی،
دامەزراوەکان، دابونەریت... لەنێوان دوو بار یان زێتردا. دەکرێ بڵێین
ئەم جیاوازیە لە ماوەیەکی زەمەنیدا دەردەکەوێت، هەروەها ئەم
جیاوازیە ئەنجامی یەکێك لەم دوو هۆکارەیە: یاسادانان، ئەمە لەلایەن
ئەو شوێنانەوە دەبێت کە دەسەڵاتی یاسادانانیان هەیە، بۆ نموونە
کاتێك رژێمی ئەتاتورك یاساگەلێکی جیاواز بەسەر گەلی تورکیادا
دەسەپێنێت. ئەویتر بوونی هەنگاوگەلێکە بەمەبەستی کۆنترۆڵکردن و
رێنوێنی کردنی کۆمەڵگا، ئەم دوو حاڵەتە لە دەسەڵاتەوە
هەڵدەقوڵێن، چونکە لە کۆمەڵگادا جگە لە دەسەڵات هیچ لایەنێك
توانای بڕیاردان و کۆنترۆڵکردنی نیە. ئەویتر ئاکامی گۆڕانکاریە لە
یەکێك لە کایەکاندا یان لە ژینگەی فیزیکی یان کۆمەڵایەتیدا.
هەڵبەت گۆڕان لە هەر کایەیەك لە کایەکانی (سیاسی، کۆمەڵایەتی،

---

20 جولیوس گولد و ویلیام ل. کولب، سەرچاوەی پێشوو. ل ٢٢٦.

ئابووری...) کۆمەڵگادا روویدات کار لە کایەکانی دیکەش دەکات بە پلەی جیاواز. ئیبن خەلدون پێی وایە هەر گۆڕانێك لە سروشتی ژینگە، شێوازی کار و بەرهەمهێناندا دەبێتە هۆی گۆڕان لە ئاکاری مرۆڤەکانیشدا، واتە دابونەریت، بەها و شێوازەکانی ژیان.[21] هەروەها مارکس لەم بارەیەوە وای بۆ دەچێت گۆڕان لە هێزەکانی بەرهەمهێنان، بەتایبەتی لە هۆکار و ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا، گۆڕان لە سروشتی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییە باوەکانی کۆمەڵگادا دروست دەکات چ دامەزراوە و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بن یاخود کۆمەڵە چینایەتیەکان لە کۆمەڵگادا.[22]

ئەحمەد زەکی بەدەوی پێناسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکات بەوەی بریتیە: ((لە هەموو گۆڕانێك کە لە رێکخستنی کۆمەڵایەتیدا روودەدات، بونیادەکەی یاخود وەزیفەکەی لە میانەی ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا. گۆڕانی کۆمەڵایەتی بەم پێیە بەسەر هەموو گۆڕانێکدا دەچەسپێت کە لە پێکهاتەی دانیشتووانی کۆمەڵگا یاخود بونیادی چینایەتی یان سستەمە کۆمەڵایەتییەکان یان شێوازەکانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان یاخود لەو بەها و پێودانگانەدا روودەدات کە کار لە رەفتاری تاکەکەسان دەکەن و رۆڵ و پێگەیان لەو رێکخراوانەدا دیاردەکەن کە سەر بەوانن)).[23]

ماکیڤەر و بیدچ وای بۆ دەچن کە گرنگی پێدانی کۆمەڵناسی لە گۆڕاندا، یاخود گۆڕان لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشێوەیەکی

---

21 ا. د. مجد الدين عمر خيری خمش، علم الاجتماع بين الموضوع والمنهج، دار المجدلاوی للنشر، عمان، ١٩٩١، ص ١٩٣.

22 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

23 د. احمد زکی بدوی، معجم مصطلحات العلوم الاجتماعية، مكتبة لبنان، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٢، ص ٣٨٢.

تایبەتی پێویست دەکات لە فرەیی هۆکارەکان بکۆڵینەوە. ئەم هۆکارانە خۆیان بەشێوەیەك لە شێوەکان کۆمەڵایەتی نین، بەڵام بە جۆرێك کاریگەری دەنوێنن کە گۆڕانی کۆمەڵایەتی دروست بکەن.[24]
ئەگەر لە پێناسەی بەدەوی و ڕای دوو کۆمەڵناسان (ماکیڤەر و بیدچ) وردبینەوە، دەبینین ئەوانەی دوایی پێیان وایە تەنیا هۆکارێك نییە گۆڕان دروست دەکات، بەڵکو فرەهۆکارێکن کە پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان دەگۆڕن. کەواتە ئەوان تاك هۆکاری ڕەتدەکەنەوە؛ زۆر لە ڕەخنەگرە نوێخوازەکان لەمەدا لەگەڵ ناوبراوان هاوڕان، لەوانەش ئایزیا بێرلین کە ڕەخنە لە تیۆرەکانی کونت، سبنسەر و مارکس لەمەڕ گۆڕان دەگرێت و پێی وایە تیۆری حەتمین و گۆڕان بە ئەنجامی تاکەهۆکارێك لەقەڵەم دەدەن. لەو ناوەدا ئەوەی زۆر بەوردی دیراسەی هۆکارە بەنێویەکداچووە جیاوازەکانی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا کردووە((سورۆکین))ە.[25] جێگەی خۆیەتی باس لەوەش بکەین کە کۆمەڵناسی فەرەنسی ((گی روشێ)) لە کتێبەکەیدا ((گۆڕانی کۆمەڵایەتی)) وای بۆ دەچێت کە کۆمەڵناسە کۆنەکان (*کونت، سبنسەر و مارکس ...*) باسیان لە وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی Social Transfomation کردووە، کۆمەڵناسە هاوچەرخەکان زێتر پرژاونەتە سەر باسی گۆڕانی کۆمەڵایەتی Social Change لێرەشدا دەبینین دژایەتییەك لەنێوان ((گی روشێ)) و ((بۆتۆمۆر)) ،((ماکیڤەر)) ، ((بیدچ))دا هەیە لەبارەی پێناسەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی.[26]

---

24 ا. م. ماكيفەر و شارلز بيدچ ، المجتمع، الجزء الثالث، ت: د. سمير نعيم احمد، مكتبة النهضة المصرية، قاهرة، ١٩٧١، ص ١٠٩٠.

25 بوتومور، تمهيد في علم الاجتماع، ترجمة و تعليق د. محمد الجوهري و الاخرون، الطبعة الثانية، دار الكتب الجامعية، اسكندرية، ١٩٧٣، ص ٤٦٦.

26 گی روشه، تغيرات اجتماعی، ت: دكتر منصور وثوقی، چاپ هشتم، نشر نی، تهران، ١٣٧٧ (١٩٩٨)، ص ٢٦.

له پێناسەی ئەحمەد بەدەوی دا زۆر راشکاوانە باس لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو، کراوە. واتە ناوبراو بوونی ماوەیەکی زەمەنی کە ناکرێ زۆر کورت بێت بەمەرجی دروستبوونی گۆڕانی کۆمەلآیەتی لە یەکێك یان زێتر لەو توخمانەی کە ئەو ناوی بردن دەزانێت. هۆکارەکانی گۆڕان وەك تەکنەلۆجیا، شەڕ، وشکە ساڵیەکی تاڕادەیەك درێژ ... یەکسەر گۆڕان لە بونیادی کۆمەڵگادا دروست ناکەن، بەڵکو کات پێویستە تا گۆڕانەکە هەست پێدەکرێت.

بونیادی کۆمەلآیەتی دەگۆڕێت، گەشە دەسەنێت و خۆی دەگونجێنێت لەگەڵ هەر هەلوێستێکی گۆڕاو بەمەرجێك گۆڕان لەشێوەکانی بیرکردنەوەی زۆر لەدەستەو گرووپەکانی کۆمەڵگادا دروست بێت. گۆڕان و گەشەسەندنی کۆمەڵگا لە جەوهەری خۆیدا بریتیە لە پرۆسەی خۆگونجاندنی ئەقلی لەلایەن تاکەکەسانەوە لەئەنجامی گوشاری بارودۆخێکدا کە چیتر ئەو شێوازەی بیرکردنەوە پەسەند ناکات کە بەهۆی هەلومەرجێکی جیاواز لە رابردوودا شێوەیان وەرگرتبوو.[27] شێوازەکانی ژیان و رەفتارە کۆمەلآیەتییەکان هەر لە خۆیانەوە ناگۆڕێن، وێڕای ئەوەی کە هۆکارە مادیەکان فەراهەم دەبن پێویستی بەبوونی کاتیش هەیە تا جۆری بیرکردنەوەی فۆرمولەبوو بەجۆرێك لە جۆرەکان گۆڕانی بەسەردا دێت. هاتن و بلآوبوونەوەی تەلەڤزیۆن لە کوردستانی خواروو یەکسەر شەوچەرە و کۆبوونەوەی شەوانی لادێنشینەکانی نەخستە پەراوێزەوە، هەروەکو چۆن کۆچ لە لادێوە بۆ شار لەماوەیەکی کەمدا خەڵکەکەی نەکردە شارستانی، بەڵکو دوای مانەوەی ماوەیەکی درێژ لەشار تا ئێستاش ئاژەڵە شیردارەکان لەماڵەوە بەخێو دەکەن.

---

27 ا. م. ماکیڤەر و شارلز بیدج، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩٠.

ئێمە لە باسەکەماندا جەخت لەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییە دەکەینەوە کە لە ئەنجامی کۆچی زۆرەملێی کوردەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، لەماوەی چل ساڵی ڕابردوودا ڕوویدا. ئەم کۆچە زۆرەملێیە لە ڕووبەرێکی بەرفرەوان و دانیشتووانێکی زۆری لە ماوەیەکی تارادەیەك درێژدا گرتەخۆ، بەپێی هەموو ئەو مەرجانەی کە پێویستن بۆ گۆڕان دەبێ گۆڕان لە کۆمەڵگای کوردیدا ڕوویدا بێت، و ئەمەش لە کایە جیاوازەکان، دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، بەها، دابونەریت، شێوازەکانی بیرکردنەوە و ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان و... بەرجەستە بووە. بە چ ئاراستەیەکە؟ خێراییەکەی چەندە؟ چەندە بونیادی کۆمەڵگای کوردی گۆڕیوە؟ کامانەن ئەو هۆکارانەی دیکە کە شان بەشانی ڕاگواستن بەشدارییان لە گۆڕاندا کردووە؟ سیاسەتی ڕاگواستن چەندە بەسوودو چەندەش بەزیانی کوردەکان شکاوەتەوە؟ ئەمانەو دەیان پرسیاری دیکە کە نە ئەم لێکۆڵنەوەیە و چەند لێکۆڵینەوەی دیکەش دەتوانن وەڵامی هەموویان بدەنەوە، لەسەرەتای ئەم باسەماندا ڕووبەڕوومان دێن.

گی ڕوشێ پێی وایە لەکاتی تۆژینەوەی گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا شەش پرسیار خۆیان دەسەپێنن:

١ـ یەکەم پرسیار ئەوەیە چ شتێك دەگۆڕێت؟ ئەوە گرنگە پیشان بدەین گۆڕان چ بەشێك دەگرێتەوە، ئایا لە توخمە بونیادیەکان یان لە کولتوور یاخود لە شێواز، بەها و ئایدۆلۆژیادا دروست دەبێت؟

٢ـ گۆڕان بە چ شێوەیەك بە ئەنجام دەگات، چ ڕێگایەك دەگرێتە بەر، ئایا بە ڕێگەی ڕێکخراو یاخود ناڕێکخراو و نابەردەوام شێوە وەردەگرێت؟ ئایا ڕووبەڕووی بەرەنگاربوونەوەیەکی توند دێتەوە؟

٣ـ پێویستە سەرنجی شێوازی گۆڕانەکە بدەین؟ ئایا ئارام و لەسەرخۆ و پەیتاپەیتایە یاخود گۆڕانێکی توند و خێرایە؟

٤ـ دوای ئەوەی چۆنایەتی گۆڕان دەردەکەوێت، دەست دەکەین بە ڕاڤەی هۆکارەکانی گۆڕان و هەلومەرجە گونجاو و نەگونجاوەکانی.

٥ـ ئەوانەی گۆڕانیان دروست کردووە، خستوویانەتە گەڕ و هانیان داوە، هەروەها ئەوانەی کوسپ و تەگەرەیان بۆ دروست کردووە دەناسێنرێن.

٦ـ دوای هەموو ئەمانە پرسیارێك لە بەرامبەر کۆمەڵناسدا قوت دەبێتەوە ، ئایا دەشێ ڕەوتی داهاتووی ڕووداوەکان و ئەو ڕێگایانەی کە کۆمەڵگا دەتوانێت لە ئایندەیەکی دوور یان نزیکدا هەڵیانبژێرێت، پێشبینی بکرێن.[28]

دوای ئەوەی بە گشتی لەبارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە شتێکمان باسکرد و پرسیارگەلێکمان وروژاند، پێویست دەکات پێناسەی خۆمان هەبێت بۆ ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی کە مەبەستمانە لەم توێژینەوەیەدا تیشکی بخەینە سەر؛ بۆ ئەوەش دەڵێین لەم باسەدا مەبەست لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی: ئەو گۆڕانەیە کە ڕاگواستن وەك سیاسەتێکی دوژمنکارانە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە لە بونیادی کۆمەڵگای کوردی: دامەزراوەکان، پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکان، دابونەریت، ڕەفتار و هەلسوکوتی تاکەکەساندا و لە ئەنجامی گۆڕینی ژینگەی فیزیکی و کۆمەڵایەتیی بەشێکی زۆری دانیشتووان لە چل ساڵی کۆتایی سەدەی بیستەم لە کوردستانی خوارووودا دروست بوو.

## باسی چوارەم: بەعسیزم

ئەگەرچی لەم باسەدا دەمانەوێ لە بەعسیزم بدوێین، بەڵام لێکۆڵینەوەو باسکردنی بەعسیزم لێرەدا نەك باسێکی ناتەواو و پێنەگەیشتوو دەبێت، بەڵکو پێمانوایە بە هیچ شتێکمان ناگەیەنێت،

---

28 گی روشە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.

جگە لەوە کە سەرەداوێك دەبێت بۆ تێگەیشتن لەو سستەمە سیاسیەی کە بیّ بوونی ئەو بەم هەموو دەسەڵاتەیەوە لە عێراقدا، نەدەکرا ئەم هەموو خوێنە برژێت و میللەتانی عێراق ئەو هەموو رۆژە رەش و تاڵانە تاقیبکاتەوە. بە دەستەواژەیەکی تر، بەعسیزم بەوەی کە سستەمێکی زۆر ئاڵۆزە و، بەپێچەوانەی فاشیزم و ستالینیزم کەمترین لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، ڕێژەیەکی زۆری نهێنیەکانی ناو ئەم سستەمە هێشتا شاراوەن، مومکین نییە ئێمە بتوانین وێنەیەکی بەرجەستەی بەعسیزم بەم نووسینە کورتە بخەینەڕوو. ئەم نووسینە لەمەڕ بەعس تەنیا پێویستییەکی ئەم توێژینەوەیەی بەردەستمانەو، هەر بۆیەشە ناکرێت چاوەڕێی زێتری لێبکرێت.

بەعسیزم پێکهاتووە لە دوو بڕگەی ((بەعس)) کە مەبەست حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستە، هەروەها پاشگری ئیزم ((ism))، کە ئەگەر ئەم پاشگرە بخرێتە سەر هەر ناوێك ئەوا مانای ڕێباز، ئاراستە یاخود قوتابخانە دەگەیەنێت. کەواتە، کە ئەم پاشگرە بۆ حزبی بەعس زیاد دەکەین، ئەوا پێمانوایە بەعس چیتر تەنیا حزبێکی سیاسی نییە وەك زۆربەی حزبەکانی دیکە، بەڵکو ڕێباز یاخود قوتابخانەیەکە. سەرەڕای تەمەنی تاڕادەیەك درێژی، خەسڵەت و پرەنسیپگەلێکی تایبەت بە خۆی هەیە، کە هەم جیای دەکاتەوە لە سستەمەکانی دیکە و هەمیش سستەمێکە بەهرەمەند لە هەموو ئەو دیسپلین و دەکترینانەی کە پێویستە سستەمێك خاوەنیان بێت. ئەندام و پەیڕەوەکانی بەشێوەیەك وێنە دەکات کە جیاوازن لە خەڵکانی دیکە، یان پەیڕەو و ئەندامانی دەستەو گرووپەکانی تر. هەر ئەمەشە وای کردووە کۆمەڵە کەسێك لە کۆمەڵگادا بەهۆی بوونی هەندێك خەسڵەت و ڕەفتارەوە بە بەعسی ناوزەد بکرێن (بوونی جۆرێك لە

سمێل، ڕەفتاری تاکڕەوانە، تێخوڕین و فەرماندان لەجیاتی بانگ کردن و قسە لەگەڵ کردن...). واتە بەعس کولتوورێکی تایبەتی بەرهەمهێناوە، ئەم کولتوورەی بەعس کاریگەری لەسەر کولتوورەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمە و پێکهاتەی فیکری و ڕۆشنبیری تاکەکان هەبووە. بوونی ئەو کولتوورەشە وای کردووە سەرەڕای نەمانی بەعس وەك ئیدارە لە کوردستانی خواروو، وەك ئەخلاقیات و سستەمی ڕەفتار ئامادەیی لەناو ئێمەدا هەبێت و، ڕەگەزەکانی کولتووری ئەو خۆیان پاراستبێت. تەقریر نووسین کە بایەخێکی تایبەتی هەیە لەلای بەعسیەکان*، وەك ئەوەی سەمیر ئەلخەلیل** باسی دەکات، یەکێکە لە چالاکیە گرنگەکانی هەر ئەندامێکی حزبی بەعس، هەروەها دەڵێت تەنانەت ئەو شتانەی کە هاورێیەك یاخود هاوکارێك دەیانڵێت پێویستە بکرێنە تەقریر،[29] ئەمڕۆ بۆتە ئەرکێکی ئەندامەکانی حزبەکانمان و کارمەندە ئیدارییەکان. ئەمە کاریگەرییەکی کولتووری بەعسە لەسەر کولتووری سیاسی ئێمە کە دواجار لە کایەی سیاسی پەڕیوەتەوە بۆ کایەکانی دیکەو، پێویستە ئەم دیاردەیە بە دیدی دیکە بخوێنرێتەوە.

((حزبی بەعس حزبێکی سیاسی نەتەوەیی سکۆلاریستی شۆڕشگێرە، خاوەن تیژی هزری جیاجیایە کە هەندێ کات زەحمەتە پێکەوە کۆبکرێنەوە، چ جای ئەوەی بڕوایان پێ بکرێت...کەلێنێکی فرەوان لەنێوان گوتەو کردەکانیدا بەر لە هاتنە سەر دەسەڵات و گوتە

---

* بۆ زێتر درك کردنی بایەخی راپۆرت نووسین لەلای حزبی بەعس بگەڕێوە بۆ: المنهاج الثقافي المركزي، الكتاب الاول، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ص١١٣-١١٧.

** سەمیر ئەلخەلیل ناوی خوازراوی ((کەنعان مەکیە))یە.

29 سمير الخليل، جمهوری وحشت، سياست عراق امروز، ت: احمد تدين، انتشارات طرح نو، تهران ١٣٧٠ (١٩٩١)، ص ١٠٨.

و کردەکانیدا دوای هاتنە سەر دەسەڵات، دەبینرێت.)) [30] لە پێناسەی سەرەوەدا باس لەوە دەکرێت کە گوتە و کردەوەکانی بەعس زۆر لێك جیاوازن، واتە بەعس شتێك دەڵێت، لە پەیڕەو و پرۆگرامەکانیدا بڕیارێك دەردەکات، بەکردەوە پێچەوانەکەی ئەنجام دەدات. بەعس بە گوتە هەمیشە باسی پێکەوەژیانی کورد و عەرەبی کردووە، بەلاّم بە کردەوە کوردی رادەگواست و جینۆساید دەکرد. باسی لە رزگارکردنی فەلەستین دەکرد وەك ولاّتێکی عەرەبی، بەلاّم بەکردەوە ولاّتێکی عەرەبی دیکەی داگیر و تالاّن دەکرد.

ئاراس فەتاح پێی وایە ((بەعسیزم دەسەڵاتدارییەکی زۆر تایبەتی ناو زەمەنی پۆست کۆلۆنیالییە و قانگدراوە بە کولتووری شەڕانگێزی ناسیۆنالیستی ـ ئیسلامی عەرەبی.)) [31]

وردبوونەوە لە واتای ناسیۆنالیزم لای کۆنسێپتی بەعسیزم رووبەڕووی لۆژیکی ناعەقلانیمان دەکاتەوە، بەر لەوەی وابەستەی ئەقڵ بێت، وابەستەیە بە کەینونیەتی مرۆڤی عەرەبییەوە. بەڕای عەفلەق تاکەکەس ناتوانێت خۆی لە نەتەوە رزگار بکات، پێی وایە عەرەبەکان بیانەوێت و نەیانەوێت هەموویان ناسیۆنالیستن. لێرەشدا چارەنووسی تاك بە چارەنووسی نەتەوە دەبەستێتەوە، تاك لای ئەو تاکێکی پاسیڤە. [32] سەبارەت بە ئیسلامیش، بەعسیزم ئیسلام بە بناغەی عەرەبێتی دادەنێت، واتە عەرەبێتی ئیسلام لەخۆ دەگرێت و بەشێکی

---

30 الندوة العالمية للشباب الاسلامى، الموسوعة الميسرة فى الاديان والمذاهب المعاصرة، الطبعة الثانية، رياض ١٩٨٩، ص ٨٢.

31 ئاراس فەتاح، هەشت قۆناغ لە سیستمێکی کوشتن و سێ بۆچوون، گوڤاری رەهەند ، ژمارە ٧، سوید ١٩٩٩، ل ١٣٤.

32 کاکەڕەش، فاشیزم یان بەعسیزم؟ سەرەتایەك دەربارەی گیوگرفتی میتۆدی لێکۆڵینەوەی بەعسیزم، گوڤاری یەکگرتن، ژمارە ١٤، دانمارك ١٩٩١، ل ٣٨.

دانەبراوێتی. هەڵوێستی بەعسیزم بەرامبەر بە ئیسلام وەك ئەوەی تەنێ كولتووری عەرەبان بێت، دەردەكەوێت. بەشداری نەتەوەكانی دیكە لە ئیسلامدا رەتدەكاتەوە.[33] لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو كەدوای مردنی میشێل عەفلەق ناوی دەگۆڕن بۆ ئەحمەد و، بانگەشەی ئیسلامبوونی ئەو لە سەرەمەرگدا دەكەن.

سەبارەت بە نەتەوەی كورد و كیشەكەی، بەعس دیدێكی تایبەتی هەیە، دیدێك كە زۆر رەگەزپەرستانەیە و كورد وەك نەتەوەیەك نابێت داوای مافە نەتەوەییەكانی خۆی بكات. لە نووسینەكانی میشێل عەفلەقدا هاتووە كە نەتەوەكانی وەك كورد، بەربەر و قبتییەكانی میسر پێویستە خۆیان لەگەڵ ئامانجەكانی حزبی بەعس بگونجێنن و لە دژی دوژمنەكانی بەعس بجەنگن. ناوبراو ئەو نەتەوانە بە كەمینە ناودەبات و لە روانگەی ئەوەوە تاكەكانی ئەو نەتەوانە هیچ جیاوازیەكیان لەگەڵ برا عەرەبەكانیان نییە، هەروەها لە نووسینەكانیدا لەوانەش لە كتێبی((خاڵی سەرەتا))دا دەڵێت: بە درێژایی مێژوو هیچ جیاوازیەك لە نێوان كورد و عەرەباندا نەبووە.[34]ساڵی ١٩٧٤یش لە سمینارێكدا لە شاری كەركوك هەمان گوتە دووبارە دەكاتەوە.[35] عەفلەق بەوەندە ناوەستێ بەڵكو لە شوێنێكدا كورد بە عەرەب لە قەڵەم دەدات و دەڵێت : كوردەكان بە درێژایی چەند سەدەیەك هاوڵاتی عەرەب بوون وەكو برا عەرەبە موسلمانەكانیان و هیچ جیاوازیەكیان لە نێواندا نییە.[36] ئەو پێی وایە ئەوەی لەسەرەتادا جیاوازی لە نێوان كورد و عەرەبدا دروست كرد یاخود ئەو جیاوازیەی

---

33 هەمان سەرچاوە، ل ٣٩.

34 میشیل عفلق ، نقطة البدایة ـ احادیث بعد الخامس من حزیران ، دار الحریة للطباعة، بغداد ، ١٩٨٤، ص ١٠٥.

35 میشیل عفلق، البعث والعراق، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، بیروت،، ص ٧٤.

36 میشیل عفلق، نقطة البدایة، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٧.

دۆزیەوە دەوڵەتە ڕۆژئاواییە داگیرکەرەکان بوون.[37] هەر لێرەشەوەیە کە بەعسیزم بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بە بزاڤێکی نارەوا لە قەڵەم دەدات و ئەم هەڵوێستەیان تا لەناوچوونی ڕژێمی بەعس نەگۆڕا. هەمیشە سەرکردە کوردەکانیان بە ئەلقە لەگوێی ئیمپریالیزم و زایونیزم ناوبردوون.

لە ڕوانگەی بەعسیزمەوە ئەو خەباتەی لە کوردستان لەدژی بەعس دەکرا، خەبات نەبوو بۆ ڕزگاری بەڵکو ئەمە دژایەتی شۆڕشی عەرەبی بوو، ئەو شۆڕشەی مۆژدە هێنەری ئاشتی جیهانی بوو و بەعس لەدژی ئیمپریالیزم هەڵگیرساندبوو، کوردیش بە نوێنەرایەتی ئیمپریالیزم لە کوردستان لەدژی ئەو شۆڕشە دەجەنگا.[38] عەفلەق بە سەرسوڕمانەوە دەڵێت: چۆن دەبێت بزاڤی نەتەوەیی میللەتێکی بچووك بکەوێتە دژایەتی لەگەڵ کاروانی شۆڕشی عەرەبی، ئەم بزاڤە هێشتا ئەو ڕاستیە روونەی بۆ دەرنەکەوتووە کە نابێت لەگەڵ شۆڕشی دایك کە شۆڕشی عەرەبیە بکەوێتە دژایەتییەوە.[39]

لە دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ ساڵی ١٩٧٤ لە نێوان بەعس و بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا، عەفلەق زۆر ڕاشکاوانە دەڵێت ئەمە شەڕی نێوان ئەقلیەتێکی مرۆڤانەی هاوچەرخی کراوە کە ئەقلیەتی بەعس و ئەقلیەتێکی ڕەگەزپەرەستی فیودالی پاشکەوتووی نائەخلاقیە کە هیچ ڕێز لە وەفا و ئازادی و سەربەخۆیی ناگرێت.[40] هەروەها دەڵێت: شەڕی کورد بەشێکە لە شەڕی ئیمپریالیزم و زایونیزم و لە

---

37 هەمان سەرچاوە، ل ١٠٨.

38 عطاب سالم الطاهر، معالجات في الطريق الخاص، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٩، ص ٤٨ .

39 میشیل عفلق، البعث والعراق، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

40 هەمان سەرچاوە، ل ٧٨.

دژی عەرەب.[41] ناوبراو وای بۆ دەچێت کە دەبێت بزاڤی نەتەوەیی کوردی بەشێکی ڕەسەنی شۆڕشی عەرەبی بێت لەدژی ئیمپریالیزم و زایونیزم و چەوساندنەوەی چینایەتی دواکەوتوویی و هەموو ئەوانەی دەیانەوێت ئەم بزاڤە بەلایەکی دیکەدا بەرن پێویستە پەنجەیان بۆ درێژ بکرێت و وەکو پیلانێك لەدژی شۆڕشی عەرەبی دیاربکرێت.[42] ئەمە تەنیا بۆچوونی عەفلەق نییە، بەڵکو ئایدیۆلۆژیای بەعسە. سەدام لەمبارەیەوە دەڵێت: پێویستە عێراق بکرێتە بنکەیەکی بەهێز لە هەموو بوارێکەوە تاکو خەباتی عەرەبی لە پێناو نەتەوەدا پشتی پێ ببەستێت، ئەمە بەرپرسیاریەتی هەموو عێراقیەکە سەرەڕای جیاوازی ئینتیمای نەتەوەییان، بۆ ئەوان باشترە نەتەوەی عەرەب بەهێز بێت و عێراقیش بەشێك بێت لە عەرەب.[43] هەروەها سەدام حوسێن لە ڕووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ دوژمنەکانی شۆڕشی عەرەبی کە بەعس ئالا هەڵگریەتی سێ خاڵ دیار دەکات، لە سێیەمین خاڵدا دەڵێت: ڕاستە تاکە ئامانجێکمان هەیە، کە ئەویش سەرکەوتنی شۆڕەشە، بەڵام شێوازی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا یەك شێواز نییە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەگۆڕێت بەپێی هەلومەرجە خودی و بابەتییەکان.[44] واتە سەدام و بەعس بەپێی بارودۆخی تایبەتی خۆیان ڕووبەڕووی دوژمنەکانیان دەبنەوە.

کەنعان مەکیە کە نوسەرێکی عێراقییە و دوژمنێکی سەرسەختی بەعسە، یەکەمین کتێبی خۆی لەبارەی بەعسەوە بە ((کۆماری ترس)) ناوناوە. ئەو لە کتێبەکەیدا کە لە ٤٠٠ لاپەڕەی

---

41 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەرە.
42 میشیل عفلق. نقطة البداية، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٨.
43 عطاب سالم الطاهر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨.
44 هەمان سەرچاوە، ل ٤٤.

قەبارە ناوەندی پێکهاتووە باس لە سیاسەتی بەعس دەکات، ئەو پێی وایە ئەوەی لەم ولاتەدا بالاّ دەستە ترسە. ترس لە بەعس یان ئەو ترسەی بەعس بەهۆی دامودەزگا ترسێنەرەکانیەوە بەناو میللەتدا بلاّوی دەکاتەوە. ترسێك کە هەموو شوێنێکی تەنیوەتەوە و هیچ کون و کەلەبەرێکی نەهێشتووتەوە سەری پێدا نەکردبێت. بە کورتی کەنعان مەکیە باس لە ترسی میللەت لە دەسەلاّت دەکات، باس لەو ترسە دەکات کە دەسەلاّت بەرهەمی دەهێنێت. بەلاّم ئاراس فەتاح پێی وایە کە بەعسیزم سستەمێکە هەموو گیانی بە ترس قانگدراوە، نەك تەنیا ترس لە کورد و شیعە، بەلّکو ترس لە خودی ئەندامەکانی خۆیشی.[٤٥]
رەنگە هەر ئەم ترسەی دەسەلاّتیش بێت وای کردبێت هەمیشە بۆ چارەسەرکردنی تەنانەت بچووکترین و سادەترین کێشەش پەنا بۆ توندوتیژی بەرێت، و هەمیشە بە زمانی هەڕەشە رووبەڕووی بەرامبەرەکانی ببێتەوە و لە هەولّی توقاندنیاندا بێت. واتە ترس لە کۆماری ترسدا (عێراق) تەنیا ترسی هاوولاّتیان نییە لە دەسەلاّت، بەلّکو ترسی دەسەلاّتیشە لە هاوولاّتیان و تەنانەت لە دلّسۆزانی خۆی و نزیکترین کەسانیش لە سەرۆکەوە. بۆیەش دەبینین هەر ماوەماوە کۆمەلّە کەسێکی دلّسۆزی بەعس بە بەهانەی خیانەت و خۆفرۆشی لە سێدارە دەدرێن. گەورەترین هەنگاوی سەدام حوسێن لەو ناوەدا لە ناوبردنی سەرۆك و هاوکارەکەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بوو، دواتریش نزیکەی بیست لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی حزبە لە کاتی گرتنە دەستی دەسەلاّت لە ١٩٧٩دا لە سێدارەدران.[٤٦]
هەروەها زۆر کەس پێیوایە ئەم بەسستەمکردنەی ترسە بوو بەعسی لە دەسەلاّتدا هێشتووتەوە، بەلاّم بێگومان سەرەڕای بوونی

---

45 ئاراس فەتاح، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٧.

46 عبدالحميد العباسي، صفحات سوداء من بعث العراق، الجزء الاول، ط ٢، بدون مكان الطبع، ١٩٨٤، ص ٣٥.

هاوکێشە نێو نەتەوەیی و هەرێمیەکان کە دەستیان هەیە لە مانەوەی بەعس و لە هەموو ئەو ئۆپەراسیۆنانەی بەعسیش ئەنجامی دان، کە ئەمە هۆکاری دەرەکیە، هۆکاری ناوخۆییش هەن کە یارمەتی بەعسیان داوە لە مانەوەی و لە درێژەدان بە شەڕانگێزیەتی. گوتارەکەی دۆلابۆتی لە ناوەراستی سەدەی شانزەیەم دەتوانێت سوود بەخش بێت یاخود بەرچاو روونیەك بێت لەم بوارەدا. ئەو پێی وایە ئەوەی وا دەکات دەسەلاتێکی زۆردار و چەوسێنەر لە دەسەلاتدا بمێنێتەوە زێتر راهاتنی جەماوەرە لەسەر قبوولکردنی زۆرداری، واتە خووگرتنی تاکەکانی کۆمەلگایە بە زۆرداریەوە، زۆرداری چیتر شتێکی نامۆ نییە بۆ ئەوان.[47] ئەمەش لە عێراقی بەعسدا کە نزیکەی ٣٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد، جگە لە راهاتنی هاوولاتیان لەسەر توندوتیژی و درندەیی بەعس، چ شتێك بەردەوامی سەدام ـ ی لە دەسەلاتدا دەهێشتەوە؟ تەنیا ئەوەندە کەسەی لە هەر خولێکی شەڕی سەدامدا دەبنە قوربانی بەس بوون بۆ ئەوەی ببنە قوربانی بۆ لەناوبردنی سەدام و حزبەکەی لە دەسەلاتدا. لەبەر ئەوەی زۆربەی گەلی عێراق ئەوانەی لە خوار چل سالیەوەن بۆ رۆژێکیش هەوای ئازادیان نەمژیوە و تەنیا چەوساندنەوەیان بینیوە، چەوساندنەوە لای ئەوان شتێکی سەیر و نامۆ نەبوو. دۆلابۆتی ستەمکاران بەسەر سێ دەستەدا دابەش دەکات، شوێنی بەعس لەناو گرووپی سێیەمدا دەبێتەوە، ئەوانەی بەزەبری چەك دەسەلات دەگرنە دەست. لابۆتی لە وەسفی ئەو دەستەیەدا دەلێت: ئەوانە وا رەفتار لەگەڵ هاوولاتیانیان دەکەن وەك

47 اتین دولابوتی، بردگی اختیاری، رساله درباره سیاست اطاعت، ت: علی معنوی، نشر نی، تهران، ١٣٧٨، ص ٨٨.

ئەوەی داگیر کەری بێگانە بن.[48]
لێکۆڵینەوەی بەختیار عەلی ((لە ئارەزووی کوشتنەوە بۆ ئـارەزووی فەرامۆشکردن))، گـەلێك خـاڵی گرنـگ لەمـەڕ بەعسـیزم لـە خـۆ دەگرێت. نووسەر لە باسکردن لە مەرگدۆستی بەعسیزم سـەرکەوتووە. ئەو پێی وایە، بەعس هیچ بەهانەیەك بۆ کوشـتن دانـاڕێژێت، چونکـە نایەوێت ئەو بەهانەیە ببێتە رێگر لـە بـەردەم کوشـتن و هـەڵبژاردنی قوربانیـانی دیکـەدا.[49] بـەعس کوردێـك بـە بەهانـەی کوردبوونـەوە ناکوژێت، هەر وەك چۆن بەهانەی کوشتنی شیعەیەك شیعە بوون نیـە، چونکە دیارکردنی ئەم بەهانانە، رێگەی لێ دەگرن عـەرەبێکی سـونی یـاخود دەسـتەیەك ئەفسـەری خـۆی بکاتـە قوربـانی... بـەعس سستەمێکی بە شەڕوشۆڕ و خوێن تینووە، بەبێ خوێـنڕێژی نـاتوانێت بەردەوام بێت.
هەروەها بەختیار عەلی لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەمەڕ بەعس دەڵێت: ((بۆ تێگەیشتن لە بـەعس، دەبێـت لـە بەعسـەوە خـۆی دەسـت پـێ بکەین، نەك لە مۆدێلێکی تیۆریانەی دەرەوە. دەبێت لێگەڕێین بـەعس خـۆی وەك دیـاردە و سسـتەم چەمکـە تیۆریـەکانمان پێشـکەش بکات...))[50] ئێمە تا ئەوێ لەگەڵ نووسەرداین ئەگەر مەبەستی بێـت بەعسیزم نەکەینە هاوواتای ستالینیزم، فاشیزم و... یـاخود بـەعس و پێکهاتەی بەعس نەکرێنە تاکـە سـەرچاوەی تێگەیشـتن لـە بـەعس. پێمانوایە بۆ تێگەیشتن لە بەعس پێویستە پـەنا بەرینـە بـەر راڤـەی سسـتەمە تۆتالیتارەکـان، بـۆ خوێندنـەوەی بـەعس و راڤـەکردنی

---

48 هەمان سەرچاوە، ل ٦٤.
49 بەختیار عەلی، لە ئارەزووی کوشتنەوە بۆ ئارەزووی فەرامۆشکردن، گۆڤاری رەهەند، ژمارە ٧، سوید ١٩٩٧، ل ١٨٣.
50 هەمان سەرچاوە، ل ١٧٣

بەعسیزم، پێویستە بزانین ستالینیزم چیە و فاشیزم لە ئەوروپا چۆن سەریهەڵدا، کەمالیزم لە تورکیا چۆن خۆی چەسپاند، چۆن مەیلی تاکڕەوی و پاوانکردنی دەسەڵات مۆسۆلینی و هیتلەری پەلکێش کردنە ناو خوێناویترین جەنگەکانەوە، بزانین تۆتالیتارەکان بە چ شێوەیەك هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەکەن. وێڕای جیاوازیە زۆرەکانی بەعسیزم لەگەڵ سستەمە ناوبراوەکان. بەعس بەرهەمی هەر هەلومەرجیك بێت، دەردراوی ناخی چ کۆمەڵگایەك و لە چ قۆناغێکدا گەشەی سەندبێت، سستەمێکی تۆتالیتارە. تۆتالیتاریزمیش شتێك نییە نەگۆڕبێت، تۆتالیتاریزمی ئەمڕۆ تەواو جیاوازە لە تۆتالیتاریزمی کلاسیك. هەروەها لە کۆمەڵگایەکیشەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە بە هەندێك جیاوازیەوە دەردەکەوێت، بەڵام هەر تۆتالیتاریزمە. هەر بۆیەشە ئێمە لەگەڵ ئەوە داین کە بۆ نموونە، سەدام حوسێن بە سەرنجدان لە ئەزموون و پێشینەی فاشیزم و ستالینیزم لە ساڵەکانی نێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا، چاولێکەر بوو، نەك داهێنەر.[٥١]

هەموو خەسڵەتەکانی دیکتاتۆرە تۆتالیتارەکان هەر لە بوونی ئایدیۆلۆژیای رەسمی، دیکتاتۆری تاکڕەو، سستەمی کۆنترۆڵی پۆلیسی، پاوانکردنی هۆیەکانی پەیوەندی، پاوانکردنی هۆیەکانی بەرەنگاربوونەوەی چەکدارانە و کۆنترۆڵی تەواوی ئابووری،[٥٢] لە بەعسیزمدا بوونیان هەیە. هەروەها بەپێی دەستەواژەی بەناوبانگی *مۆسۆلینی* ئەرکی حزب وەك ئەرکی دەمارەکانە لە لەشدا، حزب نە

---

51 سمیرالخلیل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧.

52 گیلبرت الاردیس، جایگاه فاشیسم در تاریخ اروپا، ت: حشمت الله رضوی، مؤسسة کیهان، تهران ١٣٧١ (١٩٩٢)، ص١٢٣.

سەرەو نە دڵ، بەڵکو کارەکەی بە کاری دەمارەکانی لەش دەچێــت...[٥٣]
ئەم وەسفەی حزب کە سەرکردەیەکی تۆتالیتار بۆ حــزب کردوویــەتی، کتومت مەسەلەی بەعس و سەدام بوو لە عێراقدا. نــە حکوومــەت و نە بەعس لەلای سەدام جگە لە دەزگایەکی راپەڕاندن شــتێکی دیکــە نەبوون. ئەو وتەیە زۆر ناسراوە کە دەڵێــت: ((ئەگــەر ســەدام گوتــی، عێراق گوتی.))

((هانــا ئــارێنت)) لــە کتێبێکیــدا بــە نــاوی ((هەلومــــەرجی مرۆیی))، لە سروشتی مۆدێرنیتەدا بە دوای رەگوڕیشــەکانی گوتــاری تۆتالیتاریزم دەگەڕێت.[٥٤] هەروەها هەر سێ بیریار ((برینگتۆن مۆر))، ((ئێرنســت نولتــە)) و ((وێلفگــانگ ســــور))، کــە لــە دەیــەی شەستەکاندا لە فاشیزمیان کۆڵیەوە فاشیزمیان بە شۆڕشێك لــەدژی مۆدێرنیزم ((MODERNISM REVLOT AGAINST)) ناساند.[٥٥] ئەوان پێیان وایە فاشیزم لە پەیوەندیدایە لەگەڵ سەردەمی قەیران و تــەنگژە لە پرۆسەی مۆدێرنیتەدا، بەڵام بەعس وەکو کــەمالیزم موژدەهێنــەری مۆدێرنەیە. ئەگەر فاشیزم لە ئەورووپا لە ئەنجامی شکســتی مۆدێرنــە لە بەدیهێنانی پێداویستیە مەعنەوییەکانی مرۆڤەوە ســەریهەڵدابێت، و لەوێوە بکەوێتە جەمسەری بەرامبەر بــە مۆدێرنــە، ئــەوا مۆدێرنــە دیسان رەخســێنەری ئــەو هەلومەرجەیــە کــە بــەعس لێیــەوە ســەری دەردەهێنێت. بەڵام بەپێچەوانەی فاشیزم، بەعس ناکەوێتە جەمســـەری دژی مۆدێرنــە. ((مۆدێرنــە بــە هــەموو هــێزە گــەورە و توانــا بــێ

---

53 هەمان سەرچاوە، ل ٣٧.
54 حسین بشیریە، دولت و جامعە مدنی، گفتمانهای جامعەشناسی سیاسی، کتاب نقد و نظر، تهران ١٣٧٨ (١٩٩٩)، ص ٩٢.
55 گیلبرت الاردیس، سەرچاوەی پێشو، ل ٢٢٥ـ ٢٥٥.

سنووره‌كانیه‌وه‌ ده‌رگایه‌كی نائاسایی و گه‌وره‌ له‌ به‌رده‌م به‌عسدا ده‌خاته‌ سه‌رپشت، ئه‌وه‌ مۆدێرنه‌یه‌ كه‌ هۆكانی بونیادنانی سوپایه‌كی گه‌وره‌ و ده‌وڵه‌تێك ده‌داته‌ به‌عس كه‌ هێزی سه‌ره‌كین بۆ ركێف كردنی شته‌كان و دروست كردنی رووداوی گه‌وره‌.))[56] به‌عس نه‌ك ته‌نیا له‌ ناو مۆدێرنه‌دا له‌ دایكبوو ، به‌ڵكو ئه‌وه‌ی بووه‌ هۆی مانه‌وه‌ی به‌عس و ئه‌وه‌ی توانای ئه‌و هه‌موو تاوانه‌ گه‌ورانه‌ و دروست كردنی كولتووری به‌عسیشی ره‌خساند مۆدێرنه‌ بوو. كاتێك ئێمه‌ باس له‌ په‌یوه‌ندی مۆدێرنه‌ و به‌عس ده‌كه‌ین، مه‌به‌ستمان ره‌تكردنه‌وه‌ی پرۆژه‌ی مۆدێرنه‌ نیه‌ ، به‌ڵكو وێڕای ئه‌وه‌ی كه‌ ده‌زانین ئه‌قلانیه‌ت، ئۆمانیزم، لیبڕالیزم، ئازادی ... هتد پێكهاته‌ی ناو هزری مۆدێرنه‌ن، ده‌بێت ئاگاداری ئه‌وه‌ش بین كه‌ له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌م چه‌مكانه‌ی له‌ سه‌ره‌وه‌دا ناویان هات، مۆدێرنه‌ ره‌خسێنه‌ری سه‌رهه‌ڵدانی چه‌ند دیارده‌یه‌كی دیكه‌ش بوو له‌ كۆمه‌ڵگای مرۆڤایه‌تیدا وه‌ك نامۆبوون، به‌شتبوون و سستبوونی په‌یوه‌ندیه‌ كۆمه‌ڵایه‌تییه‌كان، توندوتیژی... هتد. هه‌ر بۆیه‌شه‌ باس له‌ رووخساری ژینووسی مۆدێرنه‌ ده‌كرێت. كاتێك باس له‌م دوو رووخساریه‌ی مۆدێرنه‌ش ده‌كه‌ین وه‌ك حوسێنی به‌شیریێ ده‌ڵێت: مه‌به‌ست ئه‌وه‌ نییه‌ كه‌ له‌ پرۆژه‌ی مۆدێرنه‌دا دژایه‌تیگه‌لێكی زاتی هه‌ن، به‌ڵكو ئه‌م دووانه‌ییه‌ ئه‌نجامی گۆڕانی مێژوویی‌ی هزری مۆدێرنه‌ و رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌یه‌تی له‌گه‌ڵ چه‌ندین كوسپ و ته‌گه‌ره‌. له‌ كۆتاییشدا ئه‌وه‌ به‌ بیر ده‌هێنینه‌وه‌ كه‌ چه‌ندین ره‌خنه‌ی شێلگیرانه‌ له‌ پرۆژه‌ی مۆدێرنه‌ گیراون، سه‌ره‌تا له‌لایه‌ن ماركس و ڤیبه‌ر و دواتریش له‌لایه‌ن قوتابخانه‌ی فرانكفۆرت، بونیادگه‌راكان، پۆست مۆدێرنیسته‌كان ...

---

56 به‌ختیار عه‌لی، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ١٨٥.

هتد.[57] ئەم رەخنانە لە ئەنجامی ئەو کێشە و دیاردانەوە سەریان هەڵدا کە لە مۆدێرنە کەوتنەوە. لە کۆتایی ئەم باسەدا دەکرێ بڵێین سەدام ئەگەرچی زێدەتر پەیڕەوی لە ستالین دەکرد و ئەوی بەدڵ بوو وەك بۆ نموونە هێتلەر، بەڵام چارەنووسی سەدام هەمان چارەنووسی هیتلەر و مۆسۆلینی بوو نەك ستالین.

57 لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ : حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشو.

# بەشی سێیەم

## کۆمەڵگای کورد پێش ڕاگواستن

لەم بەشەی تێزەکەماندا هەوڵدەدین تیشــك بخەینــە ســەر ڕەوشــی کۆمـەڵگای کوردی پێش چارەگە سەدەیەك، یان وردتــر دەتوانــین بڵێــین پێش ســاڵی ١٩٧٥ ، چونکــە ئێمــە گریمـان دەکـەین لـەدوای ســاڵی ١٩٧٥ەوە کۆمـەڵگای کوردی زۆر گۆڕاوە، لەبەر دوو هــۆ: یەکـەم کـە گشتیە و زۆربەی وڵاتانی ناوچەکە بەخۆیانەوە بینیانە، ئەویش جۆرێـك لە نوێبوونەوە و ڕووکردنە پیشەسازی بوو بە مەبەســتی گەشەســەندن لەدوای ڕزگاربوونیان لە کۆلۆنیالیزم. دووەم، تایبەتــە بــە کۆمــەڵگای کوردی، ئەویش کۆچی زۆرەملێ و ڕاگواستنە. هەڵبــەت پێــش ســاڵی ١٩٧٥یــش ڕاگواســتن هــەبوو (لــە بەشــی چوارەمــدا بــەدرێژی لێــی دەدوێین)، بــەڵام لــەدوای ئــەو ســاڵە بــە شــێوەیەکی سەرســوڕهێنەر پەرەیسەند، کە تاڕادەیەکی زۆر شێوەی کۆمەڵگای ئێمەی گــۆڕی. بـۆ سەلماندنی ئەوەش هەوڵماندداوە لە دوو بەشی جیاوازدا لــە کۆمــەڵگای کوردی بکۆڵینەوە: لە بەشی یەکەمدا پێــش ڕاگواســتن (پێــش ســاڵی ١٩٧٥)، تیایدا هەوڵدەدەین زێتر کۆمەڵگای کوردی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا وەرگرین، وێڕای ئەوەی کــە بڕوامــان وایــە کۆمــەڵگای کوردی تا شەستەکانی سەدەی بیست زۆر لە سەرخۆ و بەشێوەیەك کــە هەست پێ نەکراوە، گۆڕانی بە سەردا هاتووە.

له بەشەکەی تردا، دوای ئەوەی راگواستن بە شێوەیەکی بەرفرەوان کۆمەڵگا دەگرێتەوە، ژمارەی گوندەکان بۆ کەمترین رێژە کەمدەبنەوە و فۆرمێکی نوێی گوندەکان بەناوی گوندە هاوچەرخەکان (گوندە شەترەنجیەکان) دروست دەبێت، دواتر هەندێ لەم گوندانە دەبن بە شارۆچکە، هەروەها زۆربەی شارەکانی کوردستانی باشور بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر گەورە دەبن و سیمایان دەگۆڕێت. دواجاریش لەدوای راپەڕینی سالّی ١٩٩١ بەشێکی زۆری گوندە کۆنەکان دووبارە ئاوەداندەکرێنەوە، هەوڵدەدەین بزانین لەو ماوەیەدا چ گۆڕانێکی کۆمەلایەتی لە کۆمەڵگای ئێمەدا رووی داوە.

## باسی یەکەم: لادێی کوردەواری پێش راگواستن

لەم باسەدا، کاتێ باسی لادێ دەکەین مەبەستمان لادێی کوردییە لە کوردستانی خواروو؛ وێڕای هەموو وێکچوونەکان لە نێوان گوندی هەموو پارچەکانی کوردستان. هەروەها نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت کە مەبەستمان لە دەستەواژەی (پێش راگواستن) ماوە زەمەنییەکەیە، واتە پێش دەیەی ١٩٧٠ی سەدەی رابردوو ئەو کاتەی راگواستن بە کردەوە نەبیوو بە سیاسەتێکی سەرتاپاگیر، نەك هەموو لادێیەك پێش راگواستن، چونکە هەموو گوندەکان پێکەوە رانەگوێزران و ژمارەیەکی بەرچاوی لادێیەکان رووبەڕووی راگواستن و کاولکاری نەبوونەوە و تا ئەمرۆش ئاوەدانن.

لە خوارەوە هەوڵدەدەین هەندێك لەبارەی گوندەوە بدوێین تا باشتر بتوانین لادێ و دواتریش کۆمەڵگای خۆمان بناسین.

### شوێن و شێوەی گوند

شوێنی گوند هەر لە خۆیەوە دیار ناکرێت، چەند هۆکارێك هەن کە رۆڵیان هەیە لە دەستنیشانکردنی شوێنی گونددا. ئەم هۆکارانەش

بەپێی ناوچە جیاوازەکان دەگۆڕێن. شاکر خەسباك چەند هۆکارێك بۆ دیارکردنی شوێنی گوندی کوردی ڕیز دەکات لەوانەش:

١ـ سەرچاوەی ئاو: مەبەست بوونی ئاوی ژێر زەوییە (کانی، بیر و کارێز)، چونکە باران بارین لە کوردستانی خواروو وەرزییە، ناکرێ سوود لە ئاوی باران بەبەردەوامی وەربگیرێ، هەروەها چونکە رووبارەکان هەمیشە لە شوێنە نزمەکاندا دەرژێن کەمتر سوودیان لێ وەردەگیرێت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە هۆکاری ژمارەی دانیشتووان و توانای سەرچاوەی ئاوەکە، واتە ئاوی گوندەکە چەندە زۆربێت هێندە دەکرێت خەڵکی زێتر لە گوندەکە کۆببنەوە، بەڵام کاتێك ژمارەی دانیشتووان زۆر دەبێت و ئاوەکە بەشیان ناکات، ئەوا بەشێکی دانیشتووانی گوندەکە ناچار گوندێکی تر لەو نزیکانە دروست دەکەن.

٢ـ هۆکاری مێژوویی: لە ئەنجامی سستەمی خێڵایەتی و هەژاری لە کوردستاندا، هەمیشە ئەگەری ئەوە هەبوو دانیشتووانی گوند رووبەڕووی تاڵان و بڕۆی خێڵەکانی دیکە ببنەوە، بۆیە گوند لە شوێنێك دادەمەزرا کە لە توانای دابێت خۆی لە پەلاماری خێڵەکانی تر بپارێزێت.

٣ـ هۆکاری کومەلایەتی: فاکتەری کۆمەڵایەتی هانی خەڵك دەدا پێکەوە لە شوێنێك کۆببنەوە، نەك هەر ماڵەو بە تەنیا.[1]

بەپێتی خاك هۆکارێکی دیکەی گرنگی دروست بوونی گوندی کوردی بووە، هەر بۆیە دەبینین ئەو ناوچانەی کە بە پیتن وەك دەشتەکان ژمارەی گوندەکان لەوێ زۆرترن وەك لە ناوچە شاخاوییەکان

1 د. شاكر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص ١٤٦ـ١٥٠.

کە بەروبومی کشتوکاڵیان کەمترە. لە لایەکی دیکەشەوە بەرزی و نزمیی زەوی (تۆپۆگرافیا) ڕۆڵی هەبووە لە دروستبوونی گوند.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە چەمکی گوند لە کوردستاندا، هەم خانووەکانی گوندەکە و هەمیش ئەو زەوی و زارە کشتوکاڵیانەی دەورەی گوندەکەیان داوە، واتە ئاقاری گوندەکە دەگرێتەوە.[2]

بە گشتی دەکرێ گوندی کوردی بەسەر دوو جۆردا دابەش بکەین: *گوندی ناوچە دەشتاییەکان و گوندی ناوچە شاخاویەکان*. ئەم دوو جۆر گوندە لەبەر ئەوەی کەش و هەوا و تۆپۆگرافیایان جیاوازە، لە جۆری دابەشبوونی ماڵەکان و شێوەی گوندەکە و ڕووبەرەکەشیاندا جیاوازیان هەیە.

گوندی ناوچە دەشتاییەکان (بۆ نموونە دەشتی هەولێر و پارێزگای کەرکوك) بەگشتی پێکدەچن. ئەم گوندانە شێوەیەکی زێتر نارێکیان هەیە و مزگەوتی گوند، دیوەخانی ئاغا (ئەگەر هەبێت) و گۆڕەپانی گوند بەزۆری لە ناوەڕاستی گوند دان و هەموو خانووەکان بەدەوری ئەواندا و زۆربەی کۆڵانە تەسك و نارێکەکانی ئەم گوندانە لەوێ یەکتر دەگرنەوە. لەم جۆرە گوندانەدا کە ڕووبەرێکی پان و بەرینیان بە بەرەوەیە خانووەکان هەمووی لە یەکترەوە نزیکن کە ئەمەش جێگەی تێڕامانە. بەزۆریش گوند لە شوێنێکی نزم ئاوا دەکرێت، چونکە پشت بە ئاوی بیرەکان دەبەستن.

خانوو لەم گوندەدا لە خشتی قوڕ دروست دەکرێت، سەریشی ئاخەبانە و پلیکانی لە قوڕ دروستکراویشیان هەیە، بۆیە وەك ژیگەل دەڵێت:((گوندەکان کە بەشێوەی یەکنەوایی لە دەشتی پان و بەریندا داکشابوون ئەو هەستەیان دەبزواند کە هەموویان وەك یەك وان.

---

2 لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: د.خصباك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٧.

گوندەکان بەگشتی بێ دار و درەخت بوون. لە دیمەنی یەك تەختی ڕەنگ قاوەیی پێدەشتدا دەتوانەوە.))[٣]

لە کوێستان گوند دەکەوێتە ناو دۆڵ، بەلام بە دەگمەن وا دەبێ گوندەکە لە دامێنی دۆڵەکەدا بێ. گوند بە زۆری دەکەوێتە قەدپاڵی شاخ، وا پەسەندە لە بناری شاخان بێ. خەڵکی ئەم گوندانە بەپێچەوانەی دانیشتووانی دەشت کە بایەخێکی ئەوتۆیان بە دار و درەخت نەدەدا، بایەخێکی تایبەتیان بە دار و دەوەن دەدا.[*]

لەم گوندانەدا خانووەکان لە شێوەی ڕێچکۆلەی مەیلەو ئاسۆیی بە سەر دوو پارچەی سەرەوە و خوارەوەدا دابەش دەبوون. هەروەها لەبەر ئەوەی بەزۆری ئەم گوندانە لە بناری شاخەکان بوون یاخود بڵێین شوێنەکەیان ڕووەو لێژی بوو، خانووەکان بەسەر یەکدا دروست دەکران، بەجۆرێك کە دەتتوانی لە حەوشەی خانووی سەرەوە ڕاستەوخۆ بێیە سەر بانی خانووی خوارەوەی. لەم جۆرە گوندانەشدا خانووەکان نزیکن لەیەکەوە، ئەمەش زێتر لەبەر تەسکی ڕووبەری گوندەکە و نزیکیانە لە سەرچاوەی ئاوەکە.[٤]

سەبارەت بە نزیکی خانووەکانیش دەتوانین بڵێین لە شوێنێك کە مەترسی دوژمن هەبێ خانووەکان بەسەر یەکەوە دروست دەکرێن، بەلام لە نێو هەندێ دۆڵ و گەلیی قووڵدا کە ڕێگەیان سەخت بێ، یان

---

3 لیژەك ژیگل، گوند و شاروچکە کوردییەکانی عێراقی ئێستا، و: عەزیز گەردی، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر ٢٠٠٢، ل ١٥. هەروەها هەر لەبارەی ئەم جۆرە گوندانەوە بگەڕێوە بۆ: د. خسباك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٩.

* تەنانەت دوای ڕاگواستنیش ئەو چیانشینانەی بۆ ناوچە دەشتاییەکان ڕاگوێزراون، وەکو پێشان بایەخیان بە دار و درەخت داوە. لە دوورەوەرا دەزانرێت خەڵکی ئەم ئوردووگایە پێشتر چیانشین بوونە یاخود لە پێدەشت ڕاگوێزراون.

4 لیژەك ژیگل، کۆمەڵی لادێیی کوردستانی هاوچەرخی عێراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، و: عەزیز گەردی، کتێبی سەنتەری برایەتی، کوردستان ١٩٩٩، ل ٨٧ـ٨٨.

سروشتی شوێنەکە وابێ کە دانیشتووانەکەی هەست بە هێمنایەتی بکەن و لە خۆیان دڵنیابن خانووەکان لێکجیا و هەندێ دوور لەیەکتر دروست کراون. هەروەها لە شوێنێك کە داهاتی زەویەکانیان زۆرە گوندەکان لێك نزیکن، لە کێو پارە و ناو دارستانەکانیش دێیەکان لێك دوورن.[٥]

زۆربەی گوندەکان لە دەشت و لە شاخ دووربوون لە رێگا گشتییەکان، چونکە شەقامەکان ماوەیەکی کەم بوو لە ناوچەکەدا دروست کرابوون و گوندەکانیش بەزۆری مێژوویەکی کۆنیان هەیە، هەروەها حکوومەت تەنیا بایەخی بە پێکەوە بەستنی شارە سەرەکییەکان دەدا.

### خانووی گوند

*عەلائەدین سەجادی* لە کتێبەکەیدا بەناوی ((کوردەواری، ١٩٧٤))، باسێکی تایبەت کردووە بە خانووی کوردی. لەو باسەیدا لە دوو جۆر خانوو دەدوێت، خانوی لادێ و خانووی شار. ناوبراو کە باسی خانووی لادێ دەکات، ئاماژە بە خانوویەك دەکات کە بە هیچ شێوەیەك خانووی چیانشینان نییە، بەڵکو ئەو خانووەیە کە لە گوندی پێدەشتدا هەیە و ئەو بەسەر لادێی کوردیدا گشتاندویەتی*. بە کورتی ئەو بەم جۆرە وەسفی خانووەی گوند دەکات: ژوورێك بۆ دانیشتن و خەوتن، ژوورێك بۆ دانەوێلە و کاسە و کەوچك، ژوورێکی گەورە بۆ گەوری مەڕ

---

5 واسیلی نیکیتین، کورد و کوردستان، و. خالید حوسامی (هێدی)، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٢٧٣.

*زۆر لە گەڕیدە رۆژهەڵاتناسانیش هەمان ئەم کارەیان کردووە، بەوەی دیاردەیەك، هەڵوێستێك یان دابونەریتێکیان لە ناوچەیەك بینیوە و بەسەر هەموو کوردستان یان بەسەر هەمو کورددا گشتاندووە.

و بزن، ژوورێکی تر بۆ گا و گۆلك، ژووری مەڕوماڵات دەکەوێتە پشت ژووری نووستنی خۆیانەوە، مەڕوماڵاتەکە بە ناو ژووری نووستنی خۆیانەوە دەڕوا تا دەگاتە پشتیرەکە.[6] ئەمەش خانوویەکی بچووك نییە، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا کە بەفرێکی زۆر دەباری بەدەگمەن خانووی بەم گەورەیەیان لیّ دەبینرا.

*هانسن* بەپێچەوانەوە پێی وایە سێ جۆر خانوو لە کوردستاندا هەیە، یەکێکیان دەگوازرێتەوە (رەشماڵ)، کەچی دووەکەی تر چەسپاون و جێگۆڕکێیان پێ ناکرێت (کەپر، خانوو).[7] ئەو خانووەی *سەجادی* لە گوندی کوردیدا وەسفی کرد خانووێکی گەورە بوو، هەروەها یەك نهۆم، بەڵام *هانسن* دەڵێت: لە گوندی کوردەواریدا خانووەکان بچووکن. دوو دیاردە لەم خانووەدا سەرنج رادەکێشن، یەکەم، هەندێ جار هەیوانی دانیشتن دەکەوێتە نهۆمی سەرەوە و نهۆمی خوارێ دەکەنە پشتیر. دیاردەی دووەم ئەستوندی بەسەر کۆڵەکە لە قەدی وشك و سپی کراوی دارچنار دروست دەکرێن.[8]

ئێمە لەوەی سەرەوەدا رووبەرووی دوو گوتەی جیاواز بووینەوە، *سەجادی* وەسفی خانوویەکی گەورە دەکات لە کوردستان و *هانسن* پێی وایە خانووی کوردەکان بچووکن. هۆیەکەش رەنگە ئەوە بێت هەر یەکێکیان باسی خانووی ناوچەیەکی تایبەتی دەکەن، نەك خانووەکانی هەموو کوردستان. پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە ئەو خانووەی *سەجادی* باسی دەکات خانووی دەشتە. هەروەها بەپێی نووسینەکانی

---

6 عەلائەدین سجادی، کوردەواری، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٧٤، ل١٧٧.

7 هێنی هارۆلّ د هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، و: عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا ١٩٨٣، ل ٥٨.

8 هەمان سەرچاوە، ل ٦٨ـ٧٠.

*هانسیش*، ئەو تەنیا چەند خانوویەکی کەمی کوردستانی بینیوەو ئەو خانووانەش زێتر هی چیانشینەکان بوون.

*خەسباك* لە وەسفی گوندی شاخاویدا دەڵێت: خانوو لە ناوچە شاخاویەکان بەزۆری لاکێشەییە. دیواری دواوە تەنیا چەند پێیەك بەرزە، بانی خانووەکەش کەمێك سەرەو لێژە. ژووری نووستن و دانیشتن یەك ژوورە، و لەوانەیە ژوورێکی بچووك تایبەت بکرێت بە میوان. ژوورەکانی تر بۆ ئاژەڵ و کەلوپەلەکانن. کەم رێدەکەوێ رەشەوڵاخ لە هەمان ژووری لادێیەکاندا بمۆلن. خانوو یەك دەرگای هەیە، بەلام لە ژوورەوە دەرگای دیکە هەن. بەلام خانوو لە دەشتی هەولێر و کەرکووك جیاوازە، شێوەکەی چوارگوشەییە و، بانێکی کەوانەیی هەیە. ژوورەکانیش بەیەکەوە نین و لەیەکتر جیاوازن.[٩]

لێرەدا دەتوانین بۆچوونەکانی ((*ژیگل*))یش لە بارەی خانووی کوردییەوە زۆر بە کورتی بخەینەڕوو. ئەو دەڵێت خانوو لە گوندی کوردیدا یەك نهۆمە، بەلام خانووە چیاییەکانی سەرسنوور دوو نهۆمن، نهۆمی خواریّ بۆ مالات و ئازووقەیە.[١٠]

خانووی کوردی لە هەموو ناوچەکان تارادەیەك یەك جۆر نەخشەی هەیە، بەلام خانوو لە ناوچە شاخاوییەکان، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی زستانان بەفری زۆری لیّ دەکەوێت، خانوویەکی تایبەتە کە دوو نهۆمە. ماڵی کوردی بەزۆری لە خانوویەکی سادە و پەرپوت پێکدێت کە هەموو خێزانەکە (تەنانەت ئەگەر خێزانێکی گەورەش بێت) لە تاکە ژوورەکە و بەر هەیوانەکەدا دەژین و دەشێ بەشێکی ئەو ژوورە گەورەیە

---

9 د. شاکر خصباك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦١ـ١٦٢.

10 لیژەك ژیگل، کۆمەڵی لادێی کوردستانی عێراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢.

ببرێنەوە بۆ کەلوپەل و ئازووقە، هەروەها کۆلیتێکی بچووکیش لە بن دیواری پێشەوە بەلای دەرەوەیدا هەیە، دەشێ خانوو سەرشۆکیشی هەبێت. خانوو لە دەشت دەکرێ دوو حەوشەی هەبێت یەك بۆ ماڵەوە و ئەویتر بۆ مالات ببرێتەوە. تەنیا خانووی پێدەشت حەوشەی هەیە و لە ناوچە شاخاویەکاندا حەوشە نییە.[11]

جۆری دیکەی خانوو کە *کەپرە* و *هانسن* بە جۆرێکی خانوو لە کوردستاندا ناوی دەبات، ئەویش هەر تایبەتە بە لادێنشینەکان. ئەم جۆرە خانووە (کەپر) لە ناو باخەکان دروست دەکرێت و تایبەتە بە هاوین، واتە خانوویەکە لەپاڵ خانووی هەمیشەییدا (کە وشەی لەپاڵ بەکاردەهێنین مەبەستمان مانا فیزیکیەکە نییە). ئەم جۆرە هەم لە پێدەشت و هەم لە شاخیشدا هەیە. لە ناوچە شاخاوییەکان دانیشتووانی ئەو گوندانەی دەکەونە ناو گەلی و دۆڵەکان لەبەرئەوەی لە هاوین زۆر گەرم دەبێت، دەچنە شوێنێکی تر کە ئاوی هەیە پێی دەڵێن ((زۆم))، یان ((وار))، و لەوێ کەپر دروست دەکەن.[12]

هەروەك چون بینیمان نەخشەی خانوو لە پێدەشت و ناوچە شاخاوییەکان جیاوازە، ئەو کەرەستانەی لە دروست کردنی خانووشدا بە کاردەهێنرێن جیاوازن. کەرەستەی خانووبەرە لە ناوچە چیاییەکاندا لەگەڵ ژینگەی سروشتی دەگونجێت، بەرد لە دیواردا بەکاردێت هەروەها سوود لە قوڕیش بۆ یەکگرتنی بەردەکان وەردەگرن. لە ناوچەی هەورەماندا قوڕ بەکارناهێنرێت.[13] *ڤاسیلی نیکیتین* دەڵێت لە ناوچەی هۆرەمار (دەکەوێتە سەرسنووری نێوان عێراق و تورکیا)

---

11 بۆ زێتر زانیاری لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٤ـ٩٦.
12 واسیلی نیکیتین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٥.
13 د. شاکرخصباك، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٥.

خانوو به بەرد و قسلْ دروست دەكرێن.[14] لە زۆر شوێنی دیكەشدا ئەم جۆرە كەرەستەیە بەرچاو كەوتووە.

كەرەستەی خانووی پێدەشت بەتەواوی جیاوازە، لە پێدەشتدا ئەو شوێنانەی كە بەفر نایانگرێتەوە و رادەی باران بارینیش كەمترە، بەرد لە دیواردا بەكارناهێنرێت، ئەمەش زێتر لەبەر ئەوەی بەرد لەو ناوچانەدا كەمە و ئەوەی كە هەشە دەست نادات، لە جیاتی ئەوە بەخشتی قوڕ دیوارەكان دەكرێن و هەر بە قوڕیش سواق دەدرێن. هەروەها لە نێوان چینەكانیشدا قوڕی بە قسلْ و كا بەكاردێت. ئەم خشتانە بەزۆری لەبەر خۆر وشك دەكرێنەوە و لە هەندێ شوێنی كەمیش سوور دەكرێنەوە.*

هەروەها بانی خانووی كوردی تەخت و ئاخەبان بوو. بریتی بوو لە حەسیری دارخورما[15] (لە ناوچە چیاییەكان گەڵای دار مازوو و بەڕو) و هەراش و قوڕی بە كا و قسلْ (قۆرەپەستی پێ دەڵێن، ئەم شێوازەش لە هەموو شوێنێك پەیڕەو ناكرێت). ئەمانە هەموویان دەكەوتنە سەر چەند كاریتەیەكی سپیندار كە بە گوێرەی تەوەری بیناكە، بە بەرینایی، یان بە درێژایی بەسەر دیوارەكان رادەنران... بانەكەیان بە چینە قوڕێك سواق دەدا و كە كزر دەبوو، باگوردانیان لەسەر دەگێڕا.[16] هەموو بانێكیش باگوردانێكی هەر لە سەر بووە.

---

14 واسیلی نیكیتین، سەرچاوەی پێشوو، ل۲۷۳

* تەنانەت ئێستاش لە لادێكانی پێدەشتدا قوڕ لە دروستكردنی خانوبەرە، گەوڕی پەز، دوكان ... هتد بایەخی خۆی هەر ماوە.

15 هێنی هارۆڵد هانسن، كچانی كورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ۳۵.

16 لیژۆك ژیگل، گوندو شاروچكە كوردییەكانی عێراقی ئێستا، سەرچاوەی پێشوو، ل ۲۱ـ۲۲.

هەموو ئەو بیرورا جیاوازانەی لەبارەی خانووی کوردیەوە خرانەڕوو، وێڕای جیاوازی و ناکۆکیان لەگەڵ یەکتر دەشێ هەموویان راست بن، بەلاّم هەر یەکە و لەبارەی ناوچەیەکەوە نەك هەموو کوردستانی باشور.

پێویست دەکات ئەوەش بلێین کە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە تا ئێستا بەسەرمان کردوونەتەوە ئاماژە بە کەمی و سادەیی کەلوپەلی ناومالّی لادێنشینە کوردەکان دەکەن.[17] مالّی کۆچەرەکان بۆ نموونە هەر ئەوەندە بوو کە لە چوارپێییەکانیان بار دەکرد.

**رەوشی خوێندەواری و تەندروستی**

قوتابخانە لە کۆتایی پەنجاکان بەشێوەیەکی بەرچاوتر لە گوندەکانی کوردستاندا بلاّوبووەوە، بەلاّم دەتوانین بلێین هێشتا قورسایی (خوێندن) لە سەر مزگەوتەکان بوو. مزگەوت هەر لە کۆنەوە رۆڵی فێرکردنی لە کوردستاندا لە ئەستۆ گرتووە، بەلاّم ئەوانەی لە مزگەوتیش دەیانخوێند (فەقێکان) بە گشتی ژمارەیان زۆر کەم بوو، کە ئەمەش چەند هۆکارێکی بابەتیی خۆی هەیە.

*خەسباك* لە کتێبەکەیدا بەناوی ((الکرد و المسأله الکردیه، ١٩٥٩))دا دەڵێت تەنیا گوندە گەورەکان قوتابخانەیان هەیە. قوتابخانەکانیش (لە شار و لە گوند) کێماسیان زۆرە هەم لەڕووی مامۆستا و هەم لەڕووی کەلوپەل و، دواجاریش لەڕووی پێویستەکانی دیکەی خوێندن.[18] پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە لە گوندەکاندا تەنیا کوڕان دەچوون بۆ قوتابخانە.[19]

---

17 د. شاکر خصباك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٦ـ١٦٧.

18 د. شاکر خصباك، الکرد و المسالة الکردیة، منشورات الثقافة الجدیدة، مطبعة الرابطة، بغداد ١٩٥٩، ص ٦٤.

19 بۆ زێتر زانیاری لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: هێنی هارۆڵد هانسن، کچانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٦.

هەندێ گوندی کوردی لە نیوەی دووەمـی سـەدەی رابـردوودا هیـچ خوێندەوارێکیان نەبوو. لە هەمان کاتیشدا لە هەندێ گوندیشدا تەنیا دوو یان سێ کەس توانای خوێندنەوە و نووسـینیان هـەبوو، و هـەندێ کات مەلای دێ تاکە خوێندەوار بـوو لـە گونـددا.[20] ئـەویش ئەگـەر گوندەکە مەلای هەبووبێت.

((*هانسن*))یش بۆمان دەگێڕێتەوە کە کتێب و دەفتەر شتی تـەواو نامۆ بوون لە ماڵ.[21] لەوەی لە سەرەوە باسکرا دەبینین گوندی کـوردی لەڕووی خوێندن و خوێندەوارییەوە لەوپەڕی خراپیدا بوو.

*ڕەوشی تەندروستیش* لە ڕەوشی پەروەردە و فێرکردن باشـتر نـەبوو، چونکە ئەگەر خوێندنگە لە پـەنجاکانی سـەدەی بیسـتەم گەیشـتبێتە هـەندێك گونـدي گـەورە لـە کوردسـتانی خـواروودا، ئـەوا هیـچ نەخوشخانەیەك لە هیـچ گوندێکـی ئـەم وڵاتـەماندا بوونـی نـەبووە. زۆربەی جاران نەخۆشەکان بۆ سەر مەزاری شـێخ و پیاوچاکـان یـاخود ڕاستەوخۆ بۆ لای مەلا دەبران، ئەویش یان نووشتەی بـۆ دەکـردن یـان ئامـوژگارییەکی دەکردن. هـەروەها پێویسـتە ئامـاژە بـەوەش بکـەین هەمیشە *حەکیمی کوردەواری* کە داو و دەرمانی لە گژوگیـا دروسـت دەکرد هەبووە، زۆربەی جار لەلای خـەڵکی لادێنشـین جێگـەی ڕێـز و متمانە بوون.

سەرەڕای نەبوونی دکتور و نەخوشخانە، چەند هۆکارێکی دیکـەش ڕۆڵیان هەبوو لە خراپیی ڕەوشی تەندروستیدا. لێکۆڵـەران گرنگـترین هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی نەخوشی دەگێڕنـەوە بـۆ نـەبوونی توالێتـی تەندروستی (هەندێ کاتیش نەبوونی توالێت، کە ئەم حاڵەتە لـە زۆر

---

20 بۆ زێتر زانیاری لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: د. شاکر خصباك، الكرد و المسـالة الكردية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

21 هێنی هارۆڵد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨.

گوندی کوردستاندا هەبووە)، کەمی خۆشوشتن، بوونی تەویلە لەپال خانوودا، بەخێوکردنی باڵندە لە ژوورەوە.[22]

هەروەها زۆربەی گوندنشینەکانی جیهان رووبەڕووی دوو کێشەی سەرەکی دەبنەوە ئەوانیش بریتین لە: کەم خوراکی و بەدخوراکی.[23] ئەم دوو حاڵەتەش بە زەقی لە کوردستاندا دیار بوون، بۆ نموونە لە گوندەکاندا سەوزە و گۆشت تەنیا لە بۆنەکاندا دەخۆران.[24]

*خەسباك* لە شوێنێکدا دەڵێت مردنی ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە ساڵێك کەمترە رێژەیان لە هەموویان زێترە.[25] هەر ئەمەش وای لە خاتوو *هانسن* کردووە بڵێت لە کوردستانی خوارروودا وەکو سەدەکانی ناڤین تەنیا منداڵی بەهێز و پتەو دەمێنێتەوە و پێڕادەگا.[26] کاتێکیش کە بەراوردی رێژەی زیادبوونی دانیشتووان بکەین پێش ساڵی ١٩٧٠ و دوای ساڵی ١٩٧٠، هەست بەوە دەکەین کە مردن لە کوردستاندا چەندە زۆر بووە.

**پیشەی لادێنشینان**

وشەی گوند سیما و جۆرێکی نوێی ژینگە بە خەیاڵماندا دەهێنێت، واتە رووبەرێکی زەوی کە داچێنراوە. چەند لایەنێکی بەرهەمهێنان: کێڵگەکان، باخ و بیستان و لەوەڕگاکان ئەو توخمانەن کە رووخساری گوند وێنە دەکەن.[27] هەروەها دەتوانین بە دەربڕینێکی

---

22 منوچهر محسنی، جامعەشناسی پزیشکی، نشر طهوری، تهران١٣٨٠ (٢٠٠١)، ص ٩٠.
23 هەمان سەرچاوە، ل ٩٢.
24 د. شاکر خصباك، الاکراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٠.
25 د. شاکر خصباك، الاکراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٩.
26 هێنی هارڕۆڵد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٨.
27 منوچهر محسنی، جامعەشناسی عمومی، نشر طهوری، چاپ هفدم، تهران ١٣٨٠ (٢٠٠١)، ص ١٩٥.

دیکە بڵێین گوند پێش هەر شتێك جۆرێکی تایبەت لە ژینگە دەردەبڕێت، واتە پارچە زەویەك کە لە لایەن مرۆڤەوە داچێنراوە، هەر بۆیە ئەو ناوچانەی دەست لێنەدراون و نەچێنراون بە گوند ناونانرێن.[28] ئەمەی لە سەرەوە هات وەسفێکی گشتی گوندە لە هەموو جیهاندا، و سەبارەت بە گوندی کوردییش راستە.

ژیگل لە حەفتاکاندا وای بۆ دەچێت کە زۆربەی دانیشتووانی کوردستانی خواروو بە کشوکاڵەوە خەریکن، بەڵام شان بەشانی زەوی کێلان و داچاندنی دەغڵ و دان، مەڕومالاتیش بەخێودەکەن.[29] هەڵبەت مەبەستی ناوبراو لادێنشینەکانە نەك دانیشتووانی شار، چونکە باسەکەی ئەو تایبەتە بە لادێنشین. ئەم پیشەیەی کشتوکاڵیش کە ئەو ئاماژەی پێدەکات لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاواز بوو. لە کۆتایی شەستەکاندا تاکە بەروبومی دەشتی هەولێر گەنم و جۆ بوو.[30] لە ناوچە چیانشینەکاندا بایەخێکی زۆر بە باغ و رەز دراوە. لە سلێمانی، هەروەك *خەسباك* لە کتێبەکانیدا باسی دەکات، بایەخێکی تایبەتی بە توتن دراوە. جوتیاری کورد بە شێوەیەکی تێکڕایی یەك مانگا و دە دوانزدە سەر مەڕ و نزیکەی ئەوەندەش بزنیان راگرتووە. بەزۆری هەر کێلگەیەك کەرێکی هەبووە، هەندێ جار ئێسترێك و هەندێ مریشك و چەند عەلەشیشێك.[31]

---

28 مەنوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، و. رێبوار سیوەیلی و ئەوانی دیکە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ۲۰۰۲، ل ۲۸٤.

29 لیژۆك ژیگل، کۆمەڵی لادێی کوردستانی عێراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧.

30 هەمان سەرچاوە، ل ٥٠.

31 هەمان سەرچاوە، ل ٦٤.

وێڕای ئەوەی زۆربەی دانیشتووانی لادێنشین خەریکی داچاندن و بەخێوکردنی مەڕومالاَت بوون، ئەمە تاکە پیشەیان نەبوو. *بڕۆدڵ* لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی *((سەرمایەداری و ژیانی ماددی، ١٩٦٧))* دەڵێت: ئەگەرچی شار بە تەواوی بەرهەمهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و بەخێوکردنی مەڕومالاَتی بە گوند نەسپارد، گوندیش بە هەمان شێوە هەموو چالاکییە پیشەسازییەکانی خۆی رانەگرت، بۆ بەرژەوەندی شارە نزیکەکان... هەرگیز لادێیەکان چۆڵ نەبوونە لە پیشەکاران.[٣٢] ئەمەی *بڕۆدڵ* باسی دەکات بەتەواوی بەسەر شارەکانی کوردستاندا دەچەسپێت. *خەسباك* ئاماژە بەوە دەکات کە هەر چەندە بەرهەمی پیشەسازی نوێ لە نیوەی دووەمی سەدەی رابردوو رێگای دۆزیوەتەوە بۆ ناو دوکانی گوند و گەورە شارەکان، بەلاَم کەرەستەی پیشەسازیی گوندەکان هێشتا ئەولەویەتیان هەبوو. هەروەها درێژەی پێدەدات کە بەرهەمە پیشەسازییەکانی گوند تەنیا بۆ پێداویستی خێزان نین، بەڵکو بۆ مەبەستی بازرگانیش بەکاردێن.[٣٣] *هانسنیش* ئاماژەی بەم دیاردەیە کردووە کە دەڵێت تەنیا لە مەڵبەندی ساکاری لادێ پیشەسازی خۆمالی هەیە ئەویش رستن و چنین و گلێنەکاری هەروەها تەون و جۆلایی...[٣٤] لە یادیشمان نەچێت لادێنشینانی سەرسنوورەکان هەمیشە بازرگانی زۆریان لە ناودا هەڵکەوتوون، واتە ئەوانەی کاری کڕین و فرۆشتن و گواستنەوەی شتومەك دەکەن و بە قاچاغچی ناودەبرێن.

---

32 فرنان برودل، سرمایەداری و حیات مادی، ت: بهزاد باشی، نشر نی، تهران، ١٣٧٨، ص ٥٠١.
33 د. شاكر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٣٥.
34 هێنی هارۆڵد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٢.

## بونیادی کۆمەڵایەتیی خێزان لە گوندی کوردەواریدا

تەنانەت ئەمڕۆش تاڕادەیەك سروشتێکی باوکسالارانە* بەسەر خێزانی کوردی دا زاڵە، وێڕای سستبوونی ئەو سستەمە، چ جای پێش راگواستن، واتە لە دوو دەیەی پەنجا و شەستی سەدەی بیست. جۆری خێزان لە گوندی کوردیدا، خێزانی باوکسالاری (Patriarchal family) بوو. باوك گەورەی ماڵە، دوای ئەو کوڕە گەورەکان دێن ئینجا کچەکان. ئافرەت پلە دوو بوو.[٣٥] ئەمەش شتێکی سروشتییە لەو کۆمەڵگایانەدا کە سستەمی ئابووری پشت بە کشتوکاڵ و شوانکاری بەستێت. لەم جۆرە چالاکیانەدا باوك رۆڵی سەرەکی دەبینێت. دەکرێت بڵێین ژمارەیەك لە خێزانەکان لە جۆری لیپلای (Leplay)** یاخود خێزانی ستێم (Stem Family)ی بوون هەروەها هەندێ لە خێزانەکان لە جۆری ناوەکی بوون (Nuclear Family) کە لە دایك و باوك و

---

35 د. شاکر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧١.

*لە راستیدا تاڕادەیەك ئێستا چەمکەکانی باوکسالاری، باوکسالارانە و باوکسالار لە فەرهەنگی وشەکانی زاناکانی زانستە کۆمەلایەتیەکاندا نەماون. جاران ئەم زاراوانە لەبارەی ئەو خێزانانە بەکاردەبران کە پیاوێکی تاڕادەیەك بەتەمەن فەرمانڕەوا بوو بەسەریانەوە، ئەگەرچی ئەم زاراوانە بەکارهێنانی دیکەشیان هەیە. لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: جولیوس گولد و ویلیام ل. کولب، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٢.

**خێزانی لیپلای یاخود ستێمی جۆرە خێزانێکە دەکەوێتە نێوان خێزانی ناوەکی و خێزانی گەورە ( کە سێ نەوە باوك و باپیر و نەوە لە ژێر بانێکدا دەژین) ، هەروەها دەکرێ بڵێین خێزانی ستێمی ئەو جۆرە خێزانەیە کە باوك و یەکێك لە کوڕەکانی لە خێزانی سەرەکیدا دەمێننەوە و منداڵەکانی دیکەش هەریەکە بۆ خۆی خێزانێکی سەربەخۆ پێکدێنێت، واتە جیا دەبنەوە لە ماڵی بابیان بەبێ ئەوەی پەیوەندی خۆیان بەماڵە سەرەکییەکەوە بپسێنن. لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: اك برن و نیم کوف، زمینە جامعەشناسی. اقتباس ا. ج. اریان پور، نشر سیزدهم، انتشارات گسترە و مؤسسە انتشارات نگاه، تهران ١٣٨٠ (٢٠٠١)، ص ٣٦٨ .

منالّەکانیان پێکدێن. ڕێژەیەکی بەرچاویش لە خێزانەکان، کە ڕەنگە بتوانین بڵێین نزیکەی ٢٠٪ خێزانی گەورە (Extended family) بوون.

نیشتەجێبوونی خێزانی کوردی خەسڵەتێکی باوکانەی هەیە، بەو پێیەی کە ئافرەت دەگوازرێتەوە بۆ ئەو شوێنەی پیاوەکەی لێ نیشتەجێیە. لە خێزانی کوردیدا هانی خاوەندارێتی تاکەکەسی نەدەدرا، تەنانەت دروستبوونی خێزانی نوێش (بە هێنانی ژن بۆ کوڕەکان) بەزۆری نابێتە هۆی سەربەخۆیی کوڕ لەڕووی داراییەوە.[36]

خێزان لە گونددا یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرهەمهێنانە، هەروەها کرۆك و ناوەندی چالاکییە ئابووری کۆمەڵایەتییەکان پێکدێنێت، پشت ئەستۆرە بە هاوکاری و دەروەستەیی (الـتزام)ی بەرامبەر و خۆشەویستی. لە لایەکی دیکەشەوە لەڕووی دەسەڵات و نەسەبەوە باوکسالارانەیە؛ دواجاریش شێوەیەکی هەرەمیانەی هەیە لەڕووی تەمەن و ڕەگەزەوە.[37]

لەبەر ئەوەی خێزان باوکسالارانەیە ئەوا زەمینە و بوارێکی گونجاو دەرەخسێ بۆ سەرهەڵدانی بالادەستیەکی دووانەیی. بالادەستی باوك بەسەر دایك و هەموو خێزانەکە، هەروەها بالادەستی ڕەگەزی نێر بەسەر ڕەگەزی مێدا، بەبێ ئەوەی حیسابێکی زۆر بۆ تەمەن بکرێت.[38] تاکەکانی خێزان هەموویان کار دەکەن، هەر یەکە و بەپێی توانا و تارادەیەکیش کارەکان دابەش کراون. بڕیارەکان لەلایەن باوکەوە

---

36 هەمان سەرچاوە، ٤٥٣ـ٤٥٧.

37 د. حليم بركات، المجتمع العربي المعاصر، الطبعة السابعة، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠١، ص ١٨٤.

38 لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: د. هشام شرابي، النظام الابوي و اشكالية التخلف في المجتمع العربي، الطبعة الثانية، مركز دراسات الوحدة العربية، ت: محمود شريح، بيروت، ١٩٩٣، ص ٤٩.

دەردەچن و بەرپرسیاریەتییەکانیش لە ئەستۆی ئەون، بەلام هەموو ئەندامەکانی خێزان لە هەموو شتێکدا هاوبەشن. کارێکی چاکە و پیاوانە کە هەریەکێکیان ئەنجامی دابێت بۆ هەموویان شانازیە، کارێکی نەنگیش لە هەر یەکێکیان کەوتبێتەوە بەسەر هەموو ئەندامەکانی ئەو خێزانەدا دەشکێتەوە لە سەر ئاستی بنەماڵەدا، بەلام لە ئاستی گونددا بە سەر بنەماڵەکەدا دەشکێتەوە.

هەروەها لە گوندی کوردیدا کار دابەش کراو بوو لە نێوان پیاو و ئافرەتدا.[٣٩] کاروباری ژن بریتین لە نانکردن، چێشتلێنان، مەڕ دۆشین، دارهێنان لە شاخ، جوت و درەو، کاری رەزوباخ...هتد[٤٠] بەلام کارەکانی پیاو زۆربەی لە دەرەوەی ماڵەوەن. هەروەها لە لادێ بە پێچەوانەی شار ژن و مێرد پێکەوە دەژین و هاوکاری یەکتر دەکەن.[٤١]

هاوسەرگەری سیاسەتی خێزانە، هەر بۆیە ماڵی زاوا بایەخێکی زۆر بەناوبانگی کۆمەلایەتی ئەو ماڵە دەدەن کە ژنی لێ دەخوازن. هاوسەرگری کاری خێزانە نەك تاکەکەس. خێزان هاوسەرگریەکە رێکدەخات بەپێی بەرژەوەندی و خواست و ئەو چەمکانەی کە ئەو پێیان رازییە، وەك جوانی و ئاکار و لێهاتوویی. بەزۆری، تاك (کورەکە و دواتریش کچەکە) کەمترین رۆلی هەیە لەم دەستنیشانکردن و بڕیاردانەدا.[٤٢] هەر بۆیەش دەبینین هەلبژاردنی بووك لە دەستی زاوادا نەبوو، بەلکو ئەمە کاری خێزان بوو. زۆر جار تا بووك نەدەگوازرایەوە، بووك و زاوا یەکتریان نەدەبینی. هەروەها هەموو ئەو بووکانەی *هانسن*

---

39 هێنی هارۆلد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦

40 هێنی هارۆلد هانسن، کچانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨

41 هەمان سەرچاوە، ل ٧٥

42 لەم بارەوە بگەرێوە بۆ: د. حلیم برکات، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٧. هەروەها هێنی هارۆلد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣.

له دوو کتێبه‌که‌یدا باسیان ده‌کات ته‌مه‌نیان بچووك بووه واته که‌متر له ١٦ ساڵ، ناوبراو که چوو بوو بۆ شاییه‌ك ته‌مه‌نی بووکه‌که ٢٦ ساڵ بوو، خه‌ڵکی دێ پێیان وابوو ئه‌مه ته‌مه‌نێکی زۆره بۆ بووك.[٤٣]

سه‌باره‌ت به دڵداری و حه‌زلێکردن زۆرجار په‌یوه‌ندی نییه به ژنهێنانه‌وه. ژنهێنان کارێکی خێره و له به‌ینی هه‌ردوو خێزانی گه‌نجه‌کان ده‌به‌سترێ، و مه‌به‌ستیان ئه‌وه‌یه ئه‌وه‌نده‌ی پێیان ده‌کرێ ئه‌ندامێکی تازه‌ی چاك بهێننه ناو خێزانه‌که‌یان.[٤٤]

دره‌نگ شووکردن و ژنهێنان له خه‌سڵه‌ته ره‌تکراوه‌کانی گوندی کوردی بوون. ئه‌م جۆره که‌سانه تووشی ره‌خنه لێ گرتن و گومان ده‌بوونه‌وه. نه‌ریته‌کانی ژنهێنان کاره‌که‌یان ئاسان ده‌کرد. به‌تایبه‌تی ژن به ژنێ که ماره‌یی لاده‌بات که کوسپێکی گه‌وره‌بوو[٤٥] -به‌چاوپۆشی کردن له باشی و خراپیه‌کانی ئه‌و نه‌ریته.

ئه‌ندامه‌کانی خێزان له ماڵه‌وه هه‌موو پێکه‌وه ده‌خه‌وتن، ئه‌وه نه‌بێ که بووك و زاوا ده‌خرانه ژوورێکی ته‌نیاوه. هه‌روه‌ها لادێنشینه‌کان له حه‌سانه‌وه و نووستندا جلیان نه‌ده‌گۆڕی.[٤٦] بووك و زاواش دوای یه‌که‌مین نۆبه‌ره لێك ده‌ترازان، ژن بۆ ناو دنیای ژنان و کابراش بۆ ناو دنیای پیاوان.[٤٧]

له هه‌موو رۆژهه‌ڵات که ژن دێنن به هیوا و مه‌به‌ستی منداڵبوونه، لای کوردیش هه‌ر وایه.[٤٨] باکیان نییه ئه‌گه‌ر زۆر

---

43 هێنی هارۆڵد هانسن، کچانی کورد، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٢٣.
44 هه‌مان سه‌رچاوه، ل ٧٣.
45 د. شاکر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل٨٤.
46 هێنی هارۆڵد هانسن، ژیانی ئافره‌تی کورد، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٨٧.
47هه‌مان سه‌رچاوه، ل ٩٩.
48 هه‌مان سه‌رچاوه، ل ٢١٨.

منداڵیان ببێ.[49] *خەسباك* دەڵێت: لە لیوای سلێمانی تا بکرێ منداڵیان دەبێت، هۆکارەکەیش پشت بەستنە بە کشتوکاڵ وەك بنچینەی ژیانی ئابووری کە مناڵان بەشداری لە بەرزکردنەوەی داهاتی خێزاندا دەکەن لەو بارەدا. بەخێوکردنی مناڵان هێندەی ناوێت و سستەمی کۆمەڵایەتی خێڵەکی و باوکسالاری حەزی لە خێزانی گەورەیە، هەروەها مەیلە ئایینییە بەهێزەکان دژی بەربەستن لە بەرانبەر وەچەدا.[50]

## مزگەوت و دیوەخان

مزگەوت و دیوەخان ئەو دوو دەزگایەن کە ئەگەر پێکەوەش لە یەك گونددا کۆنەبنەوە، ئەوا بە زۆری یەکێکیان هەیە ئەگەر دیوەخان لە گوندا هەبێت ئەوا مەرجە مزگەوتیش هەبێت، بەلام مەرج نییە ئەگەر مزگەوت هەبێت دیوەخانیش هەبێت. وێڕای ئەوەی کە مزگەوت شوێنێکی سەرەتا ئایینییە و بە مەبەستی پەرستن دروست دەکرێت و دیوەخانیش بە مەبەستێکی تەواو دونیایی بونیات دەنرێت. دەبینین لە هەندێك ئەرکدا یەکتر دەگرنەوە.

ئێمە لە سەرەوە گوتمان زۆربەی گوندەکانی کوردستان مزگەوتیان هەیە، بۆ نموونە لەو ١٥١٩ گوندەی کە لە پارێزگای سلێمانی بە دەستی رژێم کاولکرا و لە کتێبەکەی شۆڕش رەسوول ((وێرانکردنی وڵاتێك))دا ناویان هاتووە، ئاماژە بەبوونی ١٣٢٧ مزگەوتیش کراوە،[51] لە کاتێکدا نووسەر لە زۆر شوێن ئاماژەی بە هیچ یەکێك لە دەزگاکانی ((نەخۆشخانە، قوتابخانە، مزگەوت)) نەکردووە، چونکە زانیاری لەبارەی هەندێ شوێنەوە نەبووە.

---

49 هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٧.

50 د. شاکر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩.

51 Shorsh M. Resool. op. cit, pp 91_167.

مزگەوتیش وەك هەموو خانووبەرەیەكی لادێ سادە و ساكاربوو. مزگەوت هیچ رووخسار و دیمەنی تایبەتی بە گوند نەدەبەخشی، لە پێدەشتا مزگەوت نزم و سندوقیە. لە شاخان مزگەوت خانوویەكی ساكارە و تەنیا یەك نهۆمە. مزگەوت منارە و گومەزی بە سەرەوە نییە. بانی تەختە و وەكو خانووەكانی دەوروبەر وایە. مزگەوت لە دەرەوەرا ئەوەندە سەرنج راكێش نەبوو، بەلام لە ناوەوە زۆر بایەخی پێدەدرا.[٥٢]

بەلام *دیوەخان* (كۆچك) لە دیارترین سیمای گوندی كوردیە. دیوەخان گرنگترین شوێنی كۆبوونەوەیە لە لادێدا، مەسرەفی دیوەخان دەكەوێتە ئەستۆی هەندێ ئاغای عەشیرەت یان خاوەنداری گوندەكە.[٥٣] بۆ مەسرەفی دیوەخانیش، ئاغا خاوە لە گشت لادێییەكان دەستێنێ. دانەوێلە یاخود مەڕ و بزن.[٥٤] *خەسباك* لە كتێبەكەی ((الاكراد: دراسة جغرافية اثنوغرافية))دا جیاوازی لەنێوان سێ جۆر دیوەخاندا دەكات، دیوەخانی ئاغا عەشایرەكان، دیوەخانی گوندە خاوەن موڵكە گەورەكان و دیوەخانی گوندی خاوەن موڵكە بچووكەكان.[٥٥]

سەرەڕای ئەوەی میوانەكانی گوند لە دیوەخان دەحەوێنەوە و لەوێ خزمەتیان دەكرێت و ئەوە سەرەكیترین ئەركی دیوەخانە، دیوەخان چەند ئەركێكی دیكەشی هەیە: دەمەو ئێواران گشت پیاوانی ئاوایی لێی

---

52 لیژەك ژیگل، كۆمەڵی لادێی كوردستانی عێراق بەرامبەر بە نوێ بوونەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨ و ٩٩.

53 هادی رشید الچاوشلی، الحياة الاجتماعية فی كردستان، مطبعة جاحظ، بغداد ١٩٧٠، ص ٥٢.

54 مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و: كوردۆ، بەرگی یەكەم، چاپی دووەم، ئۆفسێتی روون، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١١٩.

55 د. شاكر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١٦ـ٤١٩.

کۆدەبنەوە و باسی پێشهات و بەسەرهاتی ڕۆژیان دەکەن، کێشە و گرفت و دەمەقاڵەی ئەو ڕۆژەیان بۆ ئاغا دەگێڕنەوە. لەبارەی مەسەلە پەیوەندارەکان بە گوند بڕیار دەدەن، هەر لەوێ لاوان بە دابونەریت و شێوازی هەڵسوکەوت ئاشنا دەکرێن. هەر ئەوێش جێگای ئاهەنگ گێڕان بوو. دەبێت ئەوەش باس بکەین کە ئاغا لەو ڕێگایەوە جڵەوی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاوایی دەگرتە دەست.[56]

مزگەوت لە هەندێك گونددا بایەخی لە دیوەخان زێترە، سەرەڕای ئەرکە ئایینییەکەی ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە. مزگەوت بۆ کۆبوونەوە نارەسمییەکانی گوند بەکاردێت. شەوانی زستان خەڵکی هەندێك ئاوایی تا درەنگانێکی شەو لەوێ دەمانەوە. هەروەها وەکو هۆتێلی گوند وابوو. میوانەکان دەچوون بۆ ئەوێ و گوندییەکانیش لە ماڵی خۆیانەوە خواردنیان بۆدەبرد.[57]

## خێڵ

خێڵ* یەکێکە لەو چەمکانەی کە بێ ئاماژە پێکردنی، باسکردن لە کۆمەڵگای کوردی بەتایبەتی پێش ڕاگواستن ناتەواو دەبێت. *ڤان برۆنەسن لەو بڕوایەدایە* ((خێڵی کوردی یەکەیەکی کۆمەڵایەتی ـ سیاسییە و بەگشتی بە مەڵبەندێکەوە بەستراوەتەوە و هەر بۆیە یەکەیەکی ئابووریشە، خێڵ پشت ئەستوورە بە ڕەچەڵەك و

---

56 هەمان سەرچاوە، ل ١١١.

57 د. شاكر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٢.

* خێڵ لەم باسەدا لە جیاتی زاراوەکانی عێل و عەشرەتیش بەکاردێت، بەڵام لە بەرامبەر هۆز بەکار نایەت، چونکە پێمانوایە هۆز لە کۆمەڵە خێڵێك پێکدێت وەك هۆزی بارزان و هۆزی جاف.

خزمایەتییەکی راستەقینە یاخود هەڵبەستراو، بونیادێکی نێوخۆیی دیاریکراوی هەیە)).[58]

*نیکیتین* پێناسەی خێڵی کوردی دەکات بەوەی: ((خێڵ یەکەیەکی سیاسییە، یان یەکەیەکی نیمچە کۆمەڵایەتی، کە یەکێك لە دابەشبوونە جیاجیاکان ئەم یەکە سیاسیە دەهێنێتەئاراوە)).[59]

لە پێناسەی *ڤان برونەسندا*، خێڵ سەرەتا یەکەیەکی کۆمەڵایەتی ـ سیاسییە، هەروەها ئابووریشە. بەڵام نیکیتین زێتر بایەخ بە رەهەندی سیاسی خێڵ دەدات و کەمتر بە رەهەندی کۆمەڵایەتی و هیچ ئاماژەیەکیش بە رەهەندی ئابووریی خێڵ نادات.

پێمانوایە پێناسەکەی *برونەسن* زێتر لەگەڵ خێڵی کوردی وێك دەکاتەوە، چونکە ناکرێ رەهەندی کۆمەڵایەتی خێڵ بە کەم بگیرێت لەکاتێکدا ئەوان لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا هاوبەشن و پەیوەندیەکی خوێنی لە نێوانیاندا هەیە یاخود بە تێپەڕینی کات لەناو تیرە و گوندە جیاوازەکانیدا دروست دەبێت، کە ئەو تێکەڵاوییە زۆر کەمتر لەگەڵ خێڵێکی دیکەدا دروست دەکەن. هەروەها شێوەزار و رەفتار و تەنانەت دەکرێ بڵێین زۆر لە خێڵەکان لەبەر داخرانیان بەسەر خۆیاندا وردە کولتوورێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەموو ئەم تایبەتمەندیانە وا لە خێڵ دەکەن کە بکرێ بە یەکەیەکی تەواو کۆمەڵایەتی لەقەڵەم بدرێت. *مەنوچێهر موحسنی* پێیوایە خێڵ زێتر یەکەیەکی کولتوورییە تا یەکەیەکی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بەپشت بەستن بە پرۆسەی

---

58 مارتین وان بروین سن، جامعه شناسی مردم کرد (اغا، شیخ و دولت)- ساختارهای اجتماعی و سیاسی کردستان، ت: ابراهیم یونسی، نشر یانیذ، تهران، ١٣٧٩ (٢٠٠٠)، ص ٦٦.

59 واسیلی نیکیتین، کرد و کردستان، ت: محمد قاضی، چاپ دوم، انتشارات نیلوفر، تهران ١٣٦٦ (١٩٨٧)، ص ٢٧٣.

دروست بوونی خێڵ لە تیرە و تایفە جیاوازەکان لەمیانەی دابەشبوونیان و جیابوونەوەیان، بە تێپەڕینی کات ئەم تیرە و تایفانە لەمیانەی ئەم پرۆسەیەدا دەبن بەخاوەنی وردە کولتوورێک و دیالێکتێکی هاوبەش و خێڵ بە کردەوە دروست دەبێت.[٦٠]

مەبەستمان لە خێڵ، هەم خێڵە جێگیرەکانە کە پیشەی سەرەکیان کشتوکاڵە هەم خێڵە کۆچەرەکان یاخود راستر بڵێین نیمچە کۆچەرەکان، کە پیشەی سەرەکیان شوانکارییە، خێڵ پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و تەماوی هەیە، چونکە خێڵە کوردەکان هێندە زۆرن و هێندەش جیاوازی جوزئی و لاوەکیان هەیە کە باسکردنیان هەم کاتێکی زۆر و هەم قسەی زۆری دەوێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند تایبەتمەندیی و خەسڵەتێکی هاوبەش لە هەر هەموویاندا هەن.

بە گوتەی *خەسباک* بونیادی خێڵی کوردی جیاوازییەکی جەوهەری لەگەڵ خێڵی عەرەبی هەیە. بڕبڕەی پشتی خێڵی عەرەبی ((پەیوەندیی رەچەڵەکە))، بەڵام ئەوەی خێڵی کوردی دروست دەکات زەوییە، دەشێ بەشەکان (تیرە و بنەماڵەکان)ی خێڵی کوردی بە هیچ پەیوەندییەکی خوێنی پێکەوە نەبەسترێن، بەڵام هەموویان لە ناوچەیەکی هاوبەش دەژین و، هەموو تاکەکانی خێڵەکە گوێڕایەڵی بنەماڵەیەک یا تیرەیەکن لە تیرەکان کە تیرەی گەورەی خێڵە.[٦١] هەروەها ناوبراو لە شوێنێکی دیکەدا پێی وایە ئەوەی بەشە جیاوازەکانی خێڵی کوردی پێکەوە دەبەستێتەوە سەرەڕای ملکەچیان بۆ سەرۆک خێڵ، بەشداریکردنیانە لە شەڕدا هەر -کاتێک کە پێویست بێت.[٦٢] ناکرێ

60 لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: مەنوچێهر موحسنی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤.

61 د. شاکر خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٨.

62 د شاكر خصباك، العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، مطبعة شفيق، بغداد ١٩٧٣، ص ١٧٥.

ئێمە لە هەموو بارێکدا لەگەڵ ئەم رایەی ناوبراو کۆك و تەبا بین. لەبەر دوو هۆ: یەکەم ئێمە رەنگە ئەمڕۆش خێڵمان لە کوردستان هەبێت، تاکەکانی لەو بڕوایەدابن یەك باپیرە گەورەیان هەیە، هەموویان نەوەی ئەون، واتە هەموویان خزمن. *نیکیتین* نموونەی خێڵی هەرکی دێنێتەوە کە چۆن هەموویان پێیان وایە یەك باپیرە گەورەیان هەیە، بەدرێژی باسی دروستبوونی خێڵی هەرکی دەکات.[٦٣] دووەم، هەندێ خێڵ لە کوردستان هەن کە رووبەرێکی زەوی دیاریکراویان نییە یاخود نەیانبووە. هەموومان دەزانین زۆربەی خێڵە کوردەکان پێش دوو سەدە *نیمچە کۆچەر* بوون.

لە بەرامبەر ئەم رایەشدا بێشکچی لەو بڕوایەدایە سستەمی خێڵەکی لە کوردستاندا پشت ئەستۆرە بە ئەسڵ و نەسەب، ئەو پێیوایە خێڵی کوردی بە ئاغاکەیانەوە هەموویان لە رێگەی پەیوەندی خوێنی و خزمایەتی پێکەوە دەبەسترێنەوە.[٦٤]

نیکیتین لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا ئاماژەی بەم ناکۆکییەی نێوان توێژەران کردووە. هەندێکیان پێیان وایە خێڵ بنەماڵەیەکی فرەوانبووە. بەشێکی دیکەش وەك یەکەیەکی سیاسی دەستکرد سەیری دەکەن.[٦٥] *ڤاسیلیەڤا* لە کتێبەکەیدا بەناوی ((کوردستانی خوارووی رۆژهەلات لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە))، تاوتوێی

---

63 واسیلی نیکیتین، کرد و کردستان. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤ـ٢٧٥.

64 اسماعیل بیشکچي، النظام في الاناضول الشرقیة: الاسس الاجتماعیة ـ الاقتصادیة و البنی القومیة، الجزء الثاني، ت، شکر مصطفی، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربیل، ٢٠٠١، ص ١٨٦.

65 ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارووی رۆژهەلات لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە: کورتەیەکی مێژوویی مێرنشینانی ئەردەلان و بابان، و: رەشاد میران، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل ١٧٥.

بیروڕای چەند تۆژەرێکی کردووە و دەگاتــە ئــەو ئەنجامــە کــە هەڵەیــە خێڵی کوردی بە خێزانێکی گەورە لە قەڵەم بدرێت.[٦٦] هەروەها نــاوبراو بە پشتبەستن بە بیروڕای تــۆژەران هــەوڵدەدات بســەلمێنێت لــە خێڵــدا تەقەلای ئەوە دراوە نەبوونی پەیوەندیی خزمایــەتی پشــتگوێ بخــرێ و دەڵێــت: ئایدیــای خزمایــەتی وەکــو دەمــامکێکی ئــایدیۆلۆژی بـــۆ سستەمی پەیوەندییە سیاسییەکانی خۆی دەنوێنـــێ. ئینجــا بــاس لــە ئەگەری زێدەبوون و پچڕانی ئەلقەکانی بونیادی خێڵ دەکات کە چــۆن مەترسیەك لەسەر لەناوچوونی دروست ناکەن.[٦٧] لە پێناســەی ((ڤــان برۆنەسن))یشدا ئاماژە بە خزمایــەتی هەڵبەســتراو کــراوە. بــە بــڕوای ڤاسیلیەڤا دەکرێ خێڵە کوردەکــان بــە پێکهاتەیــەکی کۆمەڵایــەتی - سیاسی و ئابووری - ئیداری لەقەڵەم بدەین کە لەســەر ئایدیۆلۆژیــای خزمایەتی درووستبوونە.[٦٨]

ئینتیمای تاکەکەس بۆ خێڵ لە پەنجا و شەستەکانیش زۆر بە هـــێز بووە. تاکەکەس لە پێناو ئەوەی هەیبەتی خێڵەکەی نەشــکێت ئامــادە بووە خۆی بکاتە قوربانی، هەمیشە تاکەکەس بە خێڵەکەیەوە نــازیوە و شانازی پێوە کردووە. ئەم ئینتیمایەش لەنێو خێڵە نیمچە کۆچەرەکاندا زۆر بەهێزتر بووە وەك لەنێو خێڵە نیشتەجێیەکان.

جەوهەری مومارەسەی خێڵایەتی لە توانەوەی کەسایەتی تاکەکەس لە خێڵدا بەرجەستە دەبێت. هەر بۆیە کار و کردەوەکانی تاك دەکەونــە ناو چوارچێوەی بەرپرسیاریی بەکۆمەڵی خێڵەکی. هـــەر خێڵیشــە کــە

---

66 لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٢ـ١٧٨.
67 هەمان سەرچاوە، ل ١٧٨ـ١٨١.
68 هەمان سەرچاوە، ل ١٨٢.

بـەردەوامی بـەم کـار و کردەوانـە دەدات و بـــەهێزیان دەکاتـــەوە.[٦٩]
کەسـایەتی تاکەکـەس لـە خێڵـدا شـوێنکەوتەی ئـەو گروپەیـە کـە تاکەکەس وابەستەیە پێیەوە، دەکرێ تاکەکەس لە دەرەوەی خێڵەکـەیدا بەناوی خێڵەکەیەوە ناوببرێت.[٧٠] دواجاریش دەست درێـژی کردنـە سـەر هەر ئەندامێکی خێڵ دەستدرێژیکردنە سەر خێڵەکە خۆیەتی.[٧١]

سەرۆك خێڵەکان بەزۆری ئاغـا بـوون، هـەندێك کـات یـاخود لـە هەندێك خێڵدا شێخەکان جڵەوی دەسـەڵاتیان دەگرتـە دەسـت وەك لـە بارزان و خێڵەکانی سورچی و برادۆست. هەمیشە دەسەڵاتی شـێخەکان نەرم و نیانتر بووە. ئاغایەتی یاخود گەورەیی بەزۆری لـــە باوکـەوە بـۆ کوڕ دەمێنێتەوە. لە زۆربەی شوێنەکانی کوردسـتاندا زەوییـەکان هـی ئاغاکان بوون، خەڵکانێکی کەم لە عەشرەتدا پارچە زەوییان هـەبووە؛ تەنانەت یاسای چاکسازی زەوی و زاریش لـە سـاڵی ١٩٥٨ نـەیتوانی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات. ژیگل دەڵێـت: ئاغاکـان هێنـدە هـێز و دەسەڵاتیان لەباردا هەبووە کە رووبەڕووی یاسـای چاکسـازی زەوی وزار لە ١٩٥٨ ببنەوە و سەرکەوتووانە پووچەڵی بکەنەوە.[٧٢]

خێڵی کوردی کە یەکەیەکی سیاسییە لە دوو چین پێکدێت، چینـی دەسەڵاتدار کە ژمارەیان کەمە، بەڵام شـەڕکەرن و چینـی عـەوام کـە پیشەکەیان کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵەکانە.[٧٣] چینـی فـەرمانڕەوا کە ژمارەیان کەمە، کەم تا زۆر چینەکـەی تـر دەچەوسـێنێتەوە، ئـەم چینە لەسەرووی هەمووشیانەوە ئاغا کۆمەڵە چەکدارێکی بەدەورەوەیە

---

69 د. هشام الشرابی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.
70 مەنوچێهر موحسنی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤.
71 د. حلیم برکات، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤.
72 لیژەك ژیگل، کۆمـەڵی لادێـی کوردسـتانی عـێراق بەرامبـەر بـە نـوێ بوونـەوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.
73 د. شاکر خصباك، الاکراد، دراسة جغرافیة اثنوغرافیة، سەرچاوەی پێشوو. ل ٣٤٨.

که له بادینان پێیان دەگوترێت ((ڕەشەکێت ئاغای)). ئەم ڕەشەکانە له پەنای ئاغاوە کاری دزێو ئەنجام دەدەن و دەسەلاتیان بەسەر خێڵ یاخود ئاواییدا دەشکێ. ئاغاکان دەسەلاتێکی تارادەیەك ڕەهایان بەسەر ڕەعیەتەکانیاندا هەبووە. کەس خۆزگە بە حاڵی کەسێك ناخوازێت کە ئاغا خۆشی نەوێت. ستەم و زۆری ئاغا بەسەر هەژاراندا بەناوبانگە. ئەم بارە تا درەنگانێك هەر بەردەوام بوو، تەنانەت نەحکوومەت و نەحزبی کوردیش نەیتوانی دەسەلاتی ئەو ئاغایە بەسەر خێڵەکەیدا سنووردار بکات کە پەیوەندیی لەگەڵیان خۆش بوو.

له بەرانبەر خێڵەکان لە کۆمەڵگای کوردیدا کۆمەڵێکی تر هەبوون کە نیشتەجێی لادێکان بوون، بەلام سەر بە هیچ خێڵێك نەبوون ، ژمارەی ئەمان ساڵ بە ساڵ لە زیاد بووندا بوو. زۆربەی ئەمانە پێشتر شوان بوون لە ئەنجامی ناکۆکییەکی ناوخۆیی لە گوند یان لە خێڵدا، لە خێڵەکەیان دابڕاون و لە گوندەکان نیشتەجێ بوون.[٧٤] ئەمانە بە گۆران یاخود کرمانج ناودەبرێن. ئەمانە لە گوندی خاوەن موڵکەکاندا سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون.

لەم باسەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە، کۆمەڵگای لادێنشینی کوردی و یەکە پێکهێنەرەکانی خێڵ و شێوازی ژیان لە لادێکاندا، ڕیتمێکی یەکدەستی نەبووە و جیاوازی هەیە لە ناوچەیەکەوە بۆ یەکێکی تر و لە شێوە ژیانی خێڵێکەوە بۆ ئەوی تر. بۆیە ناکرێت تێبینیکردنە سۆسیۆلۆژیەکان وەکو یەك بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی لادێی کوردیدا بگشتێنرێن و یاساگەلێك دابڕێژن تا لە ڕێگەیانەوە بڵێین: ئەمەیە واقیعی ژیانی گوند و... هتد لە کوردستاندا، وەك چۆن هەندێك لەوانەی ئاماژەمان پێکردن ئەو کارەیان کردووە.

---

74 د. شاکر خصباك، الكرد و المسالة الكردية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٠.

## باسی دووەم: شاری کوردی پێش ڕاگواستن

### شاری کوردی

گەر چاوێك بەو کتێبانەدا بخشێنین کە لە شار دوواون، ڕووبەڕووی پێناسەگەلێکی زۆر دێین کە دەستنیشانکردنی شار هەندێك قورس دەبێت. مێژوونووسانی کۆن، هەر کاتێك باسی شاریان کردبێت، زێتر جەختیان لەسەر شاری خۆرئاوایی کردووە و شاری شارستانییەتەکانی دیکەیان پشتگوێ خستوون. بەڵام مێژوونووسانی سەردەمی نوێ پێیانوایە کە شار دیاردەیەك نییە تایبەت بێت بە شارستانییەتی خۆرئاوا. هەموو شارستانییەتێك خاوەن شاری خۆیەتی.[٧٥]

*ماکس ڤیبەر* لە یەکەمین لاپەڕەی کتێبەکەیدا بەناوی ((شار لە درێژایی زەمەندا)) دەڵێت: ((پێناسەیەکی زۆر بۆ شار کراون ، کە لایەنێکی هاوبەش لە هەموویاندا هەیە: بەو مانایە کە شار بە دەربڕینێکی سادە، لە یەکێك یان چەند ساختومانێکی جیا لەیەکتر کە خەڵکیان تێدا نیشتەجێیە پێکدێت، بەڵام بە شێوەیەکی ڕێژەیی داخراوە.))[٧٦]

هەروەها کۆمەڵناسی ئەمریکی ((*وێرس*)) لەو بڕوایەدایە کە شارنشینی بە زیادبوونی ئەو مەیلە دەگوترێت کە سەبارەت بە شێوازی تایبەتی ژیانی شاری دەردەکەوێت، ناکرێت شارنشینی لەگەڵ پیشەسازیبوون و سەرمایەداری مۆدێرن یەکسان بکرێ.[٧٧] بەپێی ئەو

---

75 ڕێبوار سیوەیلی، پانتاییەکانی دەسەڵات: باسێکی تیۆری لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان ( حکومەت، خێڵ، شار و خێزان) لە کۆمەڵگای کوردیدا، سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢٧، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٣، ل ٢٣.

76 ماکس وبر، شهر در گذر زمان، ت: شیوا (منصوره) کاویانی، چاپ دوم، چاپخانەی حیدری، تهران ١٣٧٣ (١٩٩٤)، ص ٦٣.

77 سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥.

دوو پێناسەیەی سەرەوە دەکرێ بڵێین مێژووی شار و شارنشینی لە کوردستاندا مێژوویەکی درێژە، بەڵام باسەکەمان وادەخوازێ خۆمان لەلایەنی مێژوویی شارەکان بەدوور بگرین و قورسایی بخەینە سەر رەوشی شار لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی رابردوودا. ((تۆما بوا)) لەکتێبەکەیدا ((مێژووی کوردەکان)) کە نزیکەی نیو سەدەیە نووسیویەتی ناوی ئەم شارانەی کوردستانی خواروو دەبات: سلێمانی، کەرکوک، دهۆك، ئامێدی، ئاکرێ، رەواندۆز ، زاخۆ،[78] هەولێر ئەم شارانەی پێشتر ناویان هات زۆربەی رۆژهەڵاتناسەکانیش کاتێك باسیان لە شارە کوردیەکان کردووە ناوی ئەم شارانەیان بردووە.[79]

لە باشووری کوردستاندا، بەو ئاوەدانیانە دەگوترێت شار کە سەنتەری یەکەی ئیدارین واتە پارێزگا، قەزا و ناحیە. بەبێ ئەوەی سەرەنج بدرێتە ژمارەی دانیشتووان و جۆری چالاکی ئابووری و دانیشتووانەکەی،[80] بەڵام ئێمە خۆمان دوور دەگرین لەوەی چ ئاوەدانییەك بە شار دادەنرێت و پێودانگەکانی چین لە جیاتی ئەوە هەوڵدەدەین خەسڵەتە گشتییەکانی شاری کوردی پێش راگواستن دیار بکەین.

یەکەمین خەسڵەتی شاری کوردی لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی رابردوو، بچووکی شارەکان بوو. ئەگەر شارەکانی موسڵ، کەرکوك، هەولێر و سلێمانییان لێ جیابکەینەوە، ئەوا زۆرینەی رەهای شارەکان

---

78 توما بوا، تاريخ الاكراد، ت: محمد تيسير ميرخان، دار الفكر المعاصر، بيروت، ٢٠٠١، ص ١٥.

79 د. بدرخان السندى، المجتمع الكوردى من المنظور الاستشراقي، دار ئاراس للطباعة و النشر، اربيل، ٢٠٠٢، ص ٤٨٠- ٤٩٤.

80 د. عەبدوڵلا غەفوور، جوگرافیای کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٢٣٠.

ژمارەی دانیشتووانیان لە شەش هەزار کەمتر بوون. لە پارێزگای دهۆك تەنیا شارێك ژمارەی دانیشتووانی لەنێوان (١٠-٢٠) هەزار کەسدا بووە و شارێکیان لەنێوان (٥-١٠) هەزار، و(١٤) شارۆچکەش ژمارەی دانیشتووانیان لە شەش هەزار کەس کەمتر بوو. لە پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێریش هەریەکەیان ژمارەی دانیشتووانی شارێکیان لە نێوان (٦٠-٩٠) هەزار کەسدا بوو، ژمارەی دانیشتووانی شارێکی هەریەکێکیشیان لەنێوان (١٠-٢٠) هەزار کەسدا بوو، (١٨) شارۆچکە لە پارێزگای سلێمانی و (١٦) شارۆچکەش لە پارێزگای هەولێر ژمارەی دانیشتووانیان لە شەش هەزار کەس کەمتر بوون.[٨١] ئەوەش وای لە *خەسباك* کردووە بڵێت زۆربەی شارەکانی عێراقی باکوور گوندی گەورەن، تەنیا چوار شاری گەورە هەیە مووسڵ، کەرکوك، سلێمانی، هەولێر،[٨٢] تەنانەت ناوبراو شاری دهۆکیش لە ڕیزی گوندە گەورەکان لەقەڵەم دەدەت.

*گیراڵد بریز* پێی وایە جیهانی کۆن زۆر کۆبوونەوەی دانیشتووانی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە، تەنانەت هەندێکیان بە پلەیەکی بەرز لە پێشکەوتن گەیشتوون، بەڵام ئەوانەی دوایی - لەڕووی خانووبەرەوە - زێتر لە گوندی قەرەباڵغ دەچوون تاکو یەکەی شارستانی بە مانای باوی ئەمڕۆ.[٨٣] ئەم وەسفەی سەرەوە، نەك چڕی دانیشتووان، بەڵکو لەڕووی خانووبەرەوە دەکرێ بە خەسڵەتی دووەمی شارە کوردییەکان دابنێین. شاری کوردی بەهەموو خانووبەرەیەوە (خانوو، مزگەوت ، بازاڕ...)

---

81 د. شاکرخصباك، العراق الشمالية، دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٤.

82 هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٦.

83 جيرالد بريز، مجتمع المدينة في البلاد النامية، ت: د. محمد الجوهري، دار المعرفة الجامعية، اسكندرية، ١٩٨٩، ص ٣١.

هەروەها شەقام و کولإنەکانییەوە لەڕووی ئەندازیاری دواکەوتوو بـــووە. بـرۆدڵ لـه وەسـفی شـارەکانی دونیـای ئیسـلامی دا دەڵێـت خـانووە نزمەکانیان وەك دەنکی هەنار پێکەوە دەنوسێن...لەبەر ئەوەی نـاکرێ ساختومانەکانیان بەرز بکـەن، جـادە و ڕێگـا گشـتییەکان هەمیشـه ڕووبەڕووی تەجاوەز دەبوونەوە.[٨٤]

هەر ((برۆدڵ))یش پێمـان دەڵێـت: ئـەو خەسـڵەتەی لـه هـەموو شـارەکاندا گشـتییه و بـه هۆکـاری بنچینـەیی جیاوازیـان لەقەڵـەم دەدرێـت، ئـەو ڕاسـتییەیه کـه شـارەکان بەرهـەمی شارسـتانییەتی خۆیانن.[٨٥] شارەکانی کوردستانیش لەم ڕێسایه بەدەر نـین. لـه کتێبـی ((شـاری دهـۆك، لێکۆڵینەوەیـەك لـــه جوگرافیـــای شـــارەکاندا)) دەخوێنینـەوە: کە شاری دهۆك لـــەڕووی نەخشەکێشـان و پلاندانانـەوە هیچ جیاوازییەکی نەبووە لەگەڵ شارەکانی دونیای ئیسـلامی لـەڕووی کۆڵانـــه تەســـك و بەناویـــەکداچووەکان و هـــەندێ جـــار داخـــراو لەلایەکەوە.[٨٦]

خەسڵەتی سێیەمی شارەکانی کوردستانی خـــوارو، کـه *خەسـباك* ئاماژەی پێکردووە، ئەوەیە کە هەموویان شاری بازاڕین[٨٧]. هەربۆیـــەش پیشه ســـەرەکییەکانی دانیشـتووانی شـار بەشـێوەیەك لـه شـێوەکان پەیوەندیان بەو خزمەتگوزاریانەوە هەیـه کـه پێشـکەش بـه خـەڵکی گوندنشین و کۆچەرەکان دەکـەن. بـازاڕ گرنگـترین تـەوەر و شـاڕێگەی

---

84 فرنان برودل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢٢ـ٥٢٣.

85 هەمان سەرچاوە، ل ٥٢٢.

86 هاشم خضر الجنابي، مدينة دهوك، دراسة في جغرافية المدن، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص ٢٩.

87 د. شاكر خصباك، العراق الشمالي: دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٤.

پێکەوە بەستنی شارەکان بوویـن.[88] ئـەوا لـە کوردسـتاندا شـارێگەی پێکەوەبەسـتنی شـار و گوندەکـانیش بـوون، چونکـە دانیشـتووانی گوندەکان هەمیشە پێویستیان بەوە بووە سـەردانی شـار بکـەن و لـە بازاڕی ئەو شارەدا هەم کەرەسـتەکانی خۆیـان بفرۆشـن و هـەم شـتی تر بکڕن.

چوارەم خەسڵەتی شاری کوردی دەتوانـین لـەمیانی ئـەم گوتانـەی *ماکس ڤیبەر*دا دەستنیشان بکەین کاتێك دەڵێـت: ((کـاتێك سـەرنج بدەینە چاخەکانی دوور یاخود زوو یان سەردەمەکانی کۆن، تێدەگـەین کـە هەمیشـە هێکتارگـەلێکی فرەوانـی زەوی لەبـەر دەسـتی شارنشینەکان بوون، شارنشینی تەواوی سەردەمەکانی کۆن لە راستیدا نیوە جووتیار بـوو)).[89] ئـەم وەسـفەی *ڤیبـەر* ئەگـەر بـۆ شـارەکانی ئەورووپای بەر لە شۆڕشی پیشەسازی راست بێت ئەوا بەسەر شـارەکانی کوردستانی خواروو لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی رابـردوو دەسـەپێت هەروەها بوونی زەوی کشتوکاڵی و ئاو، هۆیـەکی دروسـتبوونی شـاری کوردی بوو. بۆ نموونە بەپێی ئاماریساڵی ١٩٥٧، لە شـاری هـەولێر ژمـارەی ئەوانـەی لـە بوارەکـانی کشـتوکاڵ و بەرهـەمی ئـاژەڵی و بایەخدان بە دارستان و ڕاو بە هەموو جۆرەکانییـەوە کاریـان دەکـرد دەگەیشتە ١٣٣٤ کەس کە ئەمەش ژمارەیەکی زۆرە بەبەراورد لەگـەڵ ژمارەی دانیشتووانی ئەو کاتەی شاری هەولێر.[90] هەڵبەت شـارەکانی تری کوردستانی خوارووش هەمان ئەم ڕەوشەیان هەبوو.

---

88 مینا جباری، همیشه بازار، مؤسسة انتشارات اگاه، تهران ١٣٧٩، ص ١٤٩.

89 ماکس وبر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

90 اسماعیل شکر، اربیل دراسة تاریخیة فی دورها الفکری والسیاسی (١٩٣٩-١٩٥٨)، رسالة دکتوراه مقدمة الی قسم التاریخ فی جامعة صلاح الدین، اربیل ١٩٩٩، ص ٥٨.

دواجاریش دەتوانین گوتەی *برۆدل* بێنینەوە کاتێك دەڵێت مەسەلەی سەرەکی ژیانی خەڵکی شارەکان چ لە ئەوروپا و چ لە ناوچەکانی دیکە لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ یەکسان ماوەتەوە، ئەویش دابەشکردنی کارە لەنێوان ناوەندە شاری و ناوچە لادێییەکاندا. دابەشکردنی کارێك کە هەرگیز بەتەواوی پێناسە نەکرا، لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی بەردەوامی پێویستە. ئەو پێی وایە کە هەرگیز شار و لادێ لێکجیا ناکرێنەوە وەك ئاو لە رۆن، چونکە رشتەی پەیوەندی ئەم دووانە ناپسێت. ئەوان هاوکات لە یەك جیادەبنەوە و لە هەمان کاتدا لەیەکتر نزیك دەبنەوە.[٩١]

## خانووی شار

پێشتر باسی خانووی گوندمان کرد، هەوڵدەدەین کەمێك باسی خانووی شاری کوردیش بکەین، وەك گوتمان لە شاری کوردیدا کۆڵانەکان تەسك و نارێك بوون. ئێستاش دەتوانین نموونەی ئەو جادە و کۆڵانانە لە گەڕەکە کۆنەکانی وەك قەلا، گەڕەکی عەرەبی کۆن و تەعجیل و خانەقا لە شاری هەولێر ببینین کە ئاراستەیەکی رێك و راستیان نییە و لەڕووی بەرینیشەوە رێك نین و هەندێ جار لە سەرەکەی ترەوە داخراون.[٩٢] ئێستاش گەڕەکێکی گەورە لە شاری ئاکرێ هەیە کە بەهیچ شێوەیەك ئۆتۆمبێل ناتوانێت بچێتە ناو کولانەکانییەوە. لە باسی شاری هەولێردا هاتووە کوچە و کولانەکانی قەلا گەلێك تەسك و تاریك بوون، شەوانە مرۆڤ سامی لێدەکرد.[٩٣]

---

91 فرنان برودل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩٨.

92 د. هاشم خضر الجنابی، مدینة اربیل، دراسة فی جغرافیة الحضر، مدیریة دار الکتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٧، ص ٦.

93 مەولود قادر بێخاڵی، هەولێرم وا دیوە و بیستووە، بەرگی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧ ، ل ٣٢٩ .

*سەجادی* لە وەسفی خانووی شاردا دەڵێت: زۆرتر خانووی شارەکانی کوردەواری خشتی کاڵە، بناغە بەبەرد دادەنێن، دیوار تا پێنج گەز بەرز دەکرێتەوە، دواتر دارەڕا دەکرێت. لە ناو ژوورەکاندا تاق و ڕەف هەیە، ئینجا بە خۆڵی سوور و کا سواخی ناو ژوورەکان ئەدرێت، دواتر گەچکاری، ئینجا پەنجەرەی تێدەخرێ. پەنجەرەکان هەمووی دوو دەرین، خوارەکەی تەختە و لای سەرەوەی شووشەی ڕەنگاوڕەنگ، ئەم ژوورانە چەند دوو دەری تێدابێ بەوە ناودەبرێ. زۆرتر تاکە. ئەو کەسەی دەست رویشتووبێ رووبەری خانووەکەی بەخشتی سوور دەکا. ژوورەکان دوای گەچکاری کردن و ڕێکخستن زۆر جار بۆیە دەکەن، حەوشەی ماڵیش بەقەد خانووەکە بەرزە، کەس ناو حەوش نابینێ. ناوحەوش بەخشتی سوور یا بەتەختەی بەرد فەرش دەکرێ.[٩٤]

*خەسباك* لە وەسفی خانووی سلێمانیدا دەڵێت: زۆربەی خانووەکان یەك قاتن و بانی زۆربەیان لە یەك ئاستدایە. دیوارەکان لە بەرد و قوڕ دروست دەکرێن بانەکانیش لە داری بەڕوو .[٩٥] خانووەکانی شار لە سەر شێوازی ڕۆژهەڵاتی دروست دەکران، هەر خانوویەك حەوشەیەکی هەبوو کە بەژوورەکانی دەورە دەدرا. بەپێی ئاووهەوا نەخشەی خانوو دادەنرا، بەشێوەیەك کە لە زستاندا تیشکی ڕۆژ بێتە ژوورەوە و لەهاویندا بەری بگیرێت، بەزۆری ژوورەکان بانیان بەرز و کەم پەنجەرە بوون، هەروەها ژێرزەمین بەشێکی گرنگی خانووی هەولێریەکانی پێکدێنا .[٩٦]

---

94 عەلائەدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠ـ٨٦.

95 د. خصباك، الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٧.

96 هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل، دراسة في جغرافية الحضر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٢ـ٦٤.

((*هانسن*))یش ئامـاژە بەکـەمی پەنجـەرەکان دەکـات و دەڵێـت دیواری پشتەوە و لاتەنیشتەکانی خانووی شـار پەنچـەرەیان نییـە.[97] هەر لە بارەی خانووی شارەوە دەڵێـت: کـەرپووچ روو لـە زیادییـە لـە شاردا، خانووەکانی تر خشتن، خانووەکان لێك نزیکن و زۆربـەیان یـەك نهۆم، وەکـو خـانووی لادێ بانیـان قـورە، بـەڵام بێـسواندن، چونکـە کـەرپووچن.[98] لـە وەسـفی خـانووی شـاری دهۆکیشـدا هـاتووە کـە خانووەکـان لەسـەر شـێوازی رۆژهـەڵاتین، حەوشـــەیان هەیـە کـە ژوورگەلێکی لە دەورەن، ئەو ژوورانـەی بـە سـەر کۆڵانیشـدا دەڕوانـن پەنجەرەیان نییە.[99]

## رەوشی خوێندەواری و تەندروستی لە شاری کوردیدا

رەوشی خوێندەواری و تەندروسـتی لـە شـاری کوردیـدا زۆر باشـتر نەبوو لە گوند، رێژەی مردن بە گشتی و منداڵان بە تایبەتی بەرز بوو. هۆکـاری سـەرەکی مردنیـــش نەخوشـــیەکانن.[100] خراپــی رەوشــی تەندروستی هۆیەکەی تەنیا کەمی نەخۆشخانە و داوودەرمـان نـەبوو، بەڵکو چەند هۆیەکی تر لەپاڵ ئەمانەدا بوون لەوانەش: بەدخۆراکی و کەم خۆراکی. نەبوونی جلوبەرگی پێویست، نەبوونی ئاوی خـاوێن لـە شارەکان و پەرپووتی و بچووکی خانووەکان.[101] کۆمەڵناسی فەرەنسی *شومبار دۆلۆ* پێی وایە هەر تاکەکەسێك پێویستی بە (١٦)م٢ فـەزای

---

97 هێنی هارۆڵد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠ ـ٩٢.
98 سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.
99 هاشم خضر الجنابي، مدينة دهوك، دراسة فـی جغرافيـة المـدن، سـەرچاوەی پێشـوو، ل٣٠ .
100 د. شاكر خصباك، العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٤.
101 بگەڕێوە بۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٤-٢٦٥.

ئاوەدان هەیە و لە بارێکدا کە ئەم فەزایە کەمتر بێت، تاکەکەس ڕووبەڕووی کێشەگەلێك دەبێتەوە.[102] بەدەگمەن ئەگەر تاکێك لە شاری کوردی دا ئەوەندەی بەرکەوتبێت.

سەبارەت بەژمارەی نەخۆشخانە و خاوەن پیشە تەندروستیەکانیش ڕەوشەکە هەر زۆر خراپ بووە: تاکو دەیەی پەنجاکان تەنیا یەك نەخۆشخانە و یەك بنکەی تەندروستی لە شاری هەولێر هەبووە.[103] لە ناوەڕاستی پەنجاکان هەر یەکێك لە لیواکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوك (٥) نەخۆشخانەیان هەبووە، لیوای سلێمانی (١٠) پزیشك و لیوای هەلێریش(١٢).[104] ئەم بارە لە کۆتایی شەستەکاندا بەم شێوەیە بوو: پارێزگای کەرکوك و هەولێر هەریەکەیان (٨) نەخۆشخانە و سلێمانی هەروەکو خۆی (٥) نەخۆشخانە، ژمارەی خاوەن پیشە تەندروستییەکان لە پارێزگای کەرکوك (١٠٠) کەس، هەولێر و سلێمانیش هەریەکێکیان (٥١) کەس.[105]

سەبارەت بەفێرکردن و خوێندن بەهەمان شێوە ڕەوشێکی پەشێو لەئارادا بوو، ژمارەی نەخوێندەواران ئێجگار زۆر بوو، قوتابخانە ئاینییەکان لە شار شانبەشانی ئەو ژمارە کەمەی قوتابخانە حکومیەکان بەردەوامیان بەچالاکی خۆیان دەدا، لە شار، بەپێچەوانەی لادێ، کچانیش دەچوونە قوتابخانە. تەنانەت لە پەنجاکان بۆ نموونە لە سلێمانی و هەولێر قوتابخانەی دواناوەندی تایبەت بەکچان هەبوو.[106]

---

102 منوچهر محسنی، جامعەشناسی پزیشکی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

103 مەولود قادر بێخاڵی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠١.

104 د. شاکر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١ .

105 د. شاکر خصباك، العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٥ـ٢٦٦.

106د. شاکر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٥٧ لە شاری هەولێر ژمارەی ئەوانەی دەیان توانی بخوێننەوە و بنووسن (٦٦٠٥) کەس بووە، دەرچووانی سەرەتایی (٥٨٦) کەس، دەرچووانی زانکۆ (١٢٩) کەس، خوێندنی باڵا (٢١) کەس.[107] کە ئەمانەش بەبەراوورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتووانی شار ڕێژەیەکی زۆر کەم بوون.

کۆی ژمارەی قوتابخانەکان لە لیواکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوك بەم شێوەیە بوو: سەبارەت بە لیوای سلێمانی (٥٧) قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان، (٩) کچان، (٣) دواناوەندی کوڕان و یەکێکی کچان. لە لیوای هەولێر (٥٩) قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان، (٨) کچان، (٣) دواناوەندی کوڕان و یەکێکی کچان، لە لیوای کەرکوکیش (٧١) قوتابخانەی سەرەتای کوڕان، (١٣) کچان، (٦) دواناوەندی کوڕان و دووی کچان.[108]

### دامەزراوەکانی تری شار

هەموو ئاوەدانییەك، چ شار چ گوند، دامەزراوەگەلێکی هەیە. لە لادێ ئاماژەمان بە مزگەوت و دیوەخان کرد، بە پێویستی دەزانین لە باسی شاریشدا بەکورتی بپەرژێینە سەر هەندێك لە دامەزراوە نارەسیمیەکان لەوانەش: بازاڕ، مزگەوت،چایخانە، مەیدان...

ئێمە لە وەسفی شاری کوردیدا گوتمان شارەکانی کوردستانی خواروو تێکڕا شاری بازاڕین، هەر بۆیەش دەتوانین بڵێین بازاڕ گرنگترین دامەزراوەی شاری کوردییە. بازاڕ جگە لە ڕەهەندە بازرگانی و ئابوورییەکەی کە ڕەهەندی زاڵە، ڕەهەندی کولتووری -

---

107 اسماعیل شکر، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

108 د. شاکر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

کۆمەڵایەتیشی هەیە. بازاڕ رۆڵێکی وەزیفی تایبەتی هەیە و شوێنی کۆبوونەوەی زۆر لە کار و پیشەکانە، کە زۆربەی ئەو کار و پیشانە پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە و خەڵکانێکی زۆر لەوێ کۆدەبنەوە کە جگە لە پەیوەندیی کار پەیوەندیی خێزانی و خزمایەتیشیان پێکەوە هەیە.[109] بازاڕ لە شارەکانی کوردستاندا شوێنی بەیەکگەیشتنی کولتووری شار و لادێ بوو، بەوەی کە شارنشین و لادێنیشینەکان بەزۆری لە بازاڕدا دەیانتوانی یەکتر ببینن و لادێنشینەکان تەنیا بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان و فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکانیان کە لە بازاڕی شارەکاندا شێوەی وەردەگرت دەیانتوانی خۆیان لە کارە ئێجگار زۆرەکانی لادێ بدزنەوە و لەگەڵ خەڵکی شارنشین تێکەڵاو بن، سەرەڕای ئەمە بازاڕ سەرەکیترین دامەزراوە و شوێنی یەکتر ناسین و مامەڵەکردنی شارنشینەکان خۆیانیش بووە. هەروەها لەبەر ئەوەی لە شارە ئیسلامییەکاندا مەیدانی گشتی بوونیان نییە (یاخود زۆر کەمن بۆ نموونە لە شارە کوردییەکان دەتوانین ئاماژە بە بەردەرکی سەرا بکەین لە سلێمانی) ئەوا یان مزگەوت یاخود بازاڕ تاکە شوێنێك بوو کە هەواڵی تازە یاخود زانیارییان لەبارەی ژیانی رۆژانەیانەوە پێگەیشتوون.[110]

مزگەوت لە شاری کوردیدا دەکرێ لە دوای بازاڕەوە بێت لەڕووی گرنگییەوە. هەرچەند لە کوردستان دوای ئەوەی چەند ماڵێك لە شوێنێك کۆدەبنەوە سەرەتا بیر لە دروست کردنی مزگەوت دەکەنەوە، بەڵام ناکرێ رۆڵی لە بازاڕ گەورەتر بێت لە شاردا، چونکە بازاڕ هەم

109 مینا جباری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

110 هاشم خضر الجنابی، مدينة اربيل، دراسة في جغرافية الحضر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٠ـ١٨١.

خەڵکی زێتر لەخۆ دەگرێت و هەم خەڵکێکی زۆرتری لێ دەمێننەوەو سەرەنجام مزگەوت زێتر شوێنی خواپەرستییە و بازاڕ شوێنی کاروباری دونیاییە. بەڵام ئەمە هەموو ئەوە ناگەیەنێت کە مزگەوت دامەزراوەیەکی بەرچاو و دیار نەبێت لەشاری کوردیدا. مزگەوت لەگەڕەکدا وەزیفەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر بەرچاو جێبەجێ دەکات، لە مزگەوتدا خەڵکی گەڕەك کۆ دەبنەوە و لەبارەی کاروبارە هاوبەشەکانیان گفتوگو دەکەن، هەروەها زۆرجار خەڵکی گەڕەك پەنا دەبەنە بەر مەلاو ڕیشسپییەکان لە مزگەوتدا بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکییە کۆمەڵایەتیەکانیان، بەبێ گەڕانەوە بۆ دامەزراوە ڕەسمییەکان.[111]

سەرەڕای ئەوەش مزگەوت لە شاری ئیسلامیدا تەنیا شوێنی پەرستن نییە، بەڵکو تاکە شوێنێکە تاکەکەس تیایدا هەست بەئارامی راستەقینە دەکات، هەروەها ئەو شوێنەیە کە دەتوانێت بە کەیفی خۆی دانیشێت دوور لە قەرەباڵغی زۆر،[112] بەبێ ئەوەی کەس بێزاری بکات. پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین کە لە شارە کوردییەکاندا هەمیشە ژمارەیەکی زۆر تەکیەو خانەقاو خوێندنگەی ئایینی هەبووە.

دامەزراوەیەکی تر کە زۆر بەرچاوە چایخانەیە. *عەلی ئەلوەردی* پێیوایە شار و شارۆچکەکانی عێراق ژمارەیەکی ئێجگار زۆر چایخانەیان لێیە،[113] ئەگەرچی ناوبراو هەمیشە باس لە کۆمەڵگای

---

111 مجموعة من المؤلفين، دراسات في المجتمع العربي المعاصر، تحرير خضر زكريا، الاهالي للطباعة والنشر و التوزيع، دمشق، ١٩٩٩، ص ٢١.

112 جيرالد بريز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠.

113 د. علي الوردي، شخصية الفرد العراقي: بحث في نفسية الشعب العراقي على ضوء علم الاجتماع، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥١، ص٥٠.

عەرەبی دەکات. نەك کۆمەڵگای کوردی بەڵام شـارەکانی کوردستانی خواروش لەم بارەیەوە ڕەوشێکی هاوشێوەی شارە عەرەبییەکانیان هەیە، ئەگەر ژمارەی چایخانەکانیشیان زۆر لە شارە عەرەبنشینەکان کەمتر بێت، ئەوە مانای ئەوە نییە کە ژمارەیان کەمە. *خەسباك* لە وەسفی شارەکانی لیوای سلێمانیدا دەڵێت: ژیانی کۆمەڵایەتی لە دەوری چایخانەکاندا کۆدەبێتەوە.[114] چایخانە هەم شوێنی بەسەربردنی کاتەکانی دەست بەتاڵی و هەم شوێنی یەکتر بینینی هاوڕێ و هاوبیرەکان بووە. لە چایخانەدا تاکەکەس بۆی دەلوا هەموو جۆرە قسەیەك و هەموو سەرگوزشتە و هەواڵێك بگێڕێتەوە یاخود ببیسێت.

هەروەها دامەزراوەیەکی تر کە کەمتر گرنگە و تەنیا لە شارە گەورەکان هەبوو سینەمایە، لە پەنجاکان لە سلێمانی سینەما هەبوو، تەنانەت خاتوو *هانسن* بۆمان دەگێڕێتەوە کە ژنان بەپەچەوە لەتەك پیاواندا لە سینەما دادەنیشتن،[115] ئەو شتەی کە ئەمڕۆ وێڕای نەمانی پەچە بەدەگمەن نەبێت لە سینەماکاندا هەستی پێناکرێت. لە شاری هەولێریش هەر لە ناوەڕاستی چلەکانەوە دوو سینەما، یەکێك هاوینی و ئەوی تریان زستانی کە سینەما حەمرا بوو، هەبوون.[116]

سەرەڕای دامەزراوە ناڕەسمیەکان لە شارەکاندا چەندین دامەزراوەی ڕەسمی هەبوون کە لە گونددا بوونیان نەبووە، وەك پارێزگا، قایمقامیەت، نەخۆشخانە، بەندیخانە، بنکەی پۆلیس و...هتد کە ئەمانە هەریەکە بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیان بە دانیشتووانەوە هەبوو، هەموویان لەلایەن حکومەتەوە سەرپەرشتی دەکران و لە

---

114 د. شاكر خصباك، الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣١.

115 هێنی هارۆڵد هەنسن، کچانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥.

116 تەحسین چیچو و شێرزاد قادر، هەولێر لە یادی دامەزراندنی شارەوانیی هەولێردا (١٨٨٥-١٩٨٥)، چاپخانەی عەلا، هەولێر، ١٩٨٥، ل١٦٨.

بنەڕەتدا بۆ خزمەتی هاوولاتیان و ڕێکخستنی کاروباری ڕۆژانەی ئەوان بونیات نرابوون.

### ئافرەت لە شار و لادێی کوردەواریدا

بەئەنقەست لە باسی گوندی کوردیدا لە بارەی ئافرەتەوە نەدواین، ویستمان لێرەدا باسی هەردوو ئافرەتی شارنشین و لادێنشین پێکەوە بکەین. بەگشتی گەڕۆك و ڕۆژهەلاتناسان ئەوانەی لە دوو سەدەی رابردوودا سەردانی کوردستانیان کردووە و لەگەڵ کوردا ژیاون، ستایشی ئافرەتی کوردیان کردووە و پێیان وابووە کە کوردەکان هەم ڕێز لە ئافرەت دەگرن، هەمیش ئافرەت لەناو کوردانـدا ئازادییەکی زێتری هەیە.[117] هەڵبەت ئەوان بەزۆری ئافرەتی کوردیان لەگەڵ دراوسێکانیان بەراورد کردوون. ئەمڕۆ بۆچوون و بیروڕای ئەم گەڕۆك و ڕۆژهەلاتناسانە لەلایەن فیمینیستە کوردەکانەوە رووبەڕووی رەخنە بوونەتەوە.[118]

ئێمە لەو بڕوایەداین لە زۆر رووەوە ئەم گەڕۆك و ڕۆژهەلاتناسانە لەسەر هەق بوون، چونکە باسکردن لە ئازادی و ڕێزگرتن بەپێی سەردەم و کۆمەڵگا دەگۆڕێت. بەراوردکردنی ئازادی رەوشی ئافرەت لە ولاتانی ڕۆژئاوای ئەمڕۆ لەگەڵ ئافرەتی کورد لە دەیەکانی پەنجا و شەستی سەدەی رابردوو شتێکی بێ مانایە.

هەموو ئەوانەی لە رەوشی ئافرەتی کوردیان کۆڵیوەتەوە لە کوردستان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئافرەت لە گوندا زێتر ئازاد بووە وەك

---

117 د. بدرخان السندي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٦ـ١٢٩

118 یەکێك لەو رەخنەگرانە ((نەزەند بەگیخانی)) یە، بڕوانە: نەزەند بەگیخانی، ئیماژی ژنی کورد لە ناو ئەورووپای سەدەی نوزدەمدا، گۆڤاری رامان، ژمارە ٢٤، هەولێر، حوزەیرانی ١٩٩٨، ل ٤ـ١٣

له شار. پەچە کە دیاردەیەکی تەواو شارییە لە کوردستان (هەولێر، سلێمانی، کۆیە، تا ئێستاش لە شاری ئاکرێ پاشماوەی ماوە) لە دێدا بەهیچ شێوەیەك نەبووە. ئافرەت کە لە گوندەوە چووە بۆ شار ناچار بووە پەچە دانێت،[119] کە ئافرەتی شار چووەتە لادێ پەچەی لابردووە.[120] لە شاری سلێمانی شەرم بووە ژنێك بەبێ پەچە بچێتە ماڵێکی تر،[121] *هانسن* لەم بارەیەوە دەڵێت ئافرەتی شارستانی کورد یەکەم جار و دواجاری لەژیانی دا کە بەرگی سپی بووکێنی پۆشی دەتوانێت رووی خۆی لەژێر پەچەیەك پیشان بدات کە سفت نییە و شەفافە و چاوی غەریب دەتوانی فەرقی پێ بکات.[122] هەموو ئەمانە لەلادێ نەبوون، ئافرەت بۆ هەموو شوێنێك لە ماڵی دراوسێ وە بگرە تا سەر کانی و تا ناو کێڵگە بێ پەچە و بە تەنیا دەچوو، هەروەها بەشداری هەموو ئیشێکی دەکرد لەگەڵ پیاوان. لەگەڵ ئەو راستیەدا کە ژنی لادێ لەژیانی دەردەداریی خۆیدا لەگەڵ خوشکەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین هاوبەشبوو، سەرەڕای کارە زۆر و قورسەکانی ماڵداری و هێنانی ئاو لە کانی دوورەوە بەشێکی زۆری کارە کشتوکاڵیەکانیش لە ئەستۆی ئەو بوون.[123] هەروەها ناکرێ ئەوە باس نەکەین کە ئافرەت لە جیاتی خوێن دەدرا، ژن بە ژنی و گەورە بەکچکەی پێدەکرا، دوا کەس لە هاوسەرگیریدا پرسی پێدەکرا، بەڵام حاڵەتی یەکەم (لەجیاتی خوێن)ی

---

119 هێنی هارۆڵد هەنسن، کچانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤.
120 هێنی هارۆڵد هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.
121 هێنی هارۆڵد هەنسن، کچانی کورد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.
122 هەمان سەرچاوە، ل ٥٠.
123 ژویس بلو، مسالە کرد، بررسی تاریخی و جامعەشناسی، ت: د. پرویز امینی، نشر شالودە، تهران ١٣٧٩ (٢٠٠٠)، ص ٩٠.

لێدەرکەین لەوانی تردا پیاویش هێندەی ئەو زەرەرمەند بووە، کوڕیش ڕۆڵی وای نەبووە لە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەیدا، بەڵکو ئەم کارە لە ئەستۆی خێزان بوو. هەروەها ئێمە بەهیچ شێوەیەك ناتوانین ئەوە بسەلمێنین کە ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە لەو کاتەدا سەرکەوتوو نەبووە. بەکورتی دەتوانین بڵێین ژیان بە گشتی لەو کاتەدا زەحمەت بووە، ئافرەت ناچار بووە بۆ مانەوەی خۆی و خێزانەکەی ئەرکی زێتر لە ئەستۆ بگرێت، و لە کۆمەڵگای باوکسالاریشدا ئافرەت هەمیشە زێتر چەوساوەیە وێڕای ئەوەی ئێمە هاوڕاین لەگەڵ ئەوانەی کە پێیان وایە ئەم چەوساندنەوەیە کەمتر بووە لە ئافرەتە دراوسێکانیان. لە کۆتایشدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە نەك تەنیا لە هەر شارێك بەڵکو ڕەنگە لە هەر خێڵێکیشدا تێگەیشتن لە ئافرەت جیاواز بووبێت.

# بەشی چوارەم

## قۆناغەكانی راگواستنی كوردان لە عێراقدا

### باسی یەكەم: سیاسەتی راگواستن لە كوردستانی خوارووودا

تێگەیشتن لە سیاسەتی راگواستنی كوردەكانی كوردستانی باشور لەلایەن رژێمی بەعسەوە كە ٤٠ ساڵ بەردەوام بوو، بەبێ تیگەیشتن لە بەعسیزم ، بەبێ ئەوەی بزانین بەعس دەرهاوێشتەی چ هەلومەرجێكە، بەبێ ناسینی ئەو توخم و رەگەزانەی لە پێكهاتەی حزبی بەعسدا كۆ بوونەتەوە، دواجاریش بەبێ راڤەیەكی سۆسیۆلۆژیانەی تیروتەسەلی بەعس، نەك تەنیا ئاسان نییە، بەڵكو مومكین نییە، چونكە بەعس بە هەموو رەگەز و توخمەكانیەوە بونیاد و پێكهاتەیەكی جیاواز، تایبەتمەندیگەلێكی خۆی هەیە كە بە هۆیانەوە لە تەواوی رژێمەكانی دیكە جیاوازە. لێرەشدا مەبەستمان ئەوە نییە راگواستنی كوردان لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعسدا كورت بكەینەوە یان پشت لە مێژوو بكەین. هەر هەوڵێكی لەو جۆرە، بەوەش هەر جۆرە بەدەسپێشخەر لەقەڵەمدانێكی بەعس لە راگواستنی كوردان تەنانەت لە ناو سنووری عێراقیشدا كورت هەڵدەهێنێت.

راگواستنی كوردان مێژوویەكی دێرینی هەیە، لە سەردەمە كۆنەكانەوە بۆ سەدە نوێیەكان درێژ دەبێتەوە. راگواستنی كوردان

تەنانەت لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیشدا لە کوردستانی باشور (دواتر باسی دەکەین)، بەر لە گەیشتنی بەعس بە دەسەلات پەیڕەو کراوە. ئەمە سەبارەت بە پارچەکانی دیکەی کوردستانیش راستە کە دەکەونە ناو سنووری دەوڵەتەکانی ئێران، تورکیا و سووریا، هەروەها کوردەکانی سۆڤیەتی جاران، راستە، وڵاتانی ناوچەکە بە ئایدۆلۆژیای جیاوازەوە ـ لە ستالینەوە بگرە تا سەدام حوسێن، لە عێراق تا تورکیای ئەمڕۆ، تا سووریای ساڵەکانی شەست و ئێرانی ساڵەکانی ١٩٢٥ـ١٩٤٥ ئەم خەڵکەیان لە زێدی خۆیان هەڵکەندووە، ئەوانی لە گرووپ و دێهاتی بچووکدا پەرتوبڵاو کردوون، بەو هیوایەی، ئەگەر لە دەشت و کێوەکانیان دوور بکەونەوە ئەوا بە کورد یاخود بەلای کەمەوە بە ناسیۆنالیست نامێننەوە.[1] بەڵام پێمانوایە بۆیە پێویست دەکات لە بەعس تێبگەین تاکو بزاین لەو دیو راگواستنەوە چ شتێك خۆی حەشارداوە، چونکە ئەو راگواستنەی بەعس پیادەی کرد، وەکو زۆربەی ئەو تاوان و کردە دزێوانەی دیکەی، جیاواز و تاکانەیە لە شێوەی خۆیدا. بەعس لە داهێنانی تەکنیکی نوێ و دزێوترین شێوازەکانی راوەدوونان و کۆچپێکردن و راگواستندا دەسپێشخەرە، نەك لە راگواستندا وەك کردەیەکی ئەبستراکت و رووت. راگواستن وەك سیاسەت بەرماوە و میراتی رژێمە تۆتالیتارە جیهانییەکانە بە درێژایی مێژوو بۆ ئەم میراتگرەیان (بەعس) ماوەتەوە و ئەمیش، ئەو ئەزموونەی ئەوان بە تەکنیك و میکانیزمی نوێوە کە گونجاو بێت لەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمی مۆدێرنیتە پیادەی کرد. کەواتە رژێمی بەعس بەردێکی دیکە دەخاتە سەر دیواری

---

1 جاناتان راندل، با این رسوایی چه بخشایشی؟ اشنایيم با کردستان، ترجمه ابراهیم یونسی، انتشارات پانیذ، تهران ١٣٧٩ (٢٠٠٠)، ص ٢٥ـ٢٦.

تۆتالیتاریزم و ئەزموونەکانی رەگەزپەرستی دەولەمەندتر دەکات.

زۆرن ئەو رژێمانەی جینۆسایدیان لەدژی ئێتنۆس و گرووپی ئایینی دیکە ئەنجامداوە، بەلاّم هیچ کامێکیان وەك بەعسی عێراق بە سیستماتیك و بەرنامە پەیڕەوی نەکردووە. لەمەڕ راگواستنیش هەر وایە، ئەلّمانیای هیتلەری، فاشییەکانی ئیتالیا و دواتریش ئیسرائیل و... پەنایان بۆ ئەم سیاسەتە بردووە، بەلاّم ئەمەی بەعس ئەنجامی دا لەدژی کورد، وانەیەکی فەراموش نەکراو دەبێت بۆ هەموو ئەو رژێمە تاکڕەو و تۆتالیتارە رەگەزپەرستانەی لەدوای ئەو جلّەوی دەسەلاّت لە هەر کونجێکی ئەم جیهانە پانوبەرینەدا دەگرنە دەست.

ئەگەرچی لە رووکەشدا راگواستن سیاسەتێکە بۆ مەبەستگەلێکی سیاسی و لە پەنا هەر جارە و پاساوێك پیادە دەکرێت ـ کە دواتر دێینەوە سەریان ـ لە بنەڕەتدا رەهەندەکانی ئەم سیاسەتە زۆر قوولّتر و فراوانترن. هێشتا زووە ئێمە تێبگەین کە راگواستن چی کردووە و چی هێناوەتە ئاراوە، بە قوولّی درککردنی ئەم سیاسەتە تا ئێستاش لە توانای ئێمە بەدەرە. ئەم سیاسەتە چۆن کاتێکی درێژی خایاند تا ئەنجامدرا، ئاواش کاتێکی زۆری دەوێ تا بزانین ئەو بێچووەگەلەی لە هەناویەوە سەریان دەرهێناوە چین و چ گۆڕانکارییەکیان لە کۆمەلّگای ئێمەدا دروستکردووە. هەرێمی کوردستان کە پێش راگواستن بەو گوند و دێهاتانە داپۆشرابوو کە مێژوویان بۆ سەردەمانی زوو دەگەڕێتەوە، بەگوتەی جۆناسان راندلّ کۆمەلّگای دێهاتی کۆن تیایدا ریشەکێش کراوە.[٢] ئێمەی کورد تارادەیەکی زۆر بێئاگاین و چاومان ئەو گۆڕانکارییانە نابینێت کە بە درێژاییی ئەم چارەگە سەدەیەی دوایی

---

2 سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨.

روویان داوە، نازانین چیمان پێکراوە و چیمـان بەسـەرهاتووە، تەنانـەت درککردنـی ئـەو بـارەش کـارێکی ئاسـان نییـە بـە تایبـەتی بـۆ کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمـەڵگای ئێمـە کـە لـە هـەموو روویەکـەوە هـەژاری تیـۆری بـاڵی بـە سـەردا کێشـاوە. بـە تایبـەتی لـەرووی کۆمەڵناسـییەوە، چونکـە کۆمەڵناسـی ئـەو زانسـتەیە یـاخود ئـەو ئاوێنەیەیە کۆمەڵگاکان خۆیان لە بەریەوە دەخوێننەوە و ئـەوە دەزانـن کە چین و لەچیدا جیاوازن و چۆن دەگۆڕێن، بەڵام هـەژاری مەعریفـەی کۆمەڵناسـیانە، ئـەرکی کۆمـەڵگای کـوردی قورسـتر کـردووە لـە دەرککردن و ناسینی خۆی و ئەو پێشهاتانەی لە بۆسەدان بۆی.

ئێمە کە دەڵێین لەم چارەگە سەدەیەی دواییـدا، کۆمـەڵگای ئێمـە گەورەترین گۆڕانی کۆمەڵایـەتی بـە خـۆوە بینیـوە، پێمـان وانییـە و ناشـتوانین بانگەشـەی ئـەوە بکـەین کـە راگواسـتن ئـەو هـەموو گۆڕانکارییانەی دروست کردوون. سەرباری ئـەوەی کـە ئێمـە وای بـۆ دەچین سیاسەتی راگواستن هۆکارێکی گەورەی ئەم گۆڕانکارییانە بووە، دواتر زۆرتر لە سەری دەوەستین . رۆڵ و کاریگـەریی ئـەو هۆکارانـەی دیکە پشت گوێ ناخەین: پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی، گۆڕانی هاوکێشە هـەرێمی و جیهانییـەکان، شـەڕەکانی عـێراق لەگـەڵ دراوسـێکانی، راپـەڕینی سـاڵی ١٩٩١ ، بەجیـهانیکردن و ...هتـد و لـە دەور و بایەخیان کەم ناکەینەوە، بەڵام بەراوردکردنی بارودۆخ و هەلومـەرجی زۆر لە وڵاتان کە ئەو هۆکارانەی لە سەرەوە ناویان هـات ئامادەییـان هەبووە تیایاندا، بە پلەی خۆیان گۆڕانیان بە سەردا هـاتووە لەلایـەك، هەلومەرج و رەوشی کوردەکانی ژێر دەسـەڵاتی بـەعس لـە عـێراق و کوردەکانی پارچـەکانی دیکـەی کوردسـتان کـە بـەدەر نەبوونـە لـە راگواستن، بەڵام بە قەبارەیەکی کەمتر بە تایبەتی بـە بـەراورد لەگـەڵ ژمارەیان، تێدەگەین کەجگە لەم فاکتەرانە، هۆکارێکی دیکـە یـاخود

زێدەتر لەم چارەگە سەدەیەی دواییدا ئامادەیی لە کوردستانی باشووردا هەبووە، تا هەموو ئەو گۆڕانانە دروست بن. هەڵبەت ئەگەر ڕاگواستن تاکە هۆکارێکیش نەبێت لەم بوارەدا، ئەوا یەکێکە لە هۆکارە هەرە بەهێزەکان.

بە کورتی، ڕاگواستن ئەو کردەیە بوو کەبەرۆکی کۆمەڵگای کوردی بۆ لە باوەشگرتنی زۆرترین گۆڕانکارییەکان ئاوالاکرد، خێراییەکی لە ڕادە بەدەری بە پرۆسەی مۆدێرنیزەکردن (مۆدێرنیتەی کەرەستەیی) بەخشی کە دواتریش کاریگەری دەبێت لە سەر شێوازی بیرکردنەوە و هوشیاریی کۆمەڵایەتی و...هتد. ئەگەر جاران کوردەکانی عێراق لە پێدەشت و چیا دوورە دەستەکاندا لە ڕێی بۆمبا و تۆپ و فڕۆکەکانەوە پێشوازیان لە مۆدێرنیتە دەکرد، ئەوا ڕاگواستن ئەوانی (بە تایبەتی گوند و ئاواییەکانی سەر سنوور) بە ئاپۆرە لە ئوردوگاگەلێکی نزیك و دەسهەڵدا لە پێشوازی مۆدێرنیتە بە هەموو کەرەستەکانییەوە (ڕێگاوبان، ئوتۆمبیل، ئامێرە کارەبایەکان، جلوبەرگ، کەلوپەلی ناومال، خوێندن، تەندروستی...) کۆکردنەوە. سیاسەتی ڕاگواستن لە بەرفرەوانترین شێوەیدا کە لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول دەستی پێکرد، هاوکات بوو لەگەڵ پرۆسەی بە مۆدێرنەبوونی کۆمەڵگای کوردی لە بەرفراوانترین شێوەیدا. بێگومان ئەوە ئەمە ناگەینێت کە کۆمەڵگای کوردی مۆدێرن بووە بە مانا ڕاستەقینەکەی، بەڵکو مەبەستمان کاریگەربوونیەتی بە مۆدێرنیتە و مۆدێرن بوونیەتی بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێشووتردا.

دوای ئەوەی کۆمەڵگای کوردی بە ڕاگواستندا تێپەڕی، سیحری هەموو ئەو نووسینانە (نووسراوی ڕۆژهەلاتناس و گەڕۆکەکان) بەتاڵ بووەوە کە لەژێر ڕۆشناییاندا کۆمەڵگای کوردی و خەسڵەتەکانی کەسایەتی کوردیان پێ دەخوێندرایەوە. بەدەربڕینێکی تر، بەکۆتایی

هاتنی راگواستنی گوندنشینەکانی هەرێمی کوردستان لەدوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن رژێمی عێراقەوە چیتر کوردەکان چیانشین نین، چیتر میللەتێکی شوانکارە و کۆچەر نین. بۆیە هەر خوێندنەوەیەکی ئەمرۆی کۆمەڵگای کوردی و کەسایەتی مرۆڤی کورد ، لەسەر بنەمای ئەو راڤە و نووسینە بەنرخانەی رۆژهەڵاتناس و گەرۆکە بیانییەکان کە لە کاتی خۆیاندا سەبارەت بە کورد بە ئەنجامیان گەیاندبوو، خوێندنەوەیەکی ناواقعی و نابابەتی دەبێت بۆ ئەمرۆ. خوێندنەوەی ئەمرۆی کۆمەڵگای کوردی لە کوردستانی باشوردا پێویستی بە دید و بۆچوونی نوێ، رێباز و میتۆدی دیکە هەیە کە لەگەڵ پێویستی سەردەمدا بگونجێن.

پێشتر ئاماژەم بەوە دا کە بەعس بەشێوەیەکی سیستماتیکانە راگواستنی کوردەکانی بە ئەنجام گەیاند. لەهەمان کاتیشدا ئەمە ئەوە ناگەینێت کە لە هەموو قۆناغەکاندا هەمان میکانیزم خرابێتەگەڕ. بەعس بە پێی بارودۆخ و هەلومەرجی رۆژ ئەم سیاسەتەی خۆی کە هەر لە سەرەتاوە ستراتیژی بووە ـ پیادە کردووە. بۆیە ئێمە لەم سیاسەتەیدا هێڵێکی راست نابینین، بەڵکو هێڵێکی تێك ئاڵۆزکاوە و رەچاوی ئەوەی نەکردووە کە چ ناوچەیەك لە چ ماوەیەکی زەمەنیدا رادەگوێزێت، هێندەی ئەوەی حیسابی ئەوەی کردبێت لە چ ماوەیەکدا دەتوانێت زێتر پاساو بۆ کردەکەی بهێنێتەوە و کامە میکانیزم لەگەڵ کامە قۆناغ دەگونجێت تا گەورەترین گورزی بوەشێنێت. راگواستن بە هەموو جۆرەکانی لە پەنا هەر پاساوێك بێت، ئەوا لەدوای راگواستنی قەڵادزێ و مێرگەسوور دەرکەوت کە هەموو پاساوەکان بێ بنەما و بێ بنچینەن.

راگواستن لەدوای ساڵی ١٩٦٣وە سیاسەتێکی هاوکاتە لەگەڵ هەموو ئەنفال، عەرەباندن و کیمیابارانێك. هیچ ناوچەیەك لەم

ماوەیەدا بە عەرەب نەکرا، بیر لەوە نەکرابێتەوە کوردەکانی لێ وەدەرنێن یان هاوکات لەو ساتەدا یان دواتر دانیشتووانی ئەو ناوچەیە دەرنەکرابن. هیچ ئەنفال، کیمیابارانێك رووی نەدا راگواستن و راوەدوونانی لە تەکدا نەبێت. هیچ هێرشێکی سوپا و جاشەکان نەکرا کە ئاپۆرەیەك لادێنشینی ئاوارە نەکردبن. واتە راگواستن ستراتیژ و سیاسەتێکی ئامادە بوو لە پشت هەموو هەنگاوێکی بەعسەوە. وێڕای ئەوەش راگواستن سیاسەتێکی سەربەخۆ بوو لە هەموو کیمیاباران و بەعەرەبکردن و ئەنفالێك. چل ساڵ بەردەوام کاری بۆ کرا.

راگواستنی کوردەکان ئامانجێکی رژێمی بەعسە، هەروەها کۆڵەگەیەکە لە کۆڵەگەکانی کورد قڕان و سڕینەوەی نەژادی کورد. ئەگەر لە راگواستندا راستەوخۆ مرۆڤەکان نەدەکوژران، شوێنبزر نەدەکران وەك ئەنفال و کیمیاباران، ئەوا راگواستن زەمینە خۆشکەرێکی سەرەکی کورد قڕان بوو، بە هۆی راگواستنەوە بوو کە تاکە هیوای بەعس لە کۆنترۆڵ کردن و بەرزەفتەکردنی کوردان دەهاتە دی. بۆیەش راگواستن دەسکەوتێکی زۆر گەورەتر بوو بۆ بەعس. پێمان وا نییە بەعس پرۆگرامێکی بەدەستەوە بێت کە هەرچی کوردە بکوژێت، واتە بە تەڤکوژییەك کۆتایی بە کورد بێنێت، چونکە ئەمە نەمومکینە نە لە دەستی دەهات، ئەگەر مەیلی ئەوەشی هەبێت و ئەمە خەونێکی بێت. بەلام سڕینەوەی مۆرکی کوردبوون و بچووککردنەوەی ئەو رووبەرەی بە کوردستان ناسراوە و تەسککردنی ناوچە کوردنشینەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان تا ئەو رادەیەی کە دەکرێت، خاڵێکی سەرەکی پرۆگرامی بەعس بوو. بە کردەوەش سەلماندی، لەمەشدا پشکی راگواستن پشکی شێرە. لە لایەکەوە تا کرا لە میانەی راگواستنەوە سنووری ئەو رووبەرەی کە کوردستانە بچووك کرایەوە. هەروەها راگواستن وێڕای ئەوەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای

کوردی بوو، سیاسەتێکیش بوو بۆ کۆکردنەوە و بە ئاسانی کۆنترۆڵ کردنی کوردەکان تا لە میانەیەوە بەعس بتوانێت هەموو کردە دزێو و تاوانەکانی لە بەرامبەریاندا بە ئەنجام بگەیەنێت.

راگواستن ترسی لە دەستدان و جودابوونەوەی زیاتر کرد. بەتایبەتی ئەو کاتەی راگوێزراوەکان خۆیان لەناو کێشمەکێشەکانی شاردا دۆزیەوە. ترس لە دوورکەوتنەوە لە شوێنی باب و باپیران و بیرەوەری و رابردووی هاوبەش لە مەزاری کەسوکار و خوشەویستان، لە شوێنی گەورەبوون و یادگارەکانی منداڵی و ئیشکردن و عەشقەکانی سەرەتایی... لەولاشەوە ترس لە ونبوون، لەبیرچوونەوە و هەستکردن بە بێکاری لەناو شارەکاندا... ترس لە ژیانی پەراوێزی و مانەوە لە بازنەی برسێتی و مەرگەساتدا.[3]

راگواستن سیاسەتێکی فرە رەهەند بوو، هەر بۆیەش زێتر لە چاوێکی پێویستە بۆ خوێندنەوەی. دەکرێ خوێندنەوەگەلێکی بۆ بکرێت. راگواستن چەندە بە مەبەستێکی سیاسی ئەنجامدراوە، هێندەش مەبەستی کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری، پەروەردەیی ... هتد لە پشتەوە بوون. خوێندنەوەی سیاسیانەی راگواستن بە تەنیا، نیشانەی تێنەگەیشتنی کوردەکانە لە راگواستن، چونکە کاریگەری سیاسیانەی راگواستن لەدوای نەمانی رژێمی‌بەعس لە سەر دەسەڵات، تاکەمترین ئاستی کەم دەبێتەوە، هەروەك لە ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی خواروو لەدوای راپەڕینی ١٩٩١ هەستی پێ دەکرا. ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆری گوندەکان ئاوەدان نەکراونەتەوە، ئوردووگا زۆرەملێکان بوون بە واقعێك، ئەو راگوێزراوانەی کۆچیان

---

3 رێبوار سیوەیلی، دنیای شتە.بچووکەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٢٠٢.

کردبوو بۆ شارەکان زۆربەیان نەگەڕانەوە، وێڕای ئەوەش کاریگەرییە سیاسیەکەی گەیشتە ئاستێکی زۆر نزم. ئەوەی ماوەتەوە و ئامادەیی هەیە و ئێستا زێتر هەستی پێ دەکەین ڕەهەندەکانی کۆمەلایەتی، کولتووری، ئابووری، پەروەردەیی ...هتد ڕاگواستنن.

پێشتر گوتمان تێگەیشتن لە ڕاگواستن لە کاتێکدا هێشتا کاتێکی زۆر کەم بەسەر بەکۆتاییهاتنی تێپەڕیوە، بەلەبەر چاوگرتنی فرە ڕەهەندی و ئالۆزیەکەی، کارێکی قورس و زەحمەتە. ئەوەی ئەم تێگەیشتنەش قورستر دەکات وێڕای نەبوونی بەعسناسییەکی تۆکمە و فرە ڕەهەندی ڕاگواستن، نەبوونی بەڵگەنامە و دەکومێنتی پێویستە کە دەکرا هاوکارێکی باش بن لە تێگەیشتن لە سیاسەتی ڕاگواستن. هەر لێرەوەش دەتوانین بپەڕینەوە بۆ بابەتێکی دیکە کە هاوکار بووە لەوەی نە بەعسناسی، نە ڕازونهێنیەکانی ئەنفال و تەعریب و تەرحیل دەرکەون، ئەویش کەمتەرخەمی و ناهوشیاری دەسەلاتی کوردییە. دەسەلاتی کوردی بە پەرلەمان، حکومەت و هەموو هێز و لایەنە سیاسییەکانی دیکەی هەرێمی کوردستانەوە، تا ئەوپەڕی کەمتەرخەمن لەوەی کە ئێمە ناتوانین بە باشی سیاسەتێکی وەك ڕاگواستن، یەکەم دەرك بکەین، دواتریش بخوێنینەوە و ڕاڤەی بکەین و دەرەنجامەکانی بخەینەڕوو. ئەویش لە چەند ڕوویەکەوە : یەکەم، فەوتاندن، شاردنەوە یاخود گواستنەوەی دەکومێنت و بەڵگەنامەکان بۆ دەرەوەی هەرێمی کوردستان و دوورخستنەوەیان لە چاوی باسکار و توێژەران، بۆ ئەوەی لە باس و توێژینەوەکانیاندا سوودیان لێ وەرگرن. زۆر لەوەی ئێمە لەبارەی ئامانج و مەبەستی ڕاگوستنەوە دەیلێین تەئویل و تێگەیشتنی ئێمەیە لەم سیاسەتە، زۆربەی جارانیش کەموکووڕی زۆرە. زۆر کەمیش دەتوانین گوتەکانمان بسەلمێنین، بەڵگەگەلێکی ئەوتۆی دەمکوتکەرمان لەبەردەست نین کە مەرامی بەعس لەم سیاسەتە بە

تەواوی روون بکاتەوە. هەڵبەت گۆمانمان لەوە نییە کە راگواستن بەر لە هەر شتێك ئامانجی سڕینەوەی کوردە، بەڵام ئەوەی کە پێویستیمان پێیە بوونی دەکومێنت و بەڵگەگەلێکە کە لە توانایان دا دەبوو هەموو رێوشوێن، میکانیزم و ئەو قۆناغانەی گرتوویانەتە بەر لە میانەیانەوە روونده‌کرانەوە، تەنیا لەمیانی گوتەیەکی دەکومێنتکراوی عەلی حەسەن ئەلمەجیدەوەیە کە ئێمە دەزانین بایەخی راگواستن بۆ ئەوان چی بووە، کاتێك ساڵی ١٩٨٧ لە کۆبوونەوەیەکدا دەڵێت : ((تەواوی هێزەکانی سوپای عێراق نەیانتوانی ئەوە بکەن کە ئێمە کردمان، چونکە ئەمە (واتە راگواستن) لە ناخەوە ئازاریان دەدا، دەیانکوژێ.))[4] دووەم، نەبوونی ئاماری ورد، نەك تەنیا لەبارەی راگوێزراوەکان یاخود ژمارەی خێزانە راگوێزراوەکان و ئەو قوتابخانە و بنکە تەندروستیانەی کە وێران کراون، بەڵکو نەبوونی ناو و ژمارەی هەموو گوندە راگوێزراوەکانە لە هیچ بنکە و دامودەزگایەکی حزبی و حکومیدا. سێیەم، نەبوونی سەنتەر، بنکەیەکی لێکۆڵینەوە لە راگواستن و دەرەنجامەکانی، هەروەها بە دەنگ نەهێنانی راگوێزراوەکانە لە باسکردنی چۆنیەتی راگواستنیان و ئەو مەینەتی و دەردەسەرییانەی کە دووچاریان هاتوون. دواجاریش بە جیدی هەوڵنەدان بۆ زیندوو راگرتنی یادەوەریی راگواستن لە یادەوەریی تاکی کورددا.

هەر لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە چ بە کتێب و چ بە لێکۆڵینەوە و بابەتی ناو رۆژنامە و گۆڤارەکان تارادەیەك هەوڵدراوە لە سیاسەتی راگواستن بکۆڵنەوە، پەردە لە سەر مەبەست و ئامانجەکانی هەڵدەنەوە،

---

4 میدڵ ئیست وۆچ، جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد، و: سیامەندی موفتی زادە، چاپخانەی خاك، سلێمانی ١٩٩٩، ل ٥٦٧ـ٥٦٨.

تێکڕای ئەو نووسینانەی لەبارەی ڕاگواستنەوە نووسراون مەبەست و ئامانجەکانی ڕاگواستنیان لەم پێنج خاڵەدا کورت کردوونەتەوە:

١ ـ تەرحیل، تەعریب و تەبعیس ... ئەم سێکوچکەیە قووڵاییەکی ستراتیجیی هەیە و ڕووی لە تواندنەوەی نەتەوەی کوردە.[٥]

٢ ـ داماڵینی مۆرکی نەتەوەیی شار و شارۆچکە کوردستانیەکانی باشوری کوردستان و گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچە کوردییەکان.[٦]

٣ ـ جیاکردنەوە و دابڕینی هێزە شۆڕشگێرە چەکدارەکان لە جەماوەر.

٤ ـ دانیشتووانی ڕاگوێزراو بێ بە کاربردە کە لە بنەڕەتدا بەرهەمهێنەر بووە.

٥ ـ دووبارە نیشتەجێ کردنەوەی دانیشتووانی دەوڵەت، بەپێی هەندێ پێوانەی تایبەتی.[٧]

بەڵام ئێمە وای دەبینین وێڕای ئەمانەی سەرەوە، ئامانجی دیکەش لەپاڵ ئەم سیاسەتەدا هەبووە، لەوانەش:

٦ ـ کۆنترۆڵکردنی جەستەیی و هزریی دانیشتووانی ڕاگوێزراو، و هەوڵدان بۆ پەروەردەکردن و پێگەیاندنیان بەپێی ئایدیۆلۆژیای بەعس.

٧ـ دابڕینی کوردەکانی کوردستانی خواروو بە تایبەتی ئەوانەی

---

5 ئەمین قادر مینە، ئەمنیی ستراتیجی عێراق و سێکوچکەی بەعسییان: تەرحیل تەعریب تەبعیس، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی ١٩٩٩، ل ١٤٠.

6 کاوە نادر، کەندێناوە لە نێوان ڕاگواستن و بە عەرەبکردندا، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی میدیا، هەولێر ٢٠٠٠، ل ٧.

7 سلێمان عەبدوڵلا، ڕاگواستنی گوندنشینەکان لە هەرێمی کوردستاندا، سەنتەری برایەتی، ژمارە ١٢، هەولێر، حوزەیرانی ١٩٩٩، ل ٥.

سەر سنوورەکان لە کوردەکانی پارچەکانی دیکەی کوردستان. لێرەشدا پێویستە لە یادمان بێت کە دەوڵەتی عێراق لەگەڵ هەر یەکێك لە ئێران و تورکیا رێکەوتنامەی مۆرکردووە کە بتوانن بچنە ناو خاکی یەکترەوە. هەر یەکێك لە دوو دەوڵەتە ناوبراوەکە هاوکاری رژێمی بەعس بوون لەم کردەیەدا.

٨ـ گۆڕین و شێواندنی بونیادی کۆمەڵگای کوردی و زەینی مرۆڤی کورد لە زێتر لە روویەکەوە. بەوەی کە هەوڵیدا بۆ نموونە چیانشینەکان بگوازێتەوە بۆ بیابانێکی رووتەن لە باشووری عێراق، تۆبۆگرافیا، زمان، ئاووهەوا ... هتد ئەم دوو ناوچەیە بە تەواوی جیاوازن. لەلایەکی دیکەوە گواستنەوەی خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتی بۆ پارێزگای دهۆك کە دیالێکتیان جیاوازە، هەروەها گواستنەوەی عەشرەتەکانی مزووری و شێروانی بۆ بەحرکە و سێبیران لە دەشتی بەرانەتی کە هەم دیالێکت و هەم ئاووهەوایان جیاوازە.

## باسی دووەم: پێشینەیەکی مێژوویی راگواستنی کورد لە عێراقدا

بەر لەوەی راگواستنی کوردان لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە بەسەر چەند قۆناغێك دابەش بکەین، بە پێویستی دەزانین هەندێك بۆ دواوە بگەڕێینەوە و بزانین بەر لە ساڵی ١٩٦٣ کە ماوەی زەمەنی تیژدکەمان لەو کاتەوە دەست پێ دەکات، راگواستنی کوردان لە ناو سنووری دەوڵەتی عێراقدا چۆن بووە.

هەڵبەت مێژووی راگواستنی کوردان مێژوویەکی دوور و درێژە، لەرووی جوگرافیشەوە زۆر بەرفراوانەو لە توانای ئەم باسە بەدەرە، بەڵام پێمان باشە تیشکێك بخەینە سەر راگواستنی کوردان لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە دەیەی سێیەمی سەدەی رابردوودا، چونکە لەرووی جوگرافییەوە هەمان هەرێمە و ماوە زەمەنییەکەش هێندە زۆر نییە.

راگواستنی کوردان چونکه ئامانجێکی سیاسی لــه پشــتەوە بــووە، پێویستە لە سەردتاوە لەو خاڵانەوە دەستی پێکردبێت کە هەڕەشــە لــە سستەمی سیاسی دەکەن. یەکەم، هەڕەشەش لە دژی دەوڵــەتی عــێراق لە ناو سنووری عێراقدا لەگەڵ شۆڕشــی شــێخ مــەحموود و شۆڕشــی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە ساڵی ١٩٣١ دەستی پــێ کــرد. حکومــەتی عێراق بە هاوکاری ئینگلیزەکان هەموو هەولێکیان خســتە گــەڕ بــۆ دامرکاندنــەوەی شۆڕشــە کوردیەکان. لــە ئــەنجامی هێرشــەکانی حکومەت بە یارمەتی فڕۆکەکانی ئینگلیز دانیشــتووانی گوندەکــانی بــەڕۆژ، نــزار، شــێروانی و دۆلەمــەری کــۆچ دەکــەن بــۆ ناوچــەی شێروانیەکانی رۆژئاوای رووباری رووکوچك و هەروەها دەڤەری گەردی و مزووریەکان.[٨] لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ ئامادەباشی وەردەگرن بۆ پەنا بردنە بەر تورکیا، هەموو خێزانەکان لە دۆڵی زێت کۆ دەبنەوە بۆ چوونــە نــاو تورکیــا، بــەڵام شــێخ ئەحمــەد بڕیــار دەدات کــە ئــەو خێزانانەی مەترسییان لەسەر نییە پێویستە بگەڕێنەوە گوندەکانیــان و ئەوانی تریش سنووری تورکیا ببڕن. بەم شــێوەیە لــە ٢١/ ٦ /١٩٣٢ دوا خێزان گوندی زێت بەجێ دێلێت و دەچێتە گوندی گرانە لــەو دیــو سنووری تورکیا، کۆی ژمارەی خێزانــە ئاوارەکــان ٤٠٠ خــێزان بــوون. لەوێش حکومەتی تورکیا ئــەوانی بــەردو ئــەرزەڕۆم لــەرێی گەڤــەڕ ـ وانەوە راگواســتن.[٩] ئەمــەش یەکــەمین راگواســتنی کــوردان بــوو لــە عێراقدا لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عــێراق. دووەمــین راگواســتنی کوردانیش لــە چلەکانی سەدەی رابــردوودا روویــدا لەســەر دەســتی وەزاردتی رەشید عالی گەیلانی، کە بەرفرەوانترین هەڵمەت بــوو کــوردە

---

٨ مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية ( ١٩٣١-١٩٣٢)، كردستان ١٩٨٥، ص ٤٠ .

١٠ هەمان سەرچاوە، ل ٤٣-٤٥.

عالی گەیلانی، کە بەرفرەوانترین هەڵمەت بوو کوردە فەیلییەکان بە خۆیانەوە بینیان. لەمیانەیدا بە هەزاران کەس بۆ ئەو بەری سنووری ئێران بەرێ خران.[10]

راگواستنێکی تری کوردان لەدوای کۆتاییی هاتنی شۆڕشی ١٩٤٣ـ١٩٤٥ ی بارزان شێوەی وەرگرت. لەدوای شکستی شۆڕش لە ١١/ ١٠/ ١٩٤٥ بارزانییەکان لە رێگەی کێلەشین ـ مەرگەڤەرەوە پاشەکشێ دەکەن بۆ ناو کوردستانی ئێران. بەپێی رێکەوتنێك لەگەڵ سەرۆکی هێزەکانی سۆڤیەت کە ئەوکاتە بەشێك لە ئێرانیان داگیرکردبوو، خێزانەکان بەسەرگوندەکانی ناوچەکانی (مەرگەڤەر، تەرگەڤەر، شنۆ، نەغەدە، مەهاباد) دا دابەش کران. و لەوێ لە ئەنجامی بلاوبوونەوەی نەخوشی تیفوئید و شەڕەکانی بەرگریکردن لە کۆماری مەهاباد ٤٩٪ی بارزانیەکان لەناوچوون. ژمارەی ئەو بارزانیانەی ئاوارەی کوردستانی رۆژهەلات بوون زێتر لە ١٠٠٠٠ کەس بوون، بەپێی سەرچاوە عێراقیەکان لە ١٧ و ١٨ نیسانی ١٩٤٧ تەنیا ٤٥٦٥ کەس گەڕانەوە عێراق.[11] بارزانییەکان لە ١٠/ ٤/ ١٩٤٧ لەسەر رووباری گادەر لەسەر سنووری ئێران ـ عێراق کۆبوونەوە بۆ گەڕانەوە. لە ١٥ نیسان مستەفا بارزانی ٥٦٠ چەکدار هەڵدەبژێرێت و رێگەی دوارۆژێکی نادیار دەگرێتە بەر[12] و لە ١٨/ ٦/ ١٩٤٧ لە

---

10 د.خليل اسماعيل محمد، مؤشرات سياسة التعريب و التهجير فى اقليم كردستان العراق، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل ٢٠٠١، ص ٢٠.

11 ايوب بارزانى، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤ـ١٩٥٨، دار نشر حقائق المشرق، باريس، ٢٠٠٢، ص ٦.

12 مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية (١٩٤٣ـ١٩٤٥)، كردستان، ١٩٨٦، ص ٩١ـ ٩٢.

رووباری ئاراس پەڕینەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەتی جاران.[13] لە لایەکی ترەوە لەدوای گەڕانەوەی بارزانییەکان بۆ عێراق، حکومەتی عێراق پیاوەکانی سەروی ١٨ ساڵیان گرتن و گواستنەوە بۆ بەندینخانەکانی مووسڵ و کەرکوك، هەروەها شێخ ئەحمەد و نزیکەکانیشی دوور خستنەوە بۆ کەربەلا و خێزانە بارزانییەکانی تریش بەسەر ناوچەکانی هەرسێ پارێزگای هەولێر، مووسڵ و کەرکوکدا دابەش کران؛ ساڵی ١٩٥٣ دوای شەش ساڵ ئاوارەیی رێگەیان پێدرا بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان، بەڵام شێخ ئەحمەد و نزیکەکانی تا ساڵی ١٩٥٨ لە تاراوگە مانەوە.[14]

هەرچەندە چاوەروان دەکرا بە نەمانی پاشایەتی لە عێراقدا و جێگیربوونی سستەمی کۆماری، رەوشی عێراق بەرەو باشی بچێت، بەڵام مەینەتییە گەورەکانی عێراق بە گشتی و کورد بە تایبەتی لەوێوە پەرەیان سەند. ساڵی ١٩٥٩، واتە تەواو ساڵێك دوای شۆڕشی ١٤ تەمووز لە ١٩٥٨ و لە میانەی ئاهەنگەکانی یادی سەرکەوتنی شۆڕش کارەساتێکی جەرگبڕ لە کەرکوك روویدا، کە کورد و تورکمانەکان پێکەوە تیایدا زەرەرمەند بوون. تیایدا زێتر لە ٢٠ کەس کوژران و ١٣٠ کەسیش بریندار.[15] لە دوای ئەم رووداوە چەند رێکخراوێکی نهێنی تورکمانی بە پاڵپشتی هەندێ بەرپرس لە ئەمنی کەرکوك دروست بوون، بە مەبەستی تیرورکردنی کوردەکانی کەرکوك. ئەوەی لەم کردەیەش کەوتەوە ئەوە بوو کە زۆر لە خێزانە کوردەکان ناچار بوون ئەوێ بەجێ بهێڵن و کۆچ بکەن بۆ شارەکانی تر.[16] هەروەها هەر لەو ماوەیەدا نازم تەبەقچلی سەرۆکی فیرقەی دوو هەولی دەدا

---

13 مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية (١٩٤٥ـ١٩٥٨)، كردستان، ١٩٨٧، ص ٢٤.

14 هەمان سەرچاوە، ل ٧١.

15 هەمان سەرچاوە، ل ٩١.

16 هەمان سەرچاوە، ل ١٢٣ـ١٢٤.

کارمەندە کوردەکان لە کەرکوك بگوازێتەوە، لە هەمان کاتدا دژی بوونی ئەفسەرە کوردەکان بوو لە فیرقەی دوو، داوای دەکرد بۆ دەرەوەی فیرقەکەی بگوازرێنەوە.[17] بەمەش دەبینین دیسان راگواستنی کورد هەر بەردەوام بوو چ راستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ.

لەگەڵ هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشی ئەیلوول، ئاوارەیی و وێرانکردنی گوندەکانیش دەستی پێکرد. لە کانوونی دووەمی ۱۹٦۲ شۆڕشگێڕە کوردەکان بانگەشەیان دەکرد (٥۰۰) گوندی کوردستان کەوتوونەتە بەر هێرشی ئاسمانی و (۸۰,۰۰۰) کەس بێ خانومان مانەوە.[18]

## باسی سێیەم: قۆناغەکانی راگواستنی کورد لەلایەن رژێمی بەعسەوە

بە هاتنی بەعس بۆ دەسەڵات لە عێراق، پاکتاوکردنی کورد دەبێتە سیاسەتێکی رەسمی ئەو حزبە، بە چەندین شێوە هەوڵی بۆ ئەم مەبەستە داوە، یەکێك لەو رێگایانە راگواستنی کوردان بوو. لەبەر ئەوەی نزیکەی چل ساڵ بە شێوەیەکی بەردەوام و سیستماتیك ئەم سیاسەتە بەردەوام بوو، پێمانوایە ئەگەر بەسەرچەند قۆناغێك دابەشی بکەین بەم شێوەیە: بەر لە ۱۹۷٥ (واتە لە ساڵی ۱۹٦۳ـ۱۹۷٤)، ۱۹۷٥ ـ۱۹۹۰، ۱۹۹۱ ـ ۲۰۰۳ باشتر دەتوانین روونی بکەینەوە.

هەڵبەت ئەوەی وامان لێدەکات ساڵەکانی ۱۹۷٥، ۱۹۹۱ وەك وێستگە وەریان گرین هەر لە خۆیەوە نییە، بەڵکو ئەم دوو ساڵە، دوو ساڵی زۆر بەرچاو و دیارن لە مێژووی هاوچەرخی کورددا. ساڵی ۱۹۷٥ ساڵێکی شۆمە لە مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی کورددا بەوەی کە لەم ساڵەدا، لە ئەنجامی رێکەوتنامەی جەزایری نێوان سەدام

17 د. نوری الطالباني، منطقة كركوك و محاولات تغيير واقعها القومي، لندن، ۱۹۹٥، ص ۱۳٦.

18 دیوود مك داول، تاريخ معاصر كرد، ت: ابراهيم يونسى، انتشارات پانيذ، تهران، ۱۳۸۰ (۲۰۰۱)، ص ٤۸٥.

حوسێن و محەمەد ڕەزا شای ئێراندا گەورەترین شۆڕشی کورد نسکۆی هێنا، و قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد و گەورەترین مەینەتییەکانی کوردەکانی عێراق لەدوای ئەم ڕێکەوتنەوە دەستیان پێ کرد. سەبارەت بە ڕاگواستنیش زۆر گرنگە ئەم ساڵە بە سەرەتای قۆناغێك و کۆتایی قۆناغێك لەقەڵەم بدەین، چونکە ڕاگواستنی کوردان لەم دوو قۆناغەدا بەتەواوی جیاوازە هەم لەڕووی قەبارە و میکانیزمی ئەنجامدان و هەم ئەو ڕووبەرە زەوییەی کە ڕاگواستنی تێدا پیادەکرا، وێڕای سروشتی سیاسەتەکە. سەبارەت بە ١٩٩١یش بە هەمان شێوە قۆناغێکی نوێیە لە مێژووی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورددا، لە سەرێکەوە یەکەمجارە کورد بۆ ماوەیەکی هێندە فەرمانڕەوایی هەرێمێکی خۆیان دەکەن لە مێژووی هاوچەرخیاندا، لە سەرێکی تریشەوە میکانیزم و سروشتی ڕاگواستن گۆڕانی بە سەردا هاتووە.

## قۆناغی یەکەم: ١٩٦٣ـ١٩٧٤

ئەم قۆناغە لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی ڕژێمی بەعس ساڵی ١٩٦٣ لە ڕێی کۆدەتایەکی عەسکەرییەوە دەست پێ دەکات. لەبەرئەوەی بەعس لەیەکەم حوکمڕانی‌یدا تەنیا شەش مانگ لە دەسەڵاتدا مایەوە نەیتوانی لەو ماوە کەمەدا هەموو خەونەکانی بهێنێتە دی، ئەگەرچی لەم ماوە کورتەدا کەمی نەکرد، بەڵکو لە چاو ئەو ماوە کەمە، زۆری کرد. هەر لە دەسپێکی فەرمانڕەواییەکەیدا سەلماندی کە سیاسەتێکی ترسناکی بۆ ڕاگواستنی کوردەکان داڕشتووە ئەویش لە میانەی پراکتیزەکردنی ئەم سیاسەتەی.

سوپا و حەرەس قەومی لە ١١/ ٦/ ١٩٦٣ لە قەزای دوبز کە ئەو کات ناحیە بوو ٢٢ گوندی کوردانیان داگیر کرد و عەرەبیان لێ نیشتەجێ کردن. ئەوانیش ئەم گوندانە بوون: قەرەدەرە، عەمشە، مەرعی، قوشقایە، مەلا عەربەت، هەنجیرەی بچووک، قوتانی خەلیفە،

قوتانی کوردەکان، سێکانیان، شۆڕاو، باجوان، مامە، عەلەغێر، شیرناو، تەقتەق، کونەڕێوی، گورگەچاڵ، شێخان، نادراو، درکەی کوردان، چەخماخە، مەلحە. تەنیا یەك دوو گوند لەمانەی کە ناویان هات ماڵە عەرەبی لێ بوون، ئەوانی تر هەموویان کورد بوون.[19]

هەروەها لە ٢٤/ ٦/ ١٩٦٣ لە ناحیەی سەرگەڕان حکومەت گوندەکانی جاستان، دەربەند، سەربەشاخ، بەرکانە، عەولافات، سارەلو، شناغە، درکەی گەورە، درکەی گچکە، چەرت، گێسمە، تەل هەلالە، گەزوەشان، گەڕاو، بەعەرەبکردن و کوردەکانیان ئاوارە کردن کە تێکرا ژمارەیان ١٤ گوند بوو.[20]

لە دەشتی هەولێریش دوای ئەوەی سوپای عێراق لە شەڕی دارەخورمای بناری قەرەچوغ لە ١٣/ ٦/ ١٩٦٣ لەبەرانبەر هێزی پێشمەرگە تێکشکا، حکومەت لە تۆڵەی ئەوەدا لە ڕۆژی ٢٤/ ٦/ ١٩٦٣دا ١٨ گوندی سووتاند و تالان کردن و نزیکەی ٣٠٠ کەس لە جووتیارانی ناوچەکەشی لە کونجی بەندینخانەکانی عێراقدا ئاخنین، ئەو گوندانەش بریتیبوون لە: کەندال، گاوەرە، خدریجە، لاوەرچیغلۆك، دێمەکار، جانە، چەغەمیرە، تیکالو، عاللا، کەندالە قەل، قوچ، غەرابە، گابەلەکە، حاجی شێخان، دارەخورما، حەسەن بلباس، خوشاو و دەرماناوە.[21]

هەروەها ٦٣ گوندی ناحیەی سورداش لە قەزای دوکان لە ساڵی ١٩٦٣ بە دەستی سوپای ڕژێم سووتێنران و خەڵکەکەیان ئاوارە بوو. ناوی هەموو ئەو گوندانە لە کتێبەکەی شۆڕش ڕەسووڵ، وێرانکردنی

---

19 ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤١.
20 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.
21 کاوە نادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩ ـ ٤٤.

ولاتێك دا هاتوون.[22]

له سەرچاوەیەکدا هاتووە کە: لە هەمان ساڵدا، واتە ١٩٦٣، تێکدانی خانووبەرە و ناوچە کوردییەکان لە کەرکوك دەستی پێکرد، بۆ نموونە سەدان خانوو لەو ناوچەیەی کە بە گەڕەکی کۆماری ناسرابوو تێکدران.[23] هەموو ئالیەتەکانی شارەوانی لە ژێر چاودێری حەرەس قەومییەکان بەشدارییان لەم تێکدانەدا کرد.[24] لە کتێبی کورد و کەرکوك دا هاتووە ساڵی ١٩٦٣ ئەو کاتە بە جارێك هەشت هەزار خێزان لە کەرکوك دەرکران... هەزاران کەس لە دانیشتووانی کەرکوك بێگومان بە زۆری کورد و کەمێکیش تورکمان و ئەوانی دیکە لە زیندانەکانی موسەیەب و شوێنەکانی تری ناو شار توند کران و تاکە مەرجی بەربوونی زۆربەیان ئەوە بوو کە ئەو شارە بەجێ بهێڵن.[25]

هەروەها لە بەهاری هەمان ساڵدا زیاتر لە ٥٠ گوندی عەشرەتەکانی شێروانی، بەرۆژی و نزاری لە ناوچەی بارزان لە ئەنجامی نائارامی ناوچەکە ئاوارە دەبن و لە ناوچەی مزوورییەکان دەگیرسێنەوە تا پایزێکی درەنگ.[26]

حکومەتی عێراق سور بوو لەسەرئەوەی کە کوردەکان لە دامودەزگاکانی کۆمپانیای نەوت دووربخاتەوە و عەرەبەکان لە

---

22 Shorh, M. Resool, Statistics of Atrocities in Iraq Kurdistan, Newyork,1990.pp.109 -110.

23 وريا الجاف، كركوك دراسة اجتماعية سياسية، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص ١٤٢.

24 د. نوري طالباني، نفس المصدر، ص٥٦.

25 لەتیف فاتح فەرەج، کورد و کەرکووك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٤٢.

26 چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز عیسا ئەحمەد بارزانی لە ٢٠/ ٩/ ٢٠٠٢.

شوێنیان دانێت. ئەم دیاردەیە لە دەسپێکی سەردەمی کۆماریشەوە هەبوو، کە ئەمە وایکرد سەرکردایەتی شۆڕش لە ١١/ ١/ ١٩٦٤ بە یاداشتێك ئەم کارەی حکومەتی مەرکەزی رەتبکاتەوە.[٢٧]

هەر لە ماوەی نێوان سالانی ١٩٦٣ - ١٩٦٨ زۆربەی خێزانە ناودارەکانی کوردی کەرکوك، بەهۆی زەبروزەنگی رژێمەکانەوە، شارەکەیان بەجێهێشت، بەزۆری لە بەغدا یان شارەکانی تری کوردستان نیشتەجێ بوون.[٢٨] هەروەها دەرکردنی خێزان و کەسوکاری پێشمەرگە لە ناوچەکانی رێدار، لەیلان، دوبز بە تایبەتی لە سالی ١٩٦٤ بەردەوام بوو.[٢٩] حکومەت هەندێ گوندی ناوچەی شوانی لە بناری چیای خالخالان بۆ جاری دووەم، لە سالانی ١٩٦٤، ١٩٦٥ و بە بیانوی شەرکردنی پێشمەرگە لەگەل هێزی سەربازی دەولەتدا سووتاندن.[٣٠] تا ئەو کاتەی عەبدولرەحمان عارف سەرۆك کۆماری عێراق پایزی ١٩٦٦ سەردانی بارزانی لە کوردستان کرد، نزیکەی (٧٥٠) گوند وێران و نزیکەی (٢٠٠,٠٠٠) لادێنشین ئاوارەببوون.[٣١]

راگوێزراوەکانی کەندیناوە سالی ١٩٦٧ لە ئەنجامی دانوستانی نێوان حکومەت و سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی توانیان بگەڕێنەوە سەر رێوشونی خۆیان و گوندەکانیان ئاوەدان بکەنەوە.[٣٢]

سالی ١٩٦٨ دوای ئەوەی بەعس لە رێگای کودەتایەکی عەسکەرییەوە جارێکی دیکە دەسەلات دەگرێتەوە دەست، ئەو ژمارە

---

27 د.خلیل اسماعیل محمد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.

28 د. رەفیق شوانی، کێشەی بە عەرەبکردنی کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمرۆ، سەنتەری برایەتی، گۆڤارێکی وەرزیی زانستییە، ژمارە ٢٠، هاوینی ٢٠٠١، هەولێر، ل ٢٣١.

29 هەمان سەرچاوە، ل٢٣٠.

30 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

31 دیوويد مك داول، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١٧.

32 یوسف سالح ئیسماعیل، راگواستن لە ناوچەی کەندیناوە: لێکۆلینەوەیەکە لە هۆکار و ئاکامەکانی، گۆڤاری هەولێر، ژمارە ١، هەولێر پایزی ٢٠٠١، ل ٧١.

کەمەی کارمەندە پلە نزمەکان لەوانەش مامۆستاکان و کرێکارەکانی کەرتە جیاوازەکانی دەوڵەت و کرێکارەکانی کۆمپانیای نەوت دەگوازێتەوە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك... ئەو کوردەی کەرکوك بەجێ بهێڵێت لە بەر هەر هۆیەك، مەحاڵە بگەڕێتەوە کەرکوك.[٣٣] ئەم بارە لەدوای رێکەوتنی ئازاریش هەر بەردەوام بوو، بەڵام بە پلانێکی دیراسە کراوەوە.[٣٤]

ساڵی ١٩٦٨ حکومەت دانیشتووانی ١٣ گوندی لە پارێزگای کەرکوك کە نزیك بوون لە بیرە نەوتەکان راگواستن، هەندێ لەو گوندانەش ئەمانە بوون: سۆنەگولی، یارەوڵی، هەنجیرە، قوتان، قوشقایە، شۆراو، باجوان. هەروەها دانیشتووانی گوندەکانی ناحیەی دوبزیش هەر لەو ساڵەدا راگوێزران.[٣٥]

رژێمی بەعس ساڵی ١٩٦٩ حەوت گوند (گولداریاشیتەپە، کیتکا، گورزایی، شانەشین، نابلیئاوای بنار، کەلۆری بنار، دارەمانی بنار)ی لە ناحیەی پردێ سەر بە پارێزگای کەرکوك،[٣٦] و گوندی یارەوڵی لە ناحیەی قەرەهەنجیری هەمان پارێزگا راگواستن.[٣٧] هەر لەو ساڵەدا (١٩٦٩) حکومەتی عێراق لە دوو هێرشی زۆر درندەدا بۆ سەر دوو گوندی دەکان لە ناوچەی شێخان و گوندی سوریا لە ناوچەی زاخۆ. هەردو گەندی سووتاندو ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانەکەیشی کوشتن.[٣٨]

لە سەرەتای حەفتاکاندا، نزیکەی ٧٠ هەزار کوردی فەیلی لە

---

33 د. نوری طالبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.
34 مسعود البارزانی، البارزانی و الحركە التحرريە الكرديە (١٩٥٨-١٩٦١)، كردستان، ١٩٩١، ص ١٢٤.
35 غەفوور مەخمووری، بەعەرەبکردنی کوردستان، چاپخانەی دارا ، باشووری کوردستان، ٢٠٠٣، ل ٣٤.
36 Shorsh , M. Resool, op. cit, pp.33-34.
37 Op. cit, p. 42.
38 المكتب السياسى للحزب الديمقراطى الكردستانى، جرائم القتل العام في كردستان، ١٩٨٦، مطبعة خبات، ١٩٨٦، ص ١١- ١٨.

دانیشتووانی شــارەکانی بــەغدا، بەعقوبــە، میقدادیــە (شــەهربان)، خانــەقین، مــەندەلی، بــەدرە، کــوت و چــەندین شــارۆچکەی دیکــە دەرکران... و لەوێش لەو دیوی سنوور (ئێران) لە ژێــر بــارودۆخێکی سروشتی زۆر دژوار بەجێیان هێشتن. ئەمەش بە نورەی خۆی بووە هــۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر لە منداڵ و پیرەکان بەهۆی برسێتی و ســـەرما و سولەوە دووچاری هیلاکی و مەرگەسات ببنەوە.[٣٩]

لەمیانەی چوار ســاڵی دوای ١٩٧٠ بەشــێکی زۆری موچــەخورانی مەڵبەندی شاری کەرکوك بەهۆی گواستنەوەی ئیــداری یــان هۆکــاری سیاسی بۆ باشوری عێراق یاخود شارەکانی تری کوردستان گوازرانەوە، و خەڵکی تر لە شوێنیان نیشتەجێ کران.[٤٠]

تەنیا لە مــانگی ســێبتەمبەری ســاڵی ١٩٧١ حکومــەتی عــێراق (٥٠,٠٠٠) کوردی فەیلیی بەرەو سنووری ئــێران راپێــچ کــرد.[٤١] لــە سەرچاوەیەکی دیکەشدا هــاتووە کــە دەوڵــەتی عــێراق ســاڵی ١٩٧١ (٥٠.٠٠٠) کەسی لەوانەی بە ئێرانی نــاونووس کرابــوون لــە عــێراق دەرکرد.[٤٢] بەهانەی دەرکردنی فەیلیەکانیش هەمان بەهانە بوو.

د. عەبدوڵڵا غەفوور ناوی چواردە گونــدی نووســیوە کــە هــەر لــە ساڵی ١٩٧٢ ـــەوە حکومەت سەدان خێزانی لێ دەرکردون، کە بریتــین لە حەشیشە، دەڵسی گەورە، دەڵســی بچــووك، کۆمــیر، رەبعــاوە، گــرد رابیعە، عەتشانە، تەل مەغار، ئەرغوون، سێکانی، کەراکرە، کەریمیە،

---

39 د. خەلیل ئیسماعیل محەمــەد، کــوردە فەیلیــەکان و خــەونی گەڕانــەوە بــۆ وڵات، سەنتەری برایەتی، ژمارە ٦، حوزەیرانی ١٩٩٨، هەولێر، ل ١٠٩.

40 ستران عەبدوڵڵا، رازەکانی تەعریب و راگواستن، چاپخانەی روون، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٥٧.

41 دیووید مك داول، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٥.

42 دکتر جنگیز پهلوان، تحرکات جمعیتــی در حــوزه تمــدن ایرانــی، اطلاعــات سیاســی-اقتصادی، شماره ١٢٤_١٢٣، سال دوازدهم، تهران، اذر و دی ١٣٧٦ ،ص ١٤٨.

و سەی محەمەد.[٤٣]

ساڵی ١٩٧٢ لە ناحیەی داقوقی سەر بە پارێزگای سەلاحەدین، چوار گوندی ئەبو سەراج، چاورگە، مەتارە، ئەبولاگەنین بۆ چەمچەماڵ وسێپاراتە راگوێزران.[٤٤]

ساڵی ١٩٧٣ حکومەت بە جارێك ١١٨ کرێکاری کوردی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دەرکرد و لە جیاتی ئەوان کرێکاری ناشارەزای عەرەبی هێنان و لە کەرکوکدا نیشتەجێی کردن.[٤٥] هەر لە کەرکوك حکومەت ساڵی ١٩٧٣ (٥٠٠) کرێکاری کورد و ساڵی ١٩٧٤ (٥٦٠) کرێکاری دیکەی لەوانەی لە پیشەسازی نەوتدا کاریان دەکرد گواستنەوە.[٤٦]

لە چواری ئەیلوولی ١٩٧٤، خەڵکی ٢٤ گوندی زمار کەوتنە بەر پەلاماری حکومەت و بەبێ ئاگادارییەکی لە پێشینە بۆ خوارووی پارێزگای مووسڵ راگوێزران، ئەم خەڵکە راگوێزراوە نەیانتوانی هیچ شتێکی وەها لەگەڵ خۆیان بەرن و هەر چوار پێنج خێزانێکیان بەسەر گوندێکی عەرەبنشیندا دابەشکردن. ئەوانەی توانیان هەڵبێن یان چوون بۆ سوریا یان بۆ ناو پێشمەرگە و ئێستا لە شوێنەکانی دیکە وەك زاخۆ، دهۆك، ئیبراهیم خەلیل، فیشخابوور، باعەدرێ نیشتەجێن.[٤٧] دانیشتووانی ئەم گوندانە سەر بە عەشرەتەکانی

---

43 د. عەبدوڵڵا غەفوور، ئەتنو ـ دیمۆگرافیای باشووری کوردستان، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠١، ل ٣٧.

44 Shorsh. M. Resool,op.cit, p.25.

45 ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٢.

46 المکتب السیاسی للحزب الدیمقراطی الکردستانی ـ العراق، التهجیر سلاح بید النظام العراقي الفاشي لمحاربة الثورة الکردیة، دون مکان الطبع و سنة الطبع. ص ٧.

47 ئەکرەم هەسنی، خەڵکی شنگال و زمار، هەفتەنامەی گولان، ساڵی نۆیەم، ژمارە٤٠٠، ئەیلوولی ٢٠٠٢، هەولێر، ل ٢٥.

هەسنیان، مووس رەش، میران بوون.[٤٨]
هەر لە ساڵی ١٩٧٤ کاتێك کە شۆڕشی کورد دەستی پێکردەوە، کوردەکانی نزیکەی ١٠ کیلۆمەتری ناوچە شاخاوییەکانی شنگار راگوێزران.[٤٩]

## قۆناغی دووەم: ١٩٧٥-١٩٩٠

ئەم قۆناغە مەترسیدارترین قۆناغ بوو، بەعس لەم قۆناغەدا بە لوتکەی دڕندایەتی خۆی گەیشت. سەرباری هەموو تاوانەکانی دیکە (کیمیاباران، ئەنفال، رەشبگیری و...) سیاسەتی راگواستنی کوردەکانیش گەیشتە چلەپۆپە، زۆرترین خاکی کوردستانی باشور لە مرۆڤەکان چۆل کراو بە ناوچەی قەدەغەکراو لەقەڵەم درا. بێگومان ئەگەر راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ نەبوایە، ئەوا ناوچە قەدەغەکراوەکان زۆرترین پانتایی کوردستانی خواروویان دەگرتەوە.

هەر لەدوای نسکۆی ١٩٧٥ەوە جێگری سەرۆکی عێراق *سەدام حوسێن* بێ پەروا رایگەیاند کەوا مەبەستی راگواستنی کوردەکانی سەر سنوورەکانی ئێران و تورکیای هەیە. لێرەشدا ئەو گومانەی نەهێشتەوە کە تەنیا مەبەستی لەناوبردنی شۆڕش بێت، بەڵکو مەسەلەکە بێ دانیشتووانکردنی هەزارەها کیلۆمەتر زەوی و پێکهێنانی ناوچەیەکی قەدەغەکراو بوو کە هەرچی تێدایە دەسگیر دەکرێ و یەکسەر لەناو دەبرێ.[٥٠]

---

48 د. رزگار، ملحمة عين زالة في ذاكرة البيشمركه ، مطبعة كلية الشريعة، دهوك ١٩٩٧، ص ١٨.

49 خەسرۆ گۆران، بوونی کورد لە پارێزگای مووسڵ، سەنتەری برایەتی، ژمارە ١٣، هەولێر ئەیلوولی ١٩٩٩، ل ٤٨.

50 فەرید ئەسەسەرد، کوردستان و مەسەلەکانی ئەمنی قەومی، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١١٠.

بەڵام کۆچی زۆرەملێی کوردان (ڕاگواستن) بەر لەوەی سەدام بە کردەوە دەستی پێ بکات، بە گەورەترین قەبارەوە لەگەڵ نسکۆی شۆڕش ساڵی ١٩٧٥ دەستی پێکرد. نزیکەی نیو ملیۆن کوردی عێراق بە ناچاری پەنایان بردە بەر وڵاتی ئێران، ئەم خەڵکە لەلایەن دوڵەتی ئێرانەوە مافی پەناهەندەییان پێ نەدراو هیچ ڕێکخراوێکی UN لەوانی نەپێچایەوە. دەوڵەتی ئێرانیش ئەوانی بۆ ناوەوەی خاکی ئێران گوازتەوە و لە ((ئوردووگاکانی)) ژێر چاودێری سەربازیدا نیشتەجێ کردن.[٥١] *دەیڤد ماکدوێل* ژمارەی کوردە دەربەدەربووەکان بۆ ئێران بە ٦٠٠ هەزار مەزەندە دەکات.[٥٢] لەبەرئەوەی دەربەدەربووەکان بەسەربەرفرەوانترین ڕووبەردا دابەشکران، دووچاری گەورەترین دەردەسەری هاتن. هەر بۆیەش ژمارەیەکی زۆریان بە ناچاری بەرەو عێراق گەڕانەوە، ناوبراو پێی وایە تەنیا (٧٠,٠٠٠) کورد لە ئێران مانەوە، ئەوانی دیکە هەموویان گەڕانەوە عێراق.[٥٣] بەڵام لە سەرچاوەی دیکەدا هاتووە کە (١٨٠,٠٠٠) کەس مکووربوون لە هەڵبژاردنی چارەنووسێکی نادیار و داهاتوویەکی شاراوە بە مانەوەیان لە ئێران.[٥٤] هەندێك لە گەڕاوەکان لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە بزرکران و ئەوانی دیکە هەموویان یەکسەر بۆ ناوچەکانی خوارووی عێراق گوێزرانەوە.[٥٥] بەڵام حکومەت تەنیا بەمەندە نەوەستا، بەڵکو هەر لەو ساڵەدا دەستی

---

51 د. جاسم تۆفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد و یاسای نێو دەوڵەتان، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٢٧٩.

52 دیڤد ماکدویل، کورد امة محرومة، ت: د. رزگار و محمد یوسف، مطبعة خبات، دهوك، ١٩٩٦، ص ١١٢.

53 دیووید مك داول، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣٠.

54 مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، الجزء الثالث ١٩٦١-١٩٧٥، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل،٢٠٠٢،ص ٣٩٩.

55 د. جاسم تۆفیق خۆشناو، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

به راگواستنی لادێنشینەکانی سەر سنوورەکان کرد. لە پایزی ئەو ساڵەدا دانیشتووانی زیتر لە ٧٦ گوند لە ناوچەی بارزان کە دانیشتووی گوندەکانی هەر سێ عەشرەتی بەرۆژی، نزاری، هەرکی بنەجی و هەندێك لە گوندەکانی عەشرەتەکانی مزووری و شێروانی دەگرتنەوە، راگواستن بۆ خوارووی عێراق (پارێزگای دیوانیە)[٥٦]. بەڵام حکومەت تەنیا بە راگواستنی لادێنشینەکانی سەر سنوورەکان دانەکەوت، بەڵکو هەر لەو ساڵەدا لە پارێزگای دیالە (قەزای خانەقین) دانیشتووانی ٢٦ گوندی بۆ باشوری عێراق راگواست. لە ناحیەی جەلەولاش دانیشتووانی ١٤ گوندی بۆ باشوری عێراق گواستنەوە، بەڵام لە ناحیەی قۆرەتو ژمارەی گوندە راگوێزراوەکان گەیشتە ٦٨ گوند، زۆربەی دانیشتووانی ئەم گوندانە بۆ کەلار و بەشێکیشیان بۆ باشوری عێراق گوێزرانەوە، تەنیا گوندی سیاولە نەبێت کە ژمارەی خێزانەکانی ٤٢ سەر خێزان بوو، بۆ دەربەندیخان - تاسلوجە گوێزرایەوە. لە ناحیەی مەیدانیش دانیشتووانی ئەو ٤٢ گوندەی کە هەر لەو ساڵەدا راگوێزران هەموویان لە دەربەندیخان - تاسلوجە نیشتەجێ کران.[٥٧]

بەڵام سەبارەت بە پارێزگای کەرکوك هەر لە ساڵی ١٩٧٥ حکومەت دانیشتووانی ١٣ گوندی ناحیەی سەرگۆران (قودس)ی بۆ دبس گواستنەوە.[٥٨]

هەروەها هەر لە هەمان ساڵدا حکومەت لە قەزای سلێمانی دوو گوندی جەولك و تەپەشوانکارەی راگواستن،[٥٩] و لە قەزای هەڵەبجە

---

56 چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕێکار مزووری لە ٢٠٠٣/١/٢٨ لە ناحیەی بەحرکە.
57 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 14 - 21.
58 Ibid, pp. 35 - 36
59 Ibid, p. 143.

ناحیەی سیروانیش گوندی ((تەوەنەیال))ی گواستەوە.[٦٠]

لە پارێزگای دهۆك ، لەو ساڵەدا (١٩٧٥) حکومەت سیاسەتی ڕاگواستنی کوردەکانی تەنیا لە قەزای سێمێل پیادە کرد، ٦١ گوندی لە ناحیەی سلیڤانە ڕاگواستن و بەعەرەبکردن. و ٧ گوندیش لە ناحیەی ناوەند و تەنیا سێ گوندیش لە ناحیەی فەیدیە بەر ئەو شاڵاوە کەوتن.[٦١]

لە پارێزگای مووسڵ (نەینەوا) لە ساڵی ١٩٧٥ دا گەورەترین هەڵمەتی ڕاگواستنی کورد بە هەمان شێوەی پارێزگای دیالا دەستی پێکرد، لە قەزای شنگار ١٤٦ گوند لە هەر سێ ناحیەی ناوەند، شیمال و قەیرەوان ڕاگوێزران،[٦٢] و لە ١٢ ئوردووگای نوێدا نیشتەجێ کران، هەموو ئەو گوندانەش بە عەرەب کران، دانیشتووانی ١٣٢ گوند لەم گوندانە کوردە ئێزدییەکان بوون.[٦٣] لە شارۆچکەی شنگاریش شەش گەڕەکی بۆرج، کالا، بەرسی، بەر بەرۆژ، کۆراستی، سەرا خاپوور کران.[٦٤]

لە قەزای شێخانیش هەر لە ساڵی ١٩٧٥ دا ١٠٢ گوند ڕاگوێزران، ٤٧ گوند لە ناحیەی ناوەند، ٤٠ گوند لە ناحیەی ئەرتوش و لە ناحیەی مرێباش ١٥ گوند ڕاگوێزران.[٦٥]

هەر لە هەمان ساڵیش ٣٩ گوندی ناحیەی زمار لە قەزای تەلەعفەر، ڕاگوێزران.[٦٦] لە ناو شاری مووسڵ حکومەت هەر لەو هەڵبجە بەندەدا هەڵمەتێکی دەست پێکرد و ژمارەیەکی زۆری خێزانە

---

60 Ibid, p.

61 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 190 – 196.

62 شیخ حجی سمو الشنگالی، لمحة عن سنجار، مجلة لالش، العدد ١١، اب ١٩٩٩، دهوك، ص ٥٦.

63 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp.199 - 253.

64 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.

64 Shorsh, M. Resool, op.cit. pp. 201 - 202.

66 خەسرۆ گۆران، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

کوردەکانی بە دوای گوندنشینەکاندا ڕەوانەی خوارووی عێراقی کردن.[67] لە شارۆچکەی شێخانیش نزیکەی ٢٠٠ خێزان ڕاگوێزران.[68] هەروەها لە ناوچەی شنگار حکومەتی عێراق دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ ، خێزانی ١٥٠٠ لەو شۆڕشگێڕانەی کە بەشدارییان لە شۆڕشدا کردبوو، بە زۆرەملێ بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی (زاخۆ، دهۆك، هەولێر) ڕاگواستن.[69] هەروەها نزیکەی ٢٠٠ خێزانی لە عەشرەتی گەرگەری کە تاکە عەشرەتی کوردییە لە ناوچەی زمار ڕانەگوێزرایە، بۆ گوندەکانی عەشرەتی گۆران لە ناحیەی بەردەڕەش ڕاگواستن، بەڵام ساڵی ١٩٨٠ هەموویان گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، چونکە ئەو عەشرەتە (گەرگەری) بە عەرەب ناونووسکرا.[70]

هەر لەو ساڵەدا ڕژێمی عێراق ٦٣ گوندی ناحیەی سورداشی جارێکی تر سوتاند کە لە ساڵی ١٩٦٣ بە دەستی سوپای عێراق سووتێندرا بوون و خەڵکی ڕەشوڕووتی ئەو گوندانەی ئاوارە کردەوە.[71]

بەم جۆرە دەبینین تاکە هۆی ڕاگواستنی کوردان بە لادێنشین و شارنشینەکانەوە تەنیا کوردبوون بوو. هەموو پاساوەکانی تری ڕژێم دەکرێ وەلابنرێن، چونکە گریمان خەڵکی ناوچەی بارزان لەبەر هاریکاریکردنی شۆڕشگێڕان، گوندەکانی لای خانەقین لەبەر هاوسنووریان لەگەڵ ئێران و ناوچەی شنگار لەبەر هاوسنووری لەگەڵ

---

67 چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ئەیوب محەمەد، دانیشتووی شاری مووسڵ لە ٢٠/١٠/٢٠٠٢.

68 چاوپێکەوتن لەگەل بەڕێز عەدنان ئێزدی، دانیشتووی شاری دهۆك لە ١٠/١٠/٢٠٠٢.

69 خەسرۆ گۆران، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.

70 هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

71 Shorsh M. Resool, op.cit, pp109-111.

دەوڵەتی سوریادا راگوێزران، ئەی راگواستنی هەموو ئەوانی تر بۆچی و لەپای چی؟

ژمارەی ئەو کوردانەی کە بۆ باشووری عێراق راگوێزران، بەپێی رۆژنامەی ((الثورة)) ئۆرگانی حزبی بەعس لە ١٩٧٨، تەنها لە ماوەی دوو مانگدا لە ساڵی ١٩٧٦ بۆ شوێنە دوورەکانی باشور و ناوەڕاستی عێراق ١٥٠ هەزار کورد بوون.[٧٢] لە سەرچاوەیەکی دیکەدا *عەبدولکەریم بەرزنجی* کە لە هەشتاکاندا پارێزگاری سلێمانی بوو، دانی بە راگواستنی ٣٠٠ هەزار کورددا نا کە ئاژانسەکە خۆی ئەو شوێنانەی بە بیابان و شوێنی وشك و برینگ و خاڵی لە دار و دەوەن و هەروەها ژێر چاودێری رژێم ناوزەدکرد.[٧٣]

ئەو کوردە راگوێزراوانە بۆ باشوری عێراق تا ساڵی ١٩٧٦ کە ژمارەیان خۆی لە ٣٠٠ هەزار دەدا حکومەت بارزانییەکانی لێ ریزپەڕ کردن و رێی بە هەموو ئەوانی دیکە دا بگەڕێنەوە ناوچە کوردنشینەکان، بەمەش پێویست بوو تەنیا بارزانییەکان لە خوارووی عێراقدا بمابانەوە، بەڵام ئۆپۆزیسیۆنی کوردی هەمیشە جەختی لەسەر مانەوەی ٢٥٠ هەزار کورد لە باشوری عێراقدا کردووە.[٧٤] لە ساڵانی ١٩٧٧ ـ ١٩٧٨ بە پێی خاڵەکانی رێکەوتننامەی ساڵی ١٩٧٥ی جەزایر، عێراق دەستی بە دانانی پشتێنەیەکی ئاسایشی کرد بە درێژایی سنوورەکانی باکوریدا، ئەم پشتێنەیە سەرەتا مەوداکەی ٥ کم

---

72 هەژار عەزیز سورمێ، کورد و جینۆساید و ئیبادەکردن: هەڵوێستی نێودەوڵەتی، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٨٨، ل ٧٠.

73 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

74 أ. کاوە، قضیة کوردستان الجنوبیة و الافاق المستقبلیة، اعلام حزب کادحي کردستان، ط ١، ١٩٩٠، ص ١١٣.

بوو، پاشان بوو به ١٠ كم و ئینجا ١٥ كم و دواجاریش ٣٠ كم.[٧٥] ئەم پشتێنەیە لە ناوچەی پشتەی سەر بە ناحیەی سیروانی قەزای هەڵەبجەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە رووباری خابوور لە قەزای زاخۆ. ئەو ناوچانەی بە هۆی هاوسنووریان لەگەڵ ئێران و تورکیا لەو ماوەیەدا راگوێزران بریتی بوون لە: قەزاکانی هەڵەبجە، پێنجوین، شارباژێر، دوکان و پشدەر لە پارێزگای سلێمانی. قەزاکانی چۆمان، رەواندز و زێبار لە پارێزگای هەولێر، و قەزاکانی ئامێدی و زاخۆ لە پارێزگای دهۆك.[٧٦]

لە قەزای چۆمان (پارێزگای هەولێر) دانیشتووانی ٣٨ گوند کە زۆربەیان خەڵکی هەردوو دۆڵی باڵەیان و سەکرایەتی بوون و دوو گوندیش لە دۆڵی شێوە زۆرایەتی و سێ گوندیش لە ناوچەی مەلا شەرەفیان لە ساڵی ١٩٧٧دا راگوێزران. ساڵی ١٩٧٨ دانیشتووانی ٣٠ گوند لە هەریەك لە دۆڵەکانی شێوە زۆرایەتی و روستێ راگوێزران، زۆربەی خەڵکی ئەم ٦٨ گوندانە بۆ دەوروبەری شاری هەولێر و ژمارەیەکی زۆریشیان بۆ پارێزگای دهۆك و هەندێکیش بۆ دەڤەری رانیە و بەشێکیشیان بۆ شارۆچکەی چۆمان راگوێزران.[٧٧]

بەپێی سەرچاوەیەك ساڵی ١٩٧٨ تەنیا لەماوەی مانگێکدا دانیشتووانی ٤٩٢ گوند راگوێزران.[٧٨]

سەبارەت بە قەزای مێرگەسوور ئەوا دانیشتووانی زۆربەی هەرە

---

75 میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

76 ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٨.

77 خالد ئەحمەد وەرتی، باڵەکایەتی لە پەراوێزی راگواستندا، هەولێر، ژمارە ٢، هەولێر، بەهاری ١٩٩٩، ل ١٥٢-١٥٣.

78 التهجير سلاح بيد النظام العراقي الفاشي لمحاربة الثورة الكردية، هەمان سەرچاوە، ل ١٢.

زۆری گوندەکانی ساڵی ١٩٧٨ راگوێزران بەم شـێوەیە: ٧٤ گونـد لـە ناحیەی شێروان مەزن کە گوندەکـانی هەرسـێ عەشـرەتی مـزووری، شێروانی و گەردی بوون و ٢٦ گوند لە ناحیەی پیران کە زۆربەیان سەر بە عەشرەتی شێروانی و هەندێك لەو گوندانە هی عەشرەتی برادوسـت بوون، دانیشتووانی ئـەم دەڤـەرە بـۆ ئوردووگاکـانی دیانـە، حـەریر و ئوردووگاکـانی دەوروبـەری شـاری هـەولێر وەك بەحرکـــە، پـــیرزین، کەسنەزان راگوێزران.[٧٩]

هەروەها ساڵی ١٩٧٨، دەوروبەری ١٢٨ گوند لە ناحیەی سیدەکان کە سەر بە قەزای مێرگەسوور بون راگوێزران.[٨٠]

سەبارەت بە پارێزگای سلێمانی، ساڵی ١٩٧٨ لە قەزای پێنجویـــن لە ناحیەی نالپارێز دانیشتووانی ٣٤ گوند و لە ناحیەی ناوەندیش ٢١ گونـد راگوێـزران، بـەڵام زۆرتریـن گوندەکـان لـە ناحیـەی گـــەرمك راگوێزران کە ژمارەیان دەکردە ٨٥ گوند وێرای نـــاوەندی ناحیەکـەش، دانیشتووانی هەموو ئەم گوندانە بۆ ئوردووگاکـانی نەسـر و برایـەتی هەروەها نزیك شاری سلێمانی راگوێزران.[٨١]

لە قەزای دوکان تێکڕا لە ســاڵی ١٩٧٨دا ١٣ گونـد راگوێـزران، گوندی گوێزە لە ناحیەی سورداش و ١٢ گوندیش لە ناحیەی بنگرد.[٨٢] رژێمی بەعس ساڵی ١٩٧٧ لە ناحیەی ناودەشت کە ســەر بـە قـەزای قەڵادزێیە دانیشتووانی ٢٦ گوندی بۆ نزیك هەردوو شـــاری هـەولێر و رانیە راگواست، و لە ســاڵی ١٩٧٨ هـەر لـەو ناحیەیـە ١٣ گونـدی

79 چاوپێکەوتن لەگەڵ رێکار مزووری لە ٢٨/١/٢٠٠٣ لە ناحیەی بەحرکە.

80 چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز یادگار رەسووڵ باڵەکی لە ٢٦/١/٢٠٠٣.

81 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 104 – 107.

82 ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٧.

تریشی بۆ نزیك شاری رانیه راگواست[٨٣] و له ناحیـەی هـێرۆی قـەزای قەلادزێش سالی ١٩٧٨ ، ٣٥ گوند له هەردوو مانگی تەمووز و ئـاب راگوێزران، هەندێکیان بۆ نزیك شـاری هـەولێر و ئـەوانی دیکـە بـۆ ئوردووگاکانی هەمان دەڤەر خۆی.[٨٤] له ناحیەی ناوەندیش، ٣٤ گونـد له سالی ١٩٧٨ له مانگەکانی نیسان و تەمووز راگوێـزران.[٨٥] و سـێ گوند (کاستانا، دۆلەدزه، خرابوردان)ی ئەو ناحیەیـە بـۆ ئوردووگـای پێمالك راگوێزران.[٨٦]

له قەزای دەربەندیخانیش هەر لەو سالەدا هەردوو گونـدی تـوون و کانیخان که دەکەونه سنووری ناحیەی زەرایەن راگوێزران.[٨٧] له قـەزای هەلەبجەش ژمارەیەکی زۆری گوندەکان له سالەکانی ١٩٧٨ـ١٩٧٩ دا راگوێزران بەم جۆره: لـه ناحیـەی خۆرمـال ٣٤ گونـد و لـه ناحیـەی سیروان ٧٢ گونـد.[٨٨] لـه ناحیـەی بیـارەی سـەر بـه هـەمان قـەزاش دانیشتووانی ٢٣ گونـد لـه سـالی ١٩٧٨ ، بـۆ ئوردووگـای باینجـان راگوێزران،[٨٩] تەنیا هەندێك له خێزانەکانی گوندی خارگێلان لـە نـاو ئـەو گوندانـەدا بـەرەو سـنووری ئـێران بـەرێ خـران.[٩٠] لـه ناحیـەی شـارەزووریش کـە مەرکەزەکـەی ((سـەید سـادق))ه، ١٤ گونـد راگوێزران.[٩١]

---

83 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 116 – 118.
84 Ibid, pp. 120 – 121.
85 Ibid, pp. 122-123.
86 Ibid, p. 124.
87 Shorsh, M. Resool, op. cit, p. 139.
88 ئەمین قادر مینه، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٩ - ٣١١.
89 هەمان سەرچاوه، ل ٣١١.
90 Shorsh, M. Resool, op. cit, p.158.
91 ئەمین قادر مینه، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٢.

دوا قەزاش لە پارێزگای سلێمانی قەزای چوارتایە، لەو قەزایەدا ڕاگواستن تەنیا ناحیەی کارێزەی گرتەوە، کە ٣٧ گوندی ئەو ناحیەیە لە مانگی ئەیلوولی ١٩٧٨ بۆ ئوردوگاکانی کارێزە و سەرقەڵا ڕاگوێزران.[٩٢]

سێیەم پارێزگاش پارێزگای دهۆکە کە لە هەمان ئەو هەڵمەتەدا واتە لە ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩دا گوندگەلێکی زۆری لێ ڕاگوێزران. لە قەزای زاخۆ لە ساڵی ١٩٧٧، ٥١ گوند لە دوو ناحیەی سندی و گولی ڕاگوێزران،[٩٣] لە قەزای ئامێدیش ١٥٦ گوند لە ساڵی ١٩٧٨ ڕاگوێزران، ٩٦ گوند لە ناحیەی نێروەڕێکان و ٦٠ گوندیش لە ناحیەی بەرواری باڵا.[٩٤]

تا سەرەتای ١٩٧٩ ژمارەی خەڵکە ڕاگوێزراوەکە خۆی لە ٧٠٠ هەزار کەسدا، هەروەها ١٢٢٢ گوندیش لەماوەی نێوان ١٩٧٦ـ١٩٧٩ وێران کران.[٩٥] لە سەرچاوەیەکی دیکەدا هاتووە ژمارەی گوندە خاپوورکراوەکان تا ساڵی ١٩٧٨ گەیشتە ١٤٠٠ گوند.[٩٦] لە بەڵگەنامەیەکیشدا کە سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵی ١٩٨٥ پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی کرد، هاتووە کەوا لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٥ـ١٩٧٩، ٢٠٠٠ گوندی کوردان خاپوورکراون.[٩٧]

---

92 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 160 - 162.

93 ئەمین قادر مینە، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٧ - ٣٢٨.

94 هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٩ـ٢٣٠.

95 زیاد عەبدولرەحمان، تونی مەرگ، چاپی یەکەم، تەورێز، ١٩٩٥، ل ٦.

96 دیوید مك داول، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢٩.

97 أ.پ، عن التعلیم في کردستان العراق، مطبعة خبات، دون مکان الطبع، ١٩٨٦، ص ٦٧.

هەموو ئەوانەی لەم سێ ساڵانەدا (١٩٧٧، ١٩٧٨ و ١٩٧٩) ڕاگوێزران هەر وەك بینیمان دانیشتووانی سەرسنوورەکان بوون. و ڕەنگە دیارترین هۆکاریش سەرهەڵدانەوەی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بێت لەو ماوەیەدا و لەو سەر سنوورانەدا، هەروەها جیاوازییەکی تری ئەم قۆناغەی ڕاگواستنیش ئەوەیە کە هەموو ڕاگوێزراوەکان لە ناوچە کوردنشینەکاندا لە ناو چەند ئوردووگایەکی پێشتر ئامادەکراودا نیشتەجێ کران، لەلایەکی تریشەوە هەمویان بە جۆرێك لە جۆرەکان بە بڕێك پارە کە پێی دەگوترا "قەرەبووکرانەوە" (التعویض). ئەم بڕە پارەیە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە یاخود لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر جیاواز بوو، زۆری و کەمی ئەو بڕە پارەیە لەسەر ئارەزوو هەوەسی ئەو کارمەندانەی میری کە بەم ناونووسکردنە هەڵدەستان، دەوەستا.

سیاسەتی ڕاگواستن تایبەت نەبوو بە گوند و شارۆچکەکانەوە، هەروەها تەنیا بەو کوردانەی کە لە ناوچە کوردنشینەکان نیشتەجێن، بەڵکو مەبەست کورد بوو لە هەر خاڵێکی عێراقدا بێت. بۆیەش حکومەت هەموو هەلێکی دەقوزتەوە. لە ٧ی نیسانی ١٩٨٠ دوای ماوەیەکی کەم لە هاتنە سەر کاری *سەدام حوسێن*، ڕژێم ڕووداوی هەوڵی تیرۆرکردنی *تاریق عەزیزی* لە زانکۆی موستەنسرییە قوزتەوە و شاڵاوێکی گەورەی دژ بە کوردە فەیلییەکان دەست پێ کرد، لەو شاڵاوەدا ڕژێم لە ناوچەکانی عەلی غەربی، ئەلکمیت، ئەلحەی، ئەلنوعمانییە، لە پایتەخت و ناوەڕاست و باشووری عێراقدا دەستی کرد بە دەرکردنیان.[٩٨] نزیکەی ١٢٠ هەزار کەسی لێیان بۆ ئەو بەری

98 ستران عەبدوڵڵا، ڕازەکانی تەعریب و ئەنفال، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی ١٩٩٩، ل ٥٣.

سنوور بەلای ئێراندا راگواستن، گەنجەکانیشیان گلدانەوە و تا ئێستاش چارەنووسی ژمارەیەکی زۆریان دیارنییە.[٩٩]

د. *جاسم تۆفیق* پێی وایە ژمارەی ئەو کوردە فەیلیانەی لە نێوان ١٩٨٠ـ ١٩٨٨ دەرکراون ٢٧٠ هەزار کەسە.[١٠٠]

هەر لە ساڵی ١٩٨٠ حکومەت گوندی تەوێڵە و گوندی پەڵخەی لە ناحیەی بیارە بۆ ئوردووگاکانی نەسر و برایەتی راگواستن، شایانی باسە ئەو کات ژمارەی خێزانەکان لە گوندی تەوێلە خۆی لە ٢٠٠٠ خێزان دەدا. لە ناحیەی خۆرماڵیش حکومەت سێ گوندی راگواستن.[١٠١]

لە ساڵی ١٩٨١ حکومەت ناحیەی بیارەی راگواست.[١٠٢] لە ناحیەی ((تەقتەق))یش دوو گوند راگوێزران.[١٠٣] لە ناوچەی باڵەکایەتیشدا گوندی گەلاڵەی بۆ دەشتی دیانا کە هەر لەوێ ئوردووگایەکی بۆ دروست کردن بە ناوی ئوردووگای گەلاڵە، راگواست.[١٠٤] لە ناحیەی گوێڕیش گوندی ((میل))ی راگواست، هەروەها لە ناحیەی مەخموریش گوندی کاولەگورەباشە،[١٠٥] لەناحیەی ناوەندیش دوو گوند راگوێزران.[١٠٦] لە ناحیەی دەربەنیخانیش گوندی فەقوژینە راگوێزرا.[١٠٧]

بەپێی سەرچاوەیەك ساڵی ١٩٨٠، نزیکەی ٢٥,٠٠٠ کوردی

---

99 د. خلیل اسماعیل، هەمان سەرچاوە، ل ٢٠

100 دکتور جاسم تۆفیق خۆشناو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٢.

101 Shorsh, M. Resool, op. cit, p 158.

102 Ibid, p 158

03 Ibid p. 82

104 خالید ئەحمەد وەرتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٨.

105 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 72- 74.

106 Ibid, p. 82.

107 Ibid, p. 137.

عێراق لەبەر شەڕ و پێکدادانەکانی ناوچەی کوردستان ئاوارەی تورکیا بوون، کاربەدەستانی ئەو وڵاتەش بەرەو سنووری ئێران بەڕێی کردن.[108]

لە ١٩٨١/١٠/٢٠ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بە سەرۆکایەتی *سەدام حوسێن*، بڕیاری ژمارە ١٣٩١ی بە مەبەستی ڕاگواستنی کوردان دەرکرد، کە بەندی سێزدە دەڵێ: لە قۆناغی یەکەمدا گواستنەوەی فەرمانبەر و کرێکارانی پارێزگای کەرکوك، لە پێشەوە تورکمانەکان و دوایی کوردەکان ئەنجامدەدرێت.[109]

لە ١٩٨٢/١/١، ناحیەی شێروان مەزن و گوندی کرکەمو لە ناوچەی بارزان بۆ ئوردووگای سێبیران لە نزیك شاری هەولێر ڕاگوێزران.[110] هەر لەو ساڵەدا لە ناحیەی قوشتەپە گوندی تۆپزاوە، هەروەها گوندی دەرەلە لە ناحیەی خەبات قەزای هەولێر ڕاگوێزران.[111] هەمدیس پێویستە لە بیری نەکەین کە لە ماوەی نێوان ١٩٨٠ـ١٩٨٧ بە هەزاران خێزانی کورد لە ئوردووگا زۆرەملێکان و گوند و شار و شارۆچکە کوردییەکانەوە بۆ ناوچە قەدەغەکراوەکان و وڵاتی ئێران کە بەداخەوە لە هیچ یەکێك لەو نووسینانەی لەبارەی ڕاگواستنەوە نووسراون بەرچاومان نەکەوتووە کەسێك ئاماژەی پێ کرد بێت، هۆیەکەش ڕەنگە ئەوە بێت، کە ڕاگواستنەکە ڕاستەوخۆ نەبوو، بەڵکو خەڵکی لە ئەنجامی مامەڵەی ناخۆش و ڕەفتاری دوژمنکارانەی حکومەتەوە کۆچیان دەکرد.

دوای ئەوەی دەبینین ساڵی ١٩٨٢ ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکان بۆ کەمترین ئاست کەم دەبێتەوە، ساڵی ١٩٨٣ جارێکی دیکە کێرڤی

---

108 د. جنگیز پهلوان، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٩.

109 د. جاسم تۆفیق خۆشناو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٤- ٣٠٥.

110 چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕێکار مزووری لە ٢٠٠٣/١/٢٩.

111 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp.57-59

راگواستن هەڵدەكشێت و تەنیا لە ناوچەی باڵەكایەتی دانیشتووانی ٢٤ گوند وێڕای شارۆچكەی چۆمان رادەگوێزرێن.[١١٢] هەروەها لە ناحیەی شوان( رێدار) گوندی دویزین،[١١٣] و لە ناحیەی رەواندزیش گوندی بەرسیرین راگوێزران.[١١٤] لە ناحیەی دیبەگەش گوندی خەساو بەر ئەو شاڵاوە كەوت.[١١٥]

لە پارێزگای سلێمانیش لە ناحیەی ناڵپارێزی سەر بە قەزای پێنجوین ١٣ گوند راگوێزران، هەر لە دەڤەری پێنجوین حكومەت شارۆچكەی پێنجوین و گوندی عەلیاوای سەر بە هەمان قەزای راگواست.[١١٦]

هەر ساڵی ١٩٨٤ حكومەت ١٤٥٠ خێزانی كوردی لە شاری كەركوك راگواست.[١١٧]

هەروەها لە پارێزگای نەینەوا، شارۆچكەی زمار بە چوار گوندەوە ژێر ئاوی بەنداوی مووسڵ كەوت، ناحیەكەش گوێزرایەوە ناوچەی گەرگەری.[١١٨]

ساڵی ١٩٨٤ لە ناوچەی باڵەكایەتی ٩ گوندی دۆڵی رۆست، هەندێكیان بۆ قوشتەپە و ئەوانی تر هەموویان بۆ پارێزگای دهۆك راگوێزران.[١١٩] بەپێچەوانەی ساڵەكانی ٨٣ـ٨٤ دەبینین لە ساڵی ١٩٨٥بەدواوە، بەعس زێتر هەوڵی رووخاندنی گوندەكان دەدات، ساڵی

---

112 خالید ئەحمەد وەرتی، سەرچاوەی پێشوو.

113 Shorsh, M. Resool, op. cit,, p.83

114 lbid, p.44.

115 Ibid, p .77.

116 Ibid, pp. 100-101.

117 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

118 ئەكرەم هەسنی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥.

119 خالید ئەحمەد وەرتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٣.

١٩٨٥ تەنیا لە پارێزگای هەولێر دانیشتووانی گوندێکی زۆر ڕاگوێزران بەم شێوەیە: ٣١ گوند لە قەزای شەقلاوە، ٢٣ گوند لە ناحیەی سەلاحەدین و ئەوانی دیکە لە ناحیەی خۆشناوەتی.[120] لە ناحیەی قوشتەپەش ٧ گوند. لە قەزای مەخموریش ٢٠ گوند[121]. لە قەزای کۆیە ١٧ گوند، لە ناحیەی شۆڕش و خەباتیش هەریەکە و گوندێك.[122] لە ناحیەی ڕەواندز و ناوچەی مێرگەسووریش هەریەکە و دوو گوند.[123]

لە پارێزگای سلێمانیش ١٣٠ گوندی خاپوورکران. ٤٥ گوند لە قەزای دوکان.[124] لە قەزای دەربندیخانیش چوار گوند، سێیان لە ناحیەی ناوەند و چوارەمیشیان لە ناحیەی زەرایەن.[125] هەروەها لە قەزای ناوەندی سلێمانیش سێ گوند، لە ناحیەی قەرەداغ دوو گوند و لە ناحیەی خۆرمالێش گوندێك بە ناوی ناوگردان.[126] لە قەزای چەمچەمال ١٣ گوند. لە ناوچەی چوارتا ١٦ گوند . قەزای ڕانیە ١٨ گوند چەندین گوندی دیکە لە ناوچەکانی کەلار و هەڵەبجە.[127]

لە پارێزگای کەرکوکیش نزیکەی ٣٥ گوند، ١١ گوند لە ناحیەی تووزخورماتوو، ئەوانی دیکە لە ناحیەی شوان و ناوچەکانی دیکەی ئەو پارێزگایە.[128]

---

120 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 65-66, 68.

121 أ. پ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٥ـ٦٦.

122 هەمان سەرچاوە، ل ٦٥.

123 هەمان سەرچاوە، ل ٦٦.

124 هەمان سەرچاوە، ل ٦٣ـ٦٥.

125 Shorsh, M. Resool, Op. cit, pp. 141-142,145.

126 Ibid, p. 153.

127 أ. پ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣ـ ٦٥.

128 هەمان سەرچاوە، ل ٦٣.

لە پارێزگای سەلاحەدینیش لە هەر یەکێك لە ناحیەکانی نەوجول و قادرکەرەم گوندێکی راگواست کە گوندەکانی لۆك و قەرەچەوەر بوون.[129] بەڵام لە سەرچاوەیەکی تردا ناوی چوار گوندی دیکەش هاتووە کە هەر لەو ساڵەدا راگوێزران.[130]

یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە بەڵگەنامەیەکدا کە لە ئاداری ١٩٨٦ پێشکەشی سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان و چەند رێکخراوێکی دیکەی جیهانی کرد دەڵێت: تەنیا لە ماوەی نێوان مانگەکانی ٧ـ١١ ساڵی ١٩٨٦دا زێتر لە ١٩٩ گوندی کوردی خاپوور کراون.[131]

لە شاری کەرکوکیش حکومەت ١٧٠٠ خێزانی کوردی بۆ ناوچەکانی دیکە راگواستن.[132]

ساڵی ١٩٨٦یش رژێم دیسان بە هەمان گڕوتین پەلاماری گوندەکانی دەدا و دانیشتووانی ئەو گوندانەشی رادەگواستن. پارێزگای هەولێر لەو ساڵەدا زێترین پشکی لە خاپوورکردن و راگواستنی گوندەکانی بەرکەوت. لە ناحیەی رەواندز کە سەر بە قەزای سۆران بوو دانیشتووانی شەش گوند بەر شاڵاوی راگواستن کەوتن.[133] لە قەزای ناوەند ، دانیشتووانی گوندێك لە ناحیەی خەبات راگوێزران،[134] بەلام

129 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 26-30.

130 أ. پ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣.

131 بۆ زێتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: D. Celadat Celiker, Le Kurdistane U Rojhelata Navin Ceken Kimyayi-Biyolociki Û Atomi,Wasanen Doz, Tirkiye, 1992. L 114-115.

132 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

133 Shorsh, M. Resool, op. cit, p. 48.

134 Ibid, p. 57.

زۆرترین ژمارەی ئەو گوندانەی راگوێزران لە قەزای مەخموور بوون، لە ناحیەی ناوەند ١٢ گوند و ناحیەی گوێڕ (شەمامك) دوو گوند[١٣٥] و لە ناحیەی دیبەگە (کەندیناوە)ش ١٠ گوند.[١٣٦] لە قەزای کۆیەش لە هەر یەکێك لە ناحیەکانی دێگەڵە و تەقتەق گوندێك بەر شاڵاوی راگواستن کەوت.[١٣٧] لە باڵەکایەتیش ٩ گوند لە دۆڵی خانەقا - ناوچەی وەرتێ - راگوێزران.[١٣٨]

لە پارێزگای سلێمانیش ژمارەیەك گوند راگوێزران، دوو گوند لە ناحیەی ناوەندی قەزای چەمچەماڵ،[١٣٩] ١٢ گوند لە قەزای دوکان چەندین گوند لە ناحیەی بنگرد و دوو گوندیش لە ناحیەی خەلەکان.[١٤٠]

لە قەزای قەڵادزێش سێ گوندی ناحیەی ناودەشت بەر ئەو پەلامارە کەوتن.[١٤١] هەروەها گوندی چەمەرگەش لە ناوەندی قەزای دربەندیخان.[١٤٢] گوندی خدر لە قەزای ناوەندی سلێمانی و گوندی عەلیاواش لە ناحیەی قەرەداغی هەمان قەزا راگوێزران.[١٤٣] لە ناحیەی خۆرماڵی قەزای هەڵەبجەش سێ گوند،[١٤٤] و دوو گوندیش لە ناحیەی

---

135 Ibid, pp. 72-73, 75.

136 کاوە نادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.

137 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 79-80

138 خالید ئەحمەد وەرتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤.

139 Shorsh, M. Resool, op. cit, p. 98.

140 Ibid, pp. 112, 114.

141 Ibid, pp. 118-119.

142 Ibid, p. 137.

143 Ibid, pp. 144, 149.

144 Shorsh, M. Resool, op. cit, p. 151-153.

کارێزەی قەزای چوارتا.[١٤٥]

لە پارێزگای کەرکوکیش دوو گوند لە ناحیەی پردێ،[١٤٦] سێ گوندیش لە ناحیەی قەرەحەسەن راگوێزران.[١٤٧] لە ناو شاری کەرکوك خۆیش ٢٠٥٠ خێزانی کورد راگوێزران.[١٤٨]

هەر لەو ساڵەدا (١٩٨٦) لە پارێزگای سەلاحەدین، قەزای توزخورماتوو سێ گوند بەر شاڵاوی راگواستن کەوتن، دوو گوند لە ناحیەی ناوەند و گوندی ((خدروەلی))ش لە ناحیەی نەوجول.[١٤٩]

لە ناوچەکانی بادینانیش، لە پارێزگای دهۆك لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٥ـ ١٩٨٧دا ، ١٥٠ گوند خاپوورکران و دانیشتووانی ئەو گوندانەش بەرەو ئوردووگا زۆرەملێکان راگوێزران.[١٥٠]

ساڵی ١٩٨٧ رەوشی لادێنشینانی کوردستانی خواروو بە تەواوی دەشلەژێت، هەموو ئەو گوندانەی کە تا ئەو کات مابوونەوە و دەستی وێرانکارییان پێ نەگەیشتبوو، چ ئەوانەی لە ژێر دەستی حکومەت و چ ئەوانی لە ناوچە قەدەغەکراوەکان ئاوەدانکرابوونەوە هەرەشەیان لێکرا. لە ساڵی ١٩٨٥ تاکو حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٧ زێتر لە ٧٨٠ گوند خاپوورکران بەم شێوەیە: ٢٤٠ گوند لە پارێزگای سلێمانی، ٤٣٢ گوند لە پارێزگای هەولێر، ٣٤ گوند لە پارێزگای کەرکوك و ٧٥ گوند لە پارێزگای دیالا.[١٥١] لەو ساڵەدا *عەلی حەسەن ئەلمەجید*

---

145 Ibid, pp. 160- 161.
146 Ibid, p. 33.
147 Ibid, p. 38.
148 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.
149 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 24, 26.
150 زیاد عەبدولرەحمان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥.
151 بۆ زێتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: D. Celadat Celiker، هەمان سەرچاوە، ل ١٢٠.
دکتور جەلادەت لەم زانیاریەیدا پشتی بە راگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

دەکرێتە بەرپرسی نووسینگەی باکوری حزبی بەعس و پاکتاوکردنی گوندەکانی کوردستان بەو دەسپێردرێت. لەو ساڵەدا جگە لە راگواستنی شارنشینەکان و خاپوورکردنی ژمارەیەك شارۆچکە، ٨٣٩ گوند لە کوردستانی خوارووداا خاپوورکران و دانیشتووانیشیان، بەشێکیان ئەنفال کران و بەشەکەی تریش تەنیا راگوێزران، بەم شێوەیە: لە پارێزگای دیالە ٦٦ گوند هەموویان لە قەزای کفری، ٢١ گوند لە ناحیەی سەرقەلا، ١٧ لە ناحیەی کوکس و ٢٨ گوندیش لە ناحیەی جەبارە.[١٥٢]

لە قەزای توزخورماتووی سەر بە پارێزگای سەلاحەدینیش ٢٩ گوند خاپوورکران، ٦ لە ناحیەی ناوەند، و ١٢ لە ناحیەی نەوجول و ٩ گوندیش لە ناحیەی قادر کەرەم.[١٥٣]

هەروەها لە پارێزگای کەرکوك ژمارەیەکی زۆری گوندەکان بەر ئەنفال کەوتن، ١٧ گوند لە ناحیەی قودس (قەزای دوبز)، لە قەزای ناوەندیش ٣٦ گوند، ٢٧ لە ناحیەی قەرەحەسەن، و ٨ گوند لە ناحیەی شوان و گوندێکیش لە ناحیەی قەرەهەنجیر.[١٥٤] وێرای راگواستنی ٣١٥٠ خێزانی کورد لە ناو شاری کەرکوك.[١٥٥]

لە پارێزگای هەولێر لەو ساڵەدا (١٩٨٧) ٢٦٢ گوند بەر ئەو

---

بەستووە. هەروەك بینیمان لەناو ئەو گوندە خاپوورکراوانەدا هیچ ئاماژەیەك بە گوندەکانی دەڤەری بادینان نەکراوە، پێمان وایە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی یەکێتی نیشتمانی ئەو کات پێگەیەکی وەهای لە بادینان نەبووە هەر بۆیە نەیتوانیوە ئاگاداری رەوشی ئەو ناوچەیە بێت بە وردی. ئەمەش دەمانگەیێنێتە ئەو ئەنجامەی کە ژمارەی گوندە خاپوورکراوەکان لەو ماوەیەدا زێترە لەو ژمارەیەی خرایەڕوو.

152 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 9-11.

153 Shorsh, M. Resool, pp. 24-29.

154 Ibid, pp. 35-42.

155 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

پەلامارە کەوتن، بەم شێوەیە: لە قەزای سدیق پێنج گوند، چواریان لە ناحیەی خەلیفان،[156] و گوندی دەرگەڵەش لە ناحیەی ڕەواندز.[157] لە قەزای ناوەندیش ۱۲۸ گوند، نۆ گوند لە ناحیەی خەبات، ۹۱ گوند لە ناحیەی قوشتەپە و ۲۸ گوندیش لە ناحیەی عینکاوە.[158] هەروەها ۲۹ گوندیش لە قەزای شەقڵاوە، ۱۷ گوند لە ناحیەی هەریر و ۱۲ گوندیش لە ناحیەی خۆشناوەتی.[159] لە قەزای کۆیە تەنیا ۱۰ گوند بەرکەوتن، نۆ گوند لە ناحیەی دیگەلە، ئەوی دیکەشیان لە ناحیەی ناوەند.[160] دواجاریش لە قەزای مەخموور، لە ناوەندی قەزا ۳۲ گوند، لە ناحیەی گوێڕ ۲۷ گوند،[161] لە ناحیەی دیبەگەش ۳۱ گوند.[162] لە ناحیەی مێرگەسووریش حەوت گوند ڕاگوێزران.[163]

لە پارێزگای ((دهۆك))یش ۱۳۱ گوند لەو ساڵەدا تێکدران بەم شێوەیە: لە قەزای ئامێدی ۵۳ گوند، ۸ گوند لە ناحیەی کانیماس، ۲۱ گوند لە ناحیەی دێرەلووك و ۲۱ گوند لە ناحیەی سەرسنگ، لە ناحیەی ناوەندیش سێ گوند. لە قەزای دهۆك ((ناوەند)) ٤۹ گوند، لە هەریەکە لە ناحیەی فەیدیە و ناحیەی زاویتە ۱۷ گوند، ناحیەی مانگێشك ١٤ گوند، گوندێکی دیکەش هەر لە هەمان قەزا. لە قەزای زاخۆش ۲۳ گوند بە دەردی ئەوانی دیکە بران، لە هەر یەکە لە

---

156 Shorsh, M. Resool, op. cit, p. 46.

157 خالید ئەحمەد وەرتی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤.

158 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 57-63.

159 Ibid, pp. 67-68.

160 Ibid, pp. 80-83.

161 Ibid, pp.72-75.

162 کاوە نادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨ـ٦٢.

163 المکتب السیاسي للحزب الدیمقراطي الکردستاني، من جرائم القتل العام في کردستان، ۱۹۸۷، ص ۲۲ـ۲۳.

ناحیەکانی ناوەند و رزگاری چوار گونــد ، و لــە ناحیــەی باتوفــەش ۹ گوند ، لە ناحیەی دەرکار عەجـەمیش ٦ گونـد ، هـەروەها لـە قـەزای ((سێمێل))یش ۱۰ گوند.[١٦٤]

ســەبارەت بــە پارێزگــای مووســڵ ژمارەیــەکی زۆری گونــدە کوردنشینەکانی ئەو پارێزگایە لــەو ســاڵەدا راگوێـزران. لـە قـەزای شێخان ۳٤ گوند ، ۲٦ گوند لە ناحیەی ئەتروش و ئــەوانی دیکــە لــە ناحیەی باعەدرێ. لە قەزای ئــاکرێ تــەنیا ۷ گونـد بـەر ئـەو شـاڵاوە کەوتن، ۲ گوند لە ناحیەی بجیل و ٥ گوند لە ناحیەی دینارتە.[١٦٥]

بەڵام لەو ساڵەدا زۆرترین ژمارەی گوندەکان لە پارێزگای ســلێمانی خاپوور کران. نزیکەی ۳۱٤ گوندی ئەو پارێزگایە لەگەڵ زەوی تــەخت کران. ۱٤ گوند لە قەزای چەمچەماڵ، سێ گوند لە ناحیــەی نــاوەند ، ئەوانی دیکە لە ناحیەی سەنگاو هەروەها نــاوەندی ناحیــەی ســەنگاو خۆیشی.[١٦٦] لە قەزای پێنجوینیش ، ۲۳ گوند لە ناحیــەی نـاوەند ، ۹ گوند لە ناحیەی گەرمك و گوندی هۆزخواجەش کــە هــەر ســەر بــەو قەزایە بوو راگوێزرا.[١٦٧] لە قەزای قەڵادزێش ۱٤ گوند ، ۱۲ گونــد لــە ناحیەی ناوەند و لە هەر یەکــە لــە ناحیــەکانی ناودەشــت و هــێرۆش گوندێك.[١٦٨] لە قەزای کەلار تەنیا ۹ گونــد بەرکــەوتن، پێنجیــان لــە ناحیەی تیلەکۆ و هەر یەکــە لــە ناحیــەکانی نــاوەند و پێبــازیش دوو گوند.[١٦٩] لــە ناحیــەی زەرایــەن ســەر بــە قــەزای دەربــەندیخانیش ۲٦

---

164 هەمان سەرچاوە، ل ۳۱ـ۳۲.

165 سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

166 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 92-94, 98.

167 I bid, pp.102-106.

168 Ibid, pp.118-122.

169 Ibid, pp.130-1134.

گوند.[170] هەروەها لە قەزای ناوەند ٦٣ گوند، ٢٥ لە ناحیەی قەرەداغ ئەوانی دیکە لە هەر سێ ناحیەی تانجەرۆ، سەرچنار و بازیان.[171] لە قەزای هەڵەبجە ٦٠ گوند، ٥٤ گوند لە ناحیەی خۆرماڵ و شەش گوندیش لە ناحیەی سیروان.[172] لە قەزای چوارتاش ژمارەیەکی زۆر گوند تێکدران، ٨ گوند لەناحیەی کارێزە و ٨٢ گوندیش لە ناحیەی بەرزنجە.[173]

هەر لەو ساڵەدا حکومەت لە بادینان چەند گوندێکی مەسیحیانی تێکدا.[174] هەروەها لە مانگی مایس لە گەڕەکی کانی ئاشقانی شاری هەڵەبجە رژێم نزیکەی ١٥٠٠ خانووی هاووڵاتیانی بە بلدۆزەر تەخت کرد.[175]

ئەو گوند و شارۆچکانەی لە ساڵەکانی ١٩٨٧و ١٩٨٨دا خاپوورکران هەمووی بە بڕیار و سەرپەرشتی راستەوخۆی *عەلی حەسەن ئەلمەجید* بوو. ناوبراو لە بەهاری ١٩٨٧ لە کەرکوك کۆبوونەوەیەك دەبەستێت کە پارێزگارەکانی کەرکوك، سلێمانی، هەولێر و دهۆك تێیدا بەشدار دەبن، ناوبراو بە تووڕەییەوە دەڵێت: ((نابێ یەك خانو لە گوندە کوردنشینەکانی دەشتی هەولێر بە پێوە

---

170 Ibid, p. 136.

171 Ibid, pp.145-149.

172 Ibid, pp.151-155.

بەپێی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٨٧ کە لە ١٧/١٠/١٩٨٧ بەڕێوەچوو، لە کۆی ٢١٦ گوندی قەزای هەڵەبجە تەنیا ١٨ گوند هێشتا بەر شاڵاوی راگواستن نەکەوتبون. بگەڕێوە بۆ: محمد غفور شریف، هەڵەبجە، ساڵنامەی هەڵەبجە، ساڵنامەی کۆمەڵەی ژیانەوەی هەڵەبجە، ژمارە ١، سلێمانی، ١٦/٣/١٩٩٧، ل ٣.

173 Shorsh, M. Resool, op. cit, pp.162-166.

174 میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٧.

175 هەمان سەرچاوە، ل ١٦٩.

بمێنێت.))[١٧٦] و بە پێی بڕیاری ١٦٠ی ئەنجومەنی شۆڕش لە ٢٦ی مایسی ١٩٨٧ سەرانی لیژنە ئەمنییەکان سەرپشك دەکرێن لە دەست گرتن بەسەر ماڵ و سامانی گوێزراو و ناگوێزراوی تێکدەراندا.[١٧٧] هەروەها *ئەلەجید* لە هەمان ساڵدا داوای لە لیژنە ئەمنییەکانی باکور کرد کە پێش ١٥ی ئەیلوول جەردێکی تەواوی ئەو خێزانانەی بکەوێتە بەردەستی کە کەسوکاریان لە ریزی پێشمەرگەدان، بۆ ئەوەی ئەو خێزانانە رەوانەی ئەو شوێنانە بکرێن کە ئەوانی لێیە، نێرینەکانیشیان لە نێوان ١٥ـ٥٠ ساڵی دەست بەسەربکرێن.[١٧٨] ئەم کارەش بە پراکتیکی ئەنجامدرا. هەروەها لە ئەنجامی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن رژێمی بەعس لە دژی لادێنشینە کوردەکان لە ساڵی ١٩٨٧، نزیکەی ١٠,٠٠٠ هاووڵاتی کورد ئاوارەی ئێران بوون و لە ئوستانەکانی کەرمانشا و کوردستان نیشتەجێ کران.[١٧٩]

ساڵی ١٩٨٨ رژێمی بەعس دڕندایەتییەکەی بە لوتکە گەیشت و گەورەترین تاوانی بەرامبەر بە گەلی کورد ئەنجامدا. لەو ساڵەدا جگە لە شارۆچکە و ناوەندی ناحیەکان زیاتر لە ١٦٦٠ گوند تێکدران و دانیشتووانی ئەو گوندانە دوای ئەنفال کردنیان بۆ ئوردووگا زۆرەملێیەکان راگوێزران. لە هیچ شاڵاوێکی راگواستندا هێندەی ئەم ساڵە دەست درێژی نەکرایە سەر راگوێزراوان، جگە لەوانەی لە ئەنفالەکاندا شونبزرکران، ئەوانی دیکە کەوتنە بەر شاڵاوی گرتن و ئەشکەنجەدان و نەخۆشیگەلێك بە ناویاندا بڵاوبوونەوە، کە بە هەزاران کەس لە ئەنجامی تووشبوونیان بەم نەخۆشیانە گیانیان بەخشی.

---

176 هەمان سەرچاوە، ل ١٣٧.

177 هەمان سەرچاوە، ل ١٦٦.

178هەمان سەرچاوە، ل ١٧٩.

179 د. جنگیز پهلوان، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

پاشماوەی ئەنفالەکان دوای ئەوەی بە هۆی لێبووردنی گشتی ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٨ لە گرتووخانەکانی وەك سەلامییە و نوگرەسەلمان و دبس. . . لە مردن رزگاریان بوو، بۆ ئوردووگاگەلێك گوازرانەوە.[١٨٠] هەندێك لەوانەی لە ئەنفال گەڕانەوە تەنانەت پسوولەی ئازوقەشیان پێ نەدرا، وەك ئەوانەی ئوردووگای بەرحوشتر لای بەحرکە. زۆر لە ئەنفال کراوەکانیش مەحاڵ بوو ناسنامەی تازەیان بۆ دەربکرێت، بەوەش نە کاریان لە دامودەزگاکانی حکومەت دەست دەکەوت، نە منداڵیان بەردەوام دەبوون لەسەر خوێندن و نە هیچ خزمەتگوزارییەکیان پێشکەش دەکرا.[١٨١]

لە ئەنفالی بادینان رەوشەکە هەندێك جیاواز بوو؛ زۆربەی زۆری خەڵکەکە نەکەوتنە بەر دەستی سوپای عێراق، بەڵکو پەنایان بردە بەر سنوورەکانی تورکیا و ئێران، دوای ئازار و نەخۆشی و کۆسپ و تەگەرەی زۆر، توانیان بچنە ناو تورکیا. لە ٣١ی ئاب ساڵی ١٩٨٨ کاربەدەستە تورکەکان راگەیاند کەوا مافی پەناهەندەیی کاتیان بە ٥٧ هەزار کوردی عێراقی داوە، بەڵام ژمارەیەکی تری خێزانەکان لە کۆتایی ئەیلوول چوونە ناو تورکیا.[١٨٢] *ماکداوێل* پێی وایە لە کۆتایی مانگی ئاب زێتر لە ٦٠,٠٠٠ هاووڵاتی کورد سنووری تورکیایان بڕی و ژمارەیەکی وەك ئەمەش پەنایان بردە بەر ئێران.[١٨٣] ناوبراو لە کتێبێکی دیکەدا باس لە هەمان رووداو دەکات و دەڵێت: تا کۆیایی مانگی ئاب رەنگە ١٠٠,٠٠٠ کەسی دیکەش دواتر سنووری ئێرانیان

---

180میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

181 هەمان سەرچاوە، ل ٥٠٨.

182منظمة العفو الدولية، الاطفال ضحايا بريئة للقمع السياسي، شباط ١٩٨٩، ص ٥١.

183 ديڤد ماکدویل، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٥.

بڕیبێت. بەمەش ژمارەی پەناهەندە کوردەکان لە ئێران گەیشتە زێتر لە ۲۵۰,۰۰۰ کەس.[۱۸٤]

بەڵام بەپێی گوتەی میدل ئیست وۆچ لە کۆتایی مانگی ئاب بەلای کەمەوە ٦٥ هەزار و ڕەنگەش ۸۰ هەزار کەس، لە بادینان بە کۆمەڵ کۆچیان کردبێت بۆ سنوورەکانی تورکیا.[۱۸۵] کەچی بەپێی سەرچاوە نارەسمیەکان ژمارەی ئەو ئاوارانەی سنووری تورکیایان بڕی ڕەنگە خۆی لە ۱۰۰,۰۰۰ کەس بدات.[۱۸٦] هەروەها بەپێی سەرچاوەیەکی ئێرانی لە بەهاری ساڵی ۱۹۸۸ لە ئەنجامی بەکارهێنانی گازە کیمیاییەکان لە دژی هاووڵاتیانی شارۆچکەی هەڵەبجە و دەوروبەری ۷۰,۰۰۰ هاووڵاتی ئەو ناوچەیە بۆ ئەودیو سنووری ئێران ئاوارە بوون.[۱۸۷]

سەبارەت بە ئاوەدانیە خاپوورکراوەکان هەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد لەم ساڵەدا ژمارەیەکی زۆر شارۆچکە و ناحیە تێکدران و ڕاگوێزران لەوانەش ((ئاخجەلەر ، خۆرماڵ ، ئوردووگای خۆرماڵ ، سەید سادق ، ئوردووگای شانەدەر ، سیروان ، ئوردووگای سیروان ، ئوردووگای عەنەب ، ناحیەی بەرزنجە و ناحیەی دیبەگە هەروەها شارۆچکەی هیران)).[۱۸۸] تەنیا ناحیەی دیبەگە ژمارەی خێزانەکان زۆر نەبوون، ۵۰۰ ماڵ بوون،[۱۸۹] ئەوانی دیکە هەموویان لە نێوان

---

184 دیوید ملك داول، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦٣.
185 میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٥.
186D. Celadat Celiker, هەمان سەرچاوە. ل ١٤٥
187 د. جنگیز پهلوان، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.
188 المکتب السیاسي للحزب الدیمقراطي الکردستاني، من جرائم القتل العام في کردستان، دون مکان الطبع ١٩٨٨، ص ٣٠.
189 کاوە نادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤.

١٥٠٠ـ٣٠٠٠ خانویان لەخۆدەگرت.[190] لــە نزیـك شــاری هــەولێریش لەتیفاوا کە ژمارەی دانیشتووانی زۆر بوون تێکدرا.

بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی گوندەکان یەکجار زۆرە پێمان باشـــە بــە شێوەی خشتە بیانخەینە ڕوو .

**خشتەی ژمارە (١)**

**ژمارەی گوندە وێرانکراوەکان لە پارێزگای سلێمانی ساڵی ١٩٨٨**

| ژمارە | قـــەزا | نــاحیە | ژمارەی گوندەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | چەمچەماڵ | سەنگاو | ٦٧ |
| | | ئاغجەلەر | ٧٥ |
| | | ناوەند | ٤ |
| ٢ | پێنجوین | ناڵپارێز | ٥ |
| ٣ | دوکـــان | سورداش | ٧٧ |
| | | بنگرد | ٢٣ |
| | | خەلەکان | ٢٤ |
| ٤ | قەڵادزە | ناودەشت | ٩ |
| | | ناوەند | ٨ |
| ٥ | رانیـــە | چوارقورنە | ٦ |
| | | بێتواتە | ١٥ |

190Shorsh, M. Resool, op. cit, pp. 151, 153, 155, 156, 163.

| ٦ | کەلار | تیلەکو | ١٠٨ |
|---|---|---|---|
| | | ناوەند | ١٢ |
| | | پێباز | ٤٨ |
| ٧ | | ناوەند | ٧ |
| ٨ | ناوەند | تانجەرۆ | ٩٣ |
| | | سەرچنار | ١٩ |
| | | قەرەداغ | ٥٠ |
| ٩ | هەڵەبجە | سیروان | ٧ |
| | | خورماڵ | ١٠ |
| ١٠ | چوارتا | بەرزنجە | ١٧ |
| | | کارێزە | ٢٠ |
| **کۆی گشتی** | | | **٦٨١** |

Shorsh, M. Resool, op. cit.

## خشتەی ژمارە( ٢ )

### ژمارەی گوندە وێرانکراوەکانی پارێزگای دهۆك لە ساڵی ١٩٨٨ دا

| ژمارە | قـــەزا | ژمارەی گوندەکان |
|---|---|---|
| ١ | قـــەزای ئـــامێدی | ٢٣٣ |
| ٢ | قـــەزای زاخـــۆ | ١٠٢ |
| ٣ | قـــەزای دهۆك | ٦٣ |
| | **کۆی گشتی** | **٤٠٣** |

سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

Shorh, M. Resool, op. cit.

روؤف عقـراوي، الحملـة علـى البادينـان واوضـــاع اللاجئـــين، الطبعـــة الثانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٣.

## خشتەی ژمارە ( ٣ )

## ژمارەی گوندە وێرانکراوەکانی پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٨٨دا

| ژمارە | قــەزا | نــاحیە | ژمارەی گوندەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | سۆران | خەلیفان | ٣١ |
| | | رەواندز | ١٣ |
| ٢ | هەولێر | خەبات | ١ |
| | | قوشتەپە | ٨ |
| ٣ | شەقڵاوە | سەلاحەدین | ١١ |
| | | هەریر | ١٠ |
| | | خوشناو | ٢٢ |
| ٤ | مەخموور | ناوەند | ٢ |
| | | گوێڕ | ٩ |
| ٥ | کۆیە | دێگەڵە | ٢٦ |
| | | تەقتەق | ٥٢ |
| | | ناوەند | ٤٠ |
| ٦ | مێرگەسوور | بارزان و شێروان | ٩٠ |
| **کۆی گشتی** | | | **٢٩٥** |

–سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

Shorsh, M. Resool, op. cit.

میدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو.

رووف عقراوي، سەرچاوەی پێشوو.

## خشتەی ژمارە( ٤ )

## ژمارەی گوندە وێرانکراوەکانی پارێزگای کەرکوك لە ساڵی ١٩٨٨دا

| ژمارە | قـــەزا | نـــاحیە | ژمارەی گوندەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | توززخورماتوو | ناوەند | ١ |
| | | نەوجول | ٢٥ |
| | | قادرکەرەم | ٧١ |
| ٢ | ناوەند | پردێ | ٢٣ |
| | | قودس | ١ |
| | | قەرەحەسەن | ١٥ |
| | | شوان | ٦١ |
| | | قەرەهەنجیر | ٣٩ |
| کۆی گشتی | | | ٢٣٦ |

Shorsh, M. Resool, op. cit

لە پارێزگای دیالا تەنیا قەزای کفری بەرکەوت . پێنج گوند لە ناحیەی سەرقەڵا و دوو گوند لە ناحیەی جەبارە.[١٩١]

لە پارێزگای مووسڵیش ٥٤ گوند ، ٣٥ لە قەزای ئاکرێ ، ١٩ لە قەزای شێخان.[١٩٢] هەروەها دانیشتووانی ئەو گوندانەی بادینان کە نەیانتوانیبوو بپەڕنەوە تورکیا و حکومەتیش نەیتوانیبوو بەر لە ٦ ی ئەیلوول (لێبوردنی گشتی) دەستگیریان بکات ، دوای ٦ ی ئەیلوول کە خۆیان دا بەدەستەوە حکومەت هەموویانی گواستەوە بۆ ئوردووگای جیژنیکان .

بە پێی میدل ئیست ووچ تا راپەڕینی ١٩٩١ نزیکەی ١٥ هەزار ڕاگوێزراوی بادینان لە جیژنیکان مابوونەوە.[١٩٣]

هەروەها لە ئوکتوبەری ١٩٨٨ ، ٢٠٠٠ خێزانی کورد لە شارۆچکەی بەرتلەی نزیك شاری مووسڵ ڕاگوێزران بۆ ئوردووگاکانی هەردوو پارێزگای هەولێر و سلێمانی.[١٩٤] لە ساڵی ١٩٨٩ هەرچەندە دەمێك بۆ هەردوو دەوڵەتی عێراق و ئێران بە بڕیاری UN رازی ببوون شەڕ نەمابوو، لەو ساڵەدا چیتر بزاڤی رزگاریخوازی کوردی هەڕەشە نەبوو لەسەر دەوڵەتی عێراق، بەڵام راگواستن نەوەستا. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٩ حکومەت دەستی بە راگواستنی شارۆچکەی قەڵادزێ و لادێکانی دەوروبەری کرد.[١٩٥] ژمارەی دانیشتووانی ئەو

---

191Shorsh, M. Resool, Op. cit, pp. 9-11.

192 من جرائم القتل العام فی کردستان (١٩٨٨)، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥-٣٦.

193میدل ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٣.

194 Madico International, Deportations in Iraq Kurdistan and Kurdhsh Refuges in Iran, Year book of the kurdish acadimy, 1990. p. 67.

196 Shorsh, M. Resool, Op. cit, p. 61.

دەڤەرە نزیکەی ۷۰,۰۰۰ کەس دەبوو. هەر لەو ماوەیەدا (۱۹۸۹/۵/۲۹) شارۆچکەی دێگەڵەش راگوێزرا.[196]

هەر لەو ساڵەشدا لە قەزای قەڵادزێ ئوردووگاکانی پێماڵك، بازیان، تووەسۆران و ژاراوە راگوێزران، تەنیا ئەوەی دوایی ژمارەی خێزانەکانی لە هەزار سەر خێزان کەمتر بوون، ئەوانی دیکە هەموویان لە هەڵەبجەی ۲۵۰۰ خێزانیان لەخۆ دەگرت. هەروەها لە ناحیەی ناودەشتیش ۱۰ گوند راگوێزران، لە ناحیەی ناوەندیش گوندی پێمالکی کۆن راگوێزرا.[197] لە ناحیەی بێتواتەش (قەزای رانیە) گوندی هەرتەل راگوێزرا.[198] لە قەزای دوکانیش، ناحیەی بنگرد دوو گوندی مامەنداوا و بەردەکۆز راگوێزران.[199]

هەر لەو ساڵەدا حکومەت دانیشتووانی ۲۲ گوندی لە ناوچەی سیدەکان (برادۆست) بۆ ئوردووگاکانی دێلزیان و بادلیان لە باکوری قەزای سۆران راگواستن.[200] هەروەها ۳٤ گوندی هەردوو عەشرەتی دۆلەمەری و شێروانی لە دەڤەری بارزان راگوێزران، زۆربەی ئەو راگوێزراوانەش لە ئوردووگای سارداڤ لە نزیك شارۆچکەی سۆران نیشتەجێکران.[201]

*سەدام حوسێن* بەناوی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە بڕیاری ژمارە ۲۹ی ڕۆژی ۱۹۸۹/۸/۲٤ی دەرکرد، بەپێی ئەو بڕیارە نابێت هیچ کوردێك لە شاری کەرکوك هەڵسێت بە کاروباری یاسایی لە

---

196 Ibid, p. 68.

197 Shorsh, M. Resool, Ibid, pp. 118-123.

198 Ibid, p. 127.

199 Ibid, p. 113.

200 چاوپێکەوتن لەگەڵ یادگار رەسوڵ لە ۲۰۰۳/۱/۲٥.

201 چاوپێکەوتن لەگەڵ رێکار مزووری لە ۲۰۰۳/۱/۲٦.

بواری عەقاردا.[202] ئەمەش ڕێگــە خۆشــکردنێك بــوو بــۆ دەرکــردن و بێزارکردنی خەڵك لەو شارە. هەر لەو ساڵەشدا ۲۹۵۰ خــێزانی کــورد لە شاری کەرکوك دەرکران.[203]

لــە مــانگی شەشــی ســاڵی ۱۹۹۰ حکومــەت خــەڵکی ناوچــەی مێرگەسوور (ئەوانەی تا ئەو کات مابوونەوە) ئاگادار کردنەوە کە بــە زووترین کات بارگە و بنــەیان تێــك بنێــن، دانیشــتووانی ئوردووگــای گورەتــوو کــە لــە ســاڵی ۱۹۷۸ مــزووری و هەرکیــــەکانی لێ نیشتەجێکرابوون بۆ ئوردووگای شاخولان بە دووری نزیکــەی ۱۵ کــم لە باکووری ڕۆژئاوای عەنکاوە، ئەوانی تــر دانیشــتووانی مێرگەســوور خۆی و ٦ گونــدی دەوروبــەری بــۆ ئوردووگاکــانی ســارداو و باســرمە ڕاگوێزران.[204] ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە تا ئێستا نەمانبینیوە هیــچ کەســێك ئامــاژەی بــە ڕاگواســتنی مێرگەســوور و دەورووبــەری کردبێت، هەموو ئەوانەی لە بارەی ڕاگواستنەوە نووســیویانە ناوچــەی قەڵادزێیان بەدوا وێستگەی ڕاگواستن لەقەڵەم داوە، لــە کــاتێکدا لــە کۆتایی ساڵی ۱۹۹۰یشدا حکومەت بەردەوام بوو لەسەر ڕاگواستن. لە دوو مانگی تشرینی یەکــەم و دووەمــی ســاڵی ۱۹۹۰ حکومــەت لــە ناحیەی دیانا چوار گوندی ستیکان، ناوڕۆین، هەسنان و پیروسوان ـ ی بۆ ئوردووگای دێلزیان ڕاگواست.[205] وێڕای ڕاگواستنی ۲۳۰۰ خــێزانی کورد لە شاری کەرکوك.[206]

---

202 وریا جاف، سەرچاوەی پێشوو، ل ۱٤۰.
203 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.
204 چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕێکار مزووری لە ۲۸/۱/۲۰۰۳.
205 چاوپێکەوتن لەگەڵ یادگار ڕەسوول لە ۲٥/۱/۲۰۰۳.
206 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥.

### قۆناغی سێیەم: ١٩٩١-٢٠٠٣

بە پێویست دەبێت ساڵی ١٩٩١ بە سەرەتای قۆناغێکی دیکەی راگواستنی کوردان لەقەڵەم بدەین، چونکە بە شێوەی ١٩٧٥ قۆناغێکی جیاوازی دیکەیە لە ژیانی کوردەکانی عێراق. لەم ساڵەدا یەکێك لە گەورەترین رووداوەکان لە ژیانی سیاسی کوردەکان (بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست) دا روویدا، ئەویش رزگارکردنی زۆربەی هەرە زۆری خاکی کوردستانی باشور بوو. ئەگەرچی کوردەکان نەیانتوانی پارێزگاری لەو هەموو زەویە رزگارکراوانە بکەن کە ئازادیان کردن. لەگەڵ ئەوەشدا توانیان زۆربەی ئەو زەوییە رزگارکراوانە بپارێزن و وەك کیانێك فەرمانڕەوایی تێدا بکەن، ئەمە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە لەم ساڵەدا گەورەترین راگواستنی کوردان روویدا ئەگەرچی زوو بارودۆخەکە ئاسایی بووەوە. ئەویش لە میانەی کۆڕەودا کە لە دوارۆژەکانی مانگی ئاداری ١٩٩١ حکومەت بە تانك و هەلیکوپتەر هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر هەرێمی کوردستان و خەڵکی راپەڕیو و وەك هەمیشەش هیچی نەپاراست. لە ئەنجامیشدا کۆڕەوێکی ملیۆنی دروست بوو کە بە ملیۆنان کورد ئاوارەبوون و بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا کەوتنە رێ. هەروەکو لە ئەنجامی ئەم کۆڕەوەدا لەسەر ئاستی دەرەوە گەورەترین پشتگیری جیهانی بۆ کورد دروست بوو، لە ناوەوەش کۆڕەو بوو بە رووداوێك کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگای کوردی ئەزموونیان کرد. لێرەشدایە کە راگواستن و راوەدوونان خۆی لە بەعەرەبکردن و ئەنفال و کیمیاباران جیادەکاتەوە، چونکە نە ئەنفال و نە کیمیاباران و نە بەعەرەبکردن بەسەر سەرتاپای ناوچە کوردنشینەکاندا پیادە نەکران، بەڵام راگواستن و راوەدوونان نەك تەنیا هەموو کوردستانی باشوری گرتەوە، بەڵکو زۆربەی ئەو کوردانەی لە شارەکانی دیکەی عێراقیش

دەژین راگواستن و راوەدوونانیان ئەزموون کردووە.

لەم قۆناغەدا راگواستنی کوردان بەپێچەوانەی قۆناغی پێشتر لەکەمی داوە. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی گۆڕانێك لە سیاسەتی بەعسدا روویدا، بەڵکو لەبەرئەوەی: یەکەم، ناوچەگەلێکی کەم لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا مابوون بە بەراورد لەگەڵ ناوچە رزگارکراوەکان ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا مابوون رێژەی کوردیان لێ کەم ببووە، ئەویش لە ئەنجامی ئەو هەموو راگواستن و بەعەرەبکردنەی لە ماوەیەکی درێژدا لەو ناوچانە پیادە کرا. دووەم، چیتر جیهان لە ئاست دڕندایەتی بەعس وەکو جاران بێدەنگ نەبوو، کوردیش بێ پشت و پەنا. سەرەڕای هەموو ئەمەش بەعس لەم قۆناغەدا لەسەر پیادەکردنی راگواستن و بەعەرەبکردن بەردەوام بوو. لەخوارەوە هەوڵدەدەین تیشکێکی بخەینە سەر.*

---

* وێڕای ئەوەی لە ساڵی ۱۹۹۱ەوە تا رووخانی رژێمی بەعس لە ساڵی ۲۰۰۳، کوردەکان حکومەتێك یان دوو حکومەتیان هەبووە و فەرمانڕەوایی هەرێمی کوردستانیان کردووە. کەچی بە هەمان شێوەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو نەیانتوانیوە ئامارێکی وردی ئەو راگوێزراوانە بکەن کە لەدوای راپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱ راگوێزراون. وەك ئەوەی راگواستنی کوردەکان کردەیەکی ئاسایی و مرۆڤانە بێت و پێویست نەکات باس و ئاماری لەبارەوە بکرێن. هەروەها لەو ماوەیەدا هەندێ جار ماوە ماوە راگواستن و تەعریبیان لەیادی خۆیان دەبردەوە. لەکۆتایی نەوەدەکان و سەرەتای هەزارەی نوێ بیریسان کەوتەوە کە پێویستە ئامارێکی راگوێزراو و دەرکراوەکان بکەن. وێڕای ئەوەش راگواستن و تەعریب بکەن بە بابەتێك (هەڵبەت بابەتێکی لاوەکی) و هەندێ جار لە هۆکارە راگەیاندنییەکانیاندا باسی بکەن، بەڵام تا ئەم ساتەش نەیانتوانی ئامارێك بکەن کە یەکەم، سەرتاپاگیر بێت و هەموو راگوێزراوەکان بگرێتەوە و لە ناوەند و بنکەیەك دەست بکەوێت. دووەم، جێگەی متمانەی باسکار و تۆژەران بێت، بەڵکو هەمیشە گومانی ئەوە هەیە کە ئەو ئامارانە ورد نین. هەڵبەت مەبەستمان ئەوە نییە بە زیادەوە نووسراون، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە زوو ئاماری راگوێزراوەکان نەکرا و دواتریش کاتێك

راستەوخۆ دوای کۆڕەو و دوای ئەوەی حکومەت هەندێك لە ناوچە رزگارکراوەکانی داگیرکردنەوە، نەیهێشت زۆر لەو کوردانەی کەرکوك کە لە کۆڕەوەکەدا هەڵاتبوون، بگەڕێنەوە شاری کەرکوك. سەرباری ئەوەی لە دانوستانی مایسی ١٩٩١ لە نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی ناوەندیدا بە راشکاوی باس لە رێگەدان بە گەڕانەوەی هەموو ئەوانە بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان کرابوو.[٢٠٧] لە مانگی ئاداری هەمان ساڵ عەلی حەسەن ئەلمەجید سەرپەرشتی تێکدانی ٨٠ خانووی کورد و تورکمانەکانی لە گەڕەکی ئەڵماس لە شاری کەرکوك کرد.[٢٠٨] زۆر لەو خێزانە کوردانەش کە پێشتر لە قەزای حەویجە نیشتەجێ ببوون بە مەبەستی کارکردن لەوێ، حکومەتی بەعس لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٥ دەری کردن.[٢٠٩]

لە سەرچاوەیەکدا هاتووە لە ساڵی ١٩٩١ـ١٩٩٦ نزیکەی ٣٥ خێزان لە ناوچە بەعەرەبکراوەکانەوە بۆ سنووری پارێزگای هەولێر راگوێزران.[٢١٠] لە ساڵی ١٩٩٧ حکومەت ناوی ٨٠ خێزانی کوردی لە شاری کەرکوك نووسی و لە هەر خێزانێك ئەندامێکی ئەو خێزانەی

---

هەولێاندا ناونووسیان بکەن هەر ئیدارەیەك و هەندێ کات هەر شارە و بە تەنیا ئاماری دەکرد و لە ئەنجامیشدا خەڵکێك تا ئێستا ناونووس نەکراون. بۆ نموونە لە شاری دهۆك چاومان بە راگوێزراوێکی شارۆچکەی فەیدیە کەوت، پێی گوتین لە ساڵی ١٩٩١ەوە تا ساڵی ٢٠٠٣ هێندەی من ئاگادارم زێتر لە ٢٥ خێزان لە فەیدیە راگوێزراون، کەچی تا ئێستا هیچ بنکە یان ناوەندێك ناونووسیان نەکردووین. سەردانی هەر ناوەندێکی ناونووسین دەکەین پێمان دەڵێن: ئێوە ناکەونە ناو سنووری ئێمە و ناتوانین ناونووستان بکەین. چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەکرەم یاسین بەرواری لە ٢٠٠٣/٢/٢٥ لە شاری دهۆك.

207 د. نوری طالبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٧.

208 هەمان سەرچاوە، ل ٦٦.

209 هەمان سەرچاوە، ل ٨٣.

210 غەفوور مەخموری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.

دەسگیر کرد، تا ماڵەکەیان بە بارکراوی بهێننە بەردەم بنکەی پۆلیس و رژێم دڵنیا بێت لە بارکردنیان، دواتر بە هۆی گوشاری نێو دەوڵەتیەوە ئەم هەڵمەتە وەستێنرا. کەچی لە دوابیدا بە شێوەی چەند خێزان چەند خێزان پێکەوە پیادە کرا.[211]

بەپێی نووسراوێکی نهێنی ژمارە ٣٠١٤٣٣ لە رێکەوتی ١٢/١/١٩٩٨ دیوانی پارێزگای تەئمیم بڕیاری دەرکردنی ١٤٦٨ خێزانی کورد لە شاری کەرکوك درا لە ماوەی نێوان ١٥/٤/١٩٩٨ـ٤/٦/١٩٩٨ بەم شێوەیە: حەی ئەلعەسکەری (٢) ٤٥ خێزان، ئیمام قاسم (١) ٧٤ خێزان، رێگای بەغدا ١٢ خێزان، ئیمام قاسم (٢) ٦٦ خێزان، ئیسکان ١٥٠ خێزان، ئەخی حوسێن ٢ خێزان، ئەلحوریە ٢٤٣ خێزان، ساری کەهیە ٣٢ خێزان، ئەلمەسلا ٣ خێزان، ئەلخەزرا ٢ خێزان، ئەلقوریە ٣٢ خێزان، حەی ئەلعەسکەری (١) ٦ خێزان، شوریجە ٣٢١ خێزان، ئەلئەندەلوس ٤٠١ خێزان.[212]

لە زۆربەی ناوچەکان حکومەت رێوشوێنی توندی دەگرتە بەر بۆ دەرکردن و راگواستنی کورد. لە نووسراوی ژمارە ٨ی رێکەوتی ٧/١/١٩٩٨ی پارێزگای دیالا هۆبەی زانیاریە دیموگرافییەکان، رێوشونی توند بەرچاو دەکەون بۆ ئەوانەی راگواستن رەتدەکەنەوە وەك دەستبەسەرکردنی گەورەی خێزان بۆ مانگێك، داگیر کردنی ماڵەکانیان، لێسەندنەوەی بلیتی ئازوقە...هتد.[213] بەپێی یەکێك لە سەرچاوەکان ژمارەی خێزانە راگوێزراوەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی بەعسەوە بۆ پارێزگای سلێمانی ١٦٠٠٠ خێزانە و دەکەنە

---

211 د. رەفیق شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٧.

212 ستران عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣ـ٧٤.

213 هەمان سەرچاوە، ل ١٩.

٩٥,٠٠٠ کەس.[٢١٤] ئەوانش کە رەوانەی پارێزگای دهۆك کراون ژمارەیان ٣٥٠ خێزانە و دەکەنە ٢١٠٠ کەس.[٢١٥]

لە ساڵی ١٩٩١ەوە تا ٢/٨/٢٠٠٠ بەپێی ئەو ئامارانەی لە دەزگاکانی راگەیاندندا بڵاوکرانەوە دەکاتە نزیکەی ١٥,٨٣٩ خێزان، کۆی گشتیان دەکاتە ٩٣,٨٨٨ کەس بۆ ناوچە رزگارکراوەکان.[٢١٦] بەپێی ئامارێکی دیکە ژمارەی خێزانە راگوێزراوەکان لە سنووری پارێزگای کەرکوك بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردی لە ساڵی ١٩٩١ـ ١٢/٩/٢٠٠١ دەکاتە نزیکەی ٤٤١٧ خێزان.[٢١٧] ژمارەی ئەو خێزانانەی لە سنووری پارێزگای کەرکوك (ئازادکراو) تاکو ساڵی ١٩٩٦ تۆمارکراون دەکاتە ٣٦٠ خێزان. لە ساڵی ١٩٩٧ ژمارەکە زۆر زیادی کرد و گەیشتە ٧٠٢ خێزان، ساڵی ١٩٩٨، ٣٩٤ خێزان ی دیکەش تۆمارکران. بەڵام ژمارەی دەرکراوەکان بۆ پارێزگای هەولێر ساڵی ١٩٩٧ تەنیا ١٥١ خێزان بوو، لە ساڵی ١٩٩٨، ٥٤ خێزانی دیکە تۆمارکران. لەحەوت مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩ ٢٣٢ خێزان بەرەو سنووری هەردوو پارێزگای سلێمانی و کەرکوك راگوێزران، لە پێنج مانگی کۆتاییشدا ٢٠٠ خێزانی دیکە بەدوایاندا راگوێزران.[٢١٨]

بەپێی ئامارەکانی لیژنەی مافی مرۆڤ لە پەرلەمانی کوردستان، ژمارەی دەرکراوەکان لە ساڵی ١٩٩٦ تاکو ١٨/٥/٢٠٠٢ بەم

---

214 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠

215 هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

216 د. رەفیق شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٥.

217 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

218 لەتیف فاتح فەرەج، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩

شێوەیەیە: کەرکوك ٩٠٣ خێزان، گوێر، کەندیناوە و قەراج ٢٦٧ خێزان، مووسڵ، شنگار و شێخان ٦٩ خێزان، بەغدا و پارێزگاکانی دیکە ٤٦ خێزان.[٢١٩] بە پێی ئامارێکی دیکە ژمارەی خێزانە دەرکراوەکان لە ٩/٢/٢٠٠٢ـ٢٧/١١/٢٠٠٢ دەکاتە ٥١ خێزان.[٢٢٠]

---

219 غەفوور مەخمووری، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

220 بەرەو سالی نوێ ... رۆژ و ژمارەی دەرکراوەکانی شالاوی تەعریب لە ٢٠٠٢دا، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٨٧٩، هەولێر ٢٩/١٢/٢٠٠٢.

## پێشەکییەکی میتۆدی بۆ کاری مەیدانی

### ١-کەرەستەی کۆکردنەوەی زانیاری

تۆژەرە کۆمەڵایەتییەکان بەزۆری پشت دەبەستن بەزێتر لەکەرەستەیەکی کۆکردنەوەی زانیاری، چونکە بەکارهێنانی زۆرترین ڕێژەی سەرچاوەو شێوازو کەرەستەی جیاواز بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی لەگەڵ پرسی تۆژینەوەکە دەگونجێن، ڕێژەیەکی گەورەی ئەو بیروبۆچوون و چەمکە تیۆریانە دەداتە دەست کەپەیوەندیان بەپرسی تۆژینەوەکەوە هەیە[1]. دواجار تۆژەر ڕێژەیەکی زێتری زانیاریو داتای لەلا گەڵاڵە دەبن و توانای ئەوەی بۆ دەرەخسێت لەمزێتر لەپەنجەرەیەکەوە لەتۆژینەوەکەی بڕوانێت. تۆژەر لەلایەنی مەیدانیدا پشتی بەسێ جۆر کەرەستەی کۆکردنەوەی زانیاری بەستووە.

١-چاودێریکردن (Observation): دەکرێ ئامانجی بینین کۆکردنەوەی زانیاریە تەواوکەرەکان بێت لەپێناو ڕاڤەکردنی ئەو ئەنجامانەی بەرێگەی میتۆدی دیکەوە بەدەست هاتوون، هەندێ جاریش وەك شێوازێکی سەرەکی کۆکردنەوەی زانیاریەکان سوود لەچاودێریکردن وەردەگیرێت[2]. (لەبەشی پێنجەمی باسەکەدا وەك کەرەستەیەکی سەرەکی کۆکردنەوەی زانیاری سوود لەچاودێریکردن وەرگیراوە). بەو پێیەی تۆژەر یەکێکە لەراگوێزراوەکان و هەر لەمنداڵیەوە تاکو ئێستا لەنێو ڕاگوێزراواندا دەژیت و ئاگاداری ئەو گۆڕانانەیە کەبەسەر شێوازی ژیان و ڕەفتارو دابونەریتەکانیاندا هاتوون، هەروەها بەو پێیەی لەهەر سێ شێوەی نیشتەجێبوونی کۆمەڵگای کوردی (شار، لادێ و ئۆردووگا)دا بۆ زیاتر لەچەند ساڵێك ژیاوە، دەشێ

---

1 دیرك لایدر، قضایا التنظیر في البحث الاجتماعي، ت: عدلي السمري، المجلس الاعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٠، ص١٤٣.

2 پەروین سازگارا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٨.

بەچاودێریکەرێك لەقەڵەم بدرێت. ئێمە لەو بڕوایەشداین کە بۆ توێژینەوە لەئاکامەکانی راگواستن، پرسیارنامە ناتوانێت هەموو زانیاریە پێویستەکان کۆبکاتەوە، چونکە دارِشتنی پرسیارنامەش مەرجی تایبەتی خۆی هەیە پێویستە لەکاتی دانانی پرسیارەکاندا رەچاوی جۆری پرسیار، کاتی لێکۆڵینەوەو نموونەکان... هتد بکرێت.

٢-چاوپێکەوتن (Interview): توێژەر سوودی لەچاوپێکەوتن وەرگرتووە وەك کەرەستەیەك بۆ کۆکردنەوەی زانیاری. بەتایبەتیش چاوپێکەوتنی چڕ یان تێرو تەسەل (Focused Interview)، لەم جۆرە چاوپێکەوتنانەدا چاوپێکەوتوو هەوڵدەدات لایەنو رەهەندی تایبەتی ئەو هەلومەرجەی کە کاری لێکردووەو رەفتارەکانی گۆڕیون، دیار بکات. لەم جۆرە چاوپێکەوتنانەدا کەمتر پرسیار لەو تاکەکەسە دەکرێت کەچاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکرێت. بەڵکو زێتر یارمەتی دەدرێت تا بەرەو ئامانجی باسەکە بڕوات. هەروەها چاوپێکەوتوو هاندەدرێت تا لەبارەی بابەتەکە باس لەئەزموونی تاکە کەسی خۆی بکات[٣]. لەزێتر لەبەشێکدا سوود لەم کەرەستەیە وەرگیراوە وەك کەرەستەیەکی یارمەتیدەر بۆ زێتر کۆکردنەوەی زانیاری.

٣-پرسیارنامە (Questionnairer): پرسیارنامە ئەمڕۆ لەکوردستانی باشوردا لەلایەن توێژەرە کۆمەڵایەتییەکانەوە زۆرتر لەکەرەستەکانی دیکەی کۆکردنەوەی زانیاری بەکاردێت، ئەویش لەبەر ئەو تایبەتمەندیانەی لەخۆیان دەگرێت. مەبەست لەپرسیارنامە وەرگرتنی زانیاریە جیاجیاکانە لەبارەی بابەتی توێژینەوە لەکەسێك، رووداوێك یاخود دیاردەیەکی لەبەرچاو گیراو. بۆ دارِشتنی پرسیارنامەیەکی متمانەپێکراو، پێویستە بنەماو خاڵگەلێکی زۆر رەچاو بکرێن، لەوانەش ئامانجی توێژینەوەکە، راشکاوەیی پرسیارو ژمارەیان، بایەخدان بەپاڵنەرو هاندەرەکانو هەلومەرجی وەڵامدەرەوەکان[٤].

---

3 هەمان سەرچاوە، ل ٧٧-٧٨.

4 مەنوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، و: رێبوار سیوەیلیو ئەوانی تر، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٢، ل ٣٧-٣٨.

لەپرسیارنامەکەدا پرسیارەکان بەهەردوو شێوەی کراوەو داخراو (هەردوو جۆرەکە لایەنی باش‌و خراپیان هەیە) خراونەتەڕوو. لەبەرایییدا پرسیارنامەیەکی سەرەتاییمان ئامادە کردو پیشانی ژمارەیەك پسپۆری کۆمەڵناسیماندا[*]، دوای وەرگرتنی سەرنج‌و تێبینییەکانیان پرسیارەکانمان جارێکی دیکە دارشتنەوەو وەك تاقیکردنەوەیەکی سەرەتایی (٣٠) فۆرمان بەسەر نموونەیەکدا لەناحیەی بەحرکە دابەشکرد. دوای سەرنجدان لەچۆنییەتی پڕکردنەوەو وەڵامدانەوەی نموونەکە، جارێکی دیکە پرسیارنامەکەمان پوختر دارشتەوە لە(٥٥) پرسیاردا. بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (١) لەلاپەرە (٢٠٧).

## ٢-هەڵبژاردنی نموونەی تۆژینەوە

لەبەر ئەوەی ناکرێت، یاخود بەدەستەواژەیەکی تر، لەتوانای تۆژەر بەدەرە بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر لەکۆمەڵێکی دانیشتووانی بکۆڵێتەوە، واتە پرسیار لەهەموو تاکەکانی کۆمەڵگا بکات، چونکە ئەم جۆرە باسانە پێویستیان بەکاتێکی زۆر، گوژمەیەکی بەرچاوو کادیری زێتر هەیە، وێڕای ئەوەی لەڕووی پراکتیکیشەوە مەحاڵە، ئەوا هەڵبژاردنی ژمارەیەکی سنورداری تاکەکان، بەمەرجێك بەشێوەیەکی راست‌و دروست وەربگیرێن، هەڵبژاردنەکەیان لەگەڵ ماهیەتی تۆژینەوەکە بگونجێت، دەشێ سوودی زۆری هەبێت‌و زانیاری زۆریان لێ وەدەست بهێنرێن. ئەوەی لێرەدا گرنگە چۆنییەتی هەڵبژاردنی نموونەکەیە[5].

---

[*] ئەم بەڕێزانە ناویان لەخوارەوە هاتووە کەمامۆستان لەبەشی کۆمەڵناسی لەزانکۆی سەلاحەددین پرسیارنامەکەیان بینیوەو بەسەرنج‌و تێبینیەکانیان دەوڵەمەندیان کردووە: د. نوری هەرزانی، عەبدولحەمید بەرزنجی، تاهیر زیباری، عەبدوڵلا خورشید، عەبدولمەجید بەرزنجی، سەلیم پوترس، موسلح ئیروانی.

5 رودولف غيفليون وبنيامين ماتالون، البحث الاجتماعي المعاصر، ت: د. علي سالم، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، الطبعة الثانية، ١٩٨٦، ص ٢٧.

چەمكی نموونە، واتە چڕكردنەوەی سەرجەمی خەسڵەتەكانی كۆمەڵگای باس لەچەند كەسێكدا. نموونە بەشێكی سنووردارە لەڕووی چەندێتیو چۆنایەتیەوە پێكدێت لەكۆمەڵە كەسێك كەهەمان ئەو خەسڵەتانەیان هەیەو كۆمەڵگای تۆژینەوەكە خاوەنیانە، بەو مەرجەی دەرفەتی یەكسان بۆ بەشداریكردنی هەموو تاكەكان رەخسابێت[6].

هەندێك لەتۆژەران لەو بڕوایەدان هەڵبژاردنی نموونە پێویست دەكات لەسەر بنەمای تیۆر بێت. ئەم شێوازەش بریتیە لەهەڵبژاردنو دەستنیشانكردنی رووداوو كۆمەڵێك خەڵكو ماوەیەكی زەمەنی كەپەیوەندی بەسروشتی تیۆرو تۆژینەوەی نوێوە هەیە[7].

لەبەر پێویستی‌ی سروشتی‌ی تۆژینەوەكە پەنامان بردە بەر نموونەی رەمەكی. نموونەی رەمەكی بەرێگەی ئامار نوێنەرایەتی كۆمەڵگای باسەكە وەردەگیرێتو لەمیانەیدا رێگە بەتۆژەر دەدات بەبڕواوە ئەو ئەنجامانەی لەتۆژینەوەكەیدا پێیان گەیشتووە بەسەر كۆمەڵگای تۆژینەوەكەدا بسەپێنێت، لەسەر ئەو بنچینەیەی كەدەرفەتی یەكسان هەبووە بۆ هەر یەكێك لەتاكەكانی ئەو كۆمەڵگایەی وەك نموونە هەڵبژێردراوە[8]. هەروەها پێویستە مەسەلەی هەڵبژاردنی نموونە بایەخێكی تایبەتی پێ بدرێت، چونكە ئەو ئەنجامانەی لەتۆژینەوەكەدا پێیان دەگەین پەیوەندیان بەپێكهاتەی نموونەكەوە هەیە[9].

لەبەر ئەوەی دیاردەی راگواستنی كوردان لەعێراقدا تەنیا جۆرێكی نییە، هەروەها راگوێزراوەكان لەهەمان ماوەی زەمەنیو بۆ ژینگەیەكی چونیەك

---

6 د. معن خليل عمر، الموضوعية والتحليل في البحث الاجتماعي، منشورات دار الافاق الجديدة، بيروت ١٩٨٣، ص ١١٨.

7 بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: دیریك لایدر، هەمان سەرچاوە، ل ١٠٩-١١٥.

8 هەمان سەرچاوە، ل ١٠٩.

9 رودولف غیفلیونو بنیامین ماتالون، هەمان سەرچاوە، ل ٣٩.

رانەگوێزراون‌و بەیەك شێوەش مامەڵەیان لەگەڵ نەكراوە (لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ بەشی چوارەم)، نەدەكرا تەنیا دانیشتووانی ناوچەیەكی تایبەتی یاخود راگوێزراوەكانی یەكێك لەساڵەكان وەرگرین، بەڵكو وامان بەباش زانی نموونەكەمان بەسەر هەموو ئەو پارێزگایانەدا دابەشبكەین كەرێژەی كورد تیایاندا بەرزەو لەڕووی زەمەنیشەوە لەساڵی جیاجیادا راگوێزراون. لێرەشدا ئێمە تووشی دوو گرفت هاتین كەرێگر بوون لەبەرامبەر وەرگرتنی رێژەی یەكسان‌و گونجاو بەپێی شوێن‌و كات، ئەوانیش: یەكەم، نەبوونی ئامارێك كەروونبكاتەوە ژمارەی دانیشتووانە راگوێزراوەكان لەهەر پارێزگایەكدا چەندە. دووەم: نەبوونی ئامارێك كەروونبكاتەوە ژمارەی دانیشتووانە راگوێزراوەكان لەهەر ساڵێكدا چەندە. بۆیە ئێمە ناچار بوین بەپێی مەزەندەی خۆمان رێژەیان بۆ دیار بكەین بەپێی پارێزگاكان (بگەڕێوە خشتەی ژمارە-١٦-).

### ٣-ئاستەنگەكانی بەردەم تۆژینەوە

بێگومان لێكۆڵینەوە لەئاكامە كۆمەلایەتییەكانی راگواستن، بەو پێیەی راگواستن سیاسەتێكی داڕێژراو، درێژخایەن‌و سەرتاپاگیر بوو، بەدەر نابێت لەئاستەنگ‌و گرفت. ئەو گرفتانەی لەم باسەدا رووبەڕوومان بونەوە دەكرێ بەچەند خاڵێك دەستنیشانیان بكەین:

١-نەبوونی ئامارێكی وردو تەواو كە نەك تەنیا ژمارەی راگوێزراوەكان روون بكاتەوە، بەڵكو تەنانەت هیچ ئامارێكی وردمان دەست نەكەوت ژمارەی گوندە خاپوركراوەكانیش لەماوەی نێوان ساڵەكانی ١٩٦٣-٢٠٠٣ روون بكاتەوە. ئەمە لەلایەك، لەلایەكی دیكەوە بوونی جیاوازی لەنێوان رێژەی گوندە وێرانكراوەكان‌و ئەو ساڵانەی گوندەكانیان تێدا خاپور كراوە لەسەرچاوە جیاوازەكاندا. هەروەها نەبوونی ئاماری دیكەی جیاوازیش سەبارەت بەژمارەی دانیشتووانی كوردستانی باشور، مەڕو مالات، بەروبوومی كشتوكاڵی... هتد.

٢-کەمی سەرچاوەو لیکۆڵینەوەی جیاجیا لەبارەی کۆمەڵگای کوردی.

٣-نەبوونی ئامار یاخود پێوەرو ڕێسایەك کە بەپێی ئەو بەوردی نموونەی توژینەوەکەمان دەستنیشان بکەین.

٤-ئەو کاتەی ئێمە پرسیارنامەکانمان بەسەر نموونەکەدا دابەش کرد (مانگی شوباتی ٢٠٠٣)، ڕەوشی کوردستانی باشور لەبەر زاڵبوونی کەشی پڕ لەترس‌و نائارامی شەڕی سێیەمی کەنداو، بەرەو پشێوی چووبوو، ڕۆژ بەڕۆژیش گرژبەکەی زیاد دەبوو، ئەم هەلومەرجەش بارێکی دەروونیی نائارامی بۆ دانیشتووانی کوردستانی باشور دروستکردبوو کەیارمەتیدەر نەبو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان. هەروەها هەر لەبەر ئەو بارودۆخە نەمانتوانی تادوای کۆتایی هاتنی شەڕ بەشێکی فۆرمەکانمان بەسەر نموونەکەدا دابەش بکەین. بەمەش پڕکردنەوەی پرسیارنامەکان کاتێکی زۆر زێتری ویست.

٥-دیسان لەبارەی پڕکردنەوەی پرسیارنامەکان، وەك لەخشتەی ژمارە (١٠)دا دەردەکەوێت زۆربەی نموونەکەمان ڕەگەزی نێرن. هەرچەندە دەمانویست ڕێژەی دوو ڕەگەزەکە ئەگەر یەکسانیش نەبن لەیەکتر نزیك بن، بۆ ئەوەی بەتەواوی نموونەکەمان تەعبیر لەکۆمەڵگای توژینەوەکە بکات، بەڵام لۆجیکی باوکسالاری ڕێگرێکی گەورە بوو لەم بوارەدا. ڕوومان لەهەر ماڵێك دەکرد بۆ پڕکردنەوەی فۆرمێك یەکسەر پیاوەکە دەهاتە پێشەوەو ئافرەتەکەش خۆی دوور دەگرت، یاخود ئافرەتەکە چاوی لەدەمی پیاوەکە بوو وەڵامەکانی یان هەندێك لەوەڵامەکانی بۆ بداتەوە. یاخود هەندێك فۆرمان بەسەر قۆتابیانی قۆناغی چواری بەشی کۆمەڵناسی لەزانکۆی سلێمانی دابەشکردن، بۆ ئەوەی بەدایك‌و باوکیانیان پڕ بکەنەوە. هەرچەند پێمان گوتبوون پێمان خۆشە زێتر ڕەگەزی مێ پڕیان بکەنەوە، بەڵام کەبۆیان گەڕاندینەوە، زۆربەی هەرە زۆریان لەلایەن ڕەگەزی نێرەوە پڕ کرابوونەوە.

### ٤-چۆنیەتی هەڵێنجانی پرسیارنامە

بۆ تاوتویێ کردنی پرسیارنامە جگە لەوەی کاتێکی تارادەیەك درێژی پێویست بوو، لەبەر زۆری ژمارەی پرسیارنامەکانو پرسیارەکانی ناویان. پێویستە توێژەر ورد بێتو لەسەر خۆ کارەکە ئەنجام بدات، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە بەهەڵە هەندێك داتا تۆمار بکات. بۆ ئەوەی ئەگەری هەڵەکردن کەمبێتەوە، توێژەر لەبەتاڵکردنەوەی پرسیارنامەکاندا پرۆگرامێکی کۆمپیوتەری تایبەتی بەکار هێنا، بەناوی STATIGRAPHICS Plus 4.0 .
ئەم پرۆگرامە کە لەبنەڕەتدا پرۆگرامێکی ئامارییە، دەکرێ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بۆ بەتاڵکردنەوەی داتاکانو پۆلینکردنی زانیاریو راڤەکردنیانو دروستکردنی جۆرەها وێنەی بەیانی سوودی لیّ وەرگرن.

خەسڵەتی هەرە باشی ئەم پرۆگرامە ئەوەیە کە لەدوای بەتاڵکردنەوەی داتاکانی ناو پرسیارنامە، لەتوانای دایە بەماوەیەکی زۆر کورت خشتەی شیکاری جۆراوجۆرمان بۆ ئامادە بکات کەدەتوانین دواتر شیکردنەوەی خۆمانی لەسەر ئەنجام بدەین. هەروەها لەئەنجامدانی هەر هاوکێشەو دروستکردنی هەر خشتەیەکدا، لەگەڵ ژمارەی نموونەکاندا رێژەی سەدیشیان بۆ دیار دەکات. رێژەی سەدی هەر ژمارەیەك لەکۆی گشتیی نموونەکە وەرگیراوە نەك لەکۆی گۆڕاوەکە ئەمە پەیوەندی بەکارکردنی پرۆگرامەکەی خۆیەوە هەیە[١٠].

10 موسلح عەبدولقەهار ئیروانی، ئایینو ناسیۆنالیزم، رۆڵو کاریگەریو پەیوەندیی نێوانیان لەدوای راپەڕینی ١٩٩١ لەهەرێمی کوردستاندا، ماستەرنامە، بەشی کۆمەڵناسی، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین ٢٠٠٢، ل ١٠٤.

# بەشی پێنجەم

## دوای ڕاگواستن، ئۆردووگا زۆرەملێکان، شار و لادێ

### دەسپێکێکی گشتی

ڕاگواستنی کوردان تەنیا دامرکاندنەوەی کاتی شۆڕشی کورد، دابڕانی کوردەکانی عێراق لەگەڵ پارچەکانی دیکەی کوردستان، شێواندنی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ... هتد لێنەکەوتەوە، بەڵکو بە تێپەڕینی کات ئاکامگەلێکی کۆمەڵایەتی، کولتووری، پەروەردەیی، ئابووری... هتد بەدواداهاتن. لەم بەشەدا هەوڵدەدەین زێتر تیشک بخەینە سەر دەرهاوێشتە کۆمەڵایەتی ـ کولتوورییەکان، وێڕای ئامازەیەکی لابەلا بە لایەنەکانی دیکە، بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو باسە سەرەکیەکانەوە پێویست دەکات لە خوارەوە ئامازە بە هەندێك ئاکام و دەرکەوتەی گشتی بکەین.

ـ لەو ماوەیەدا کە ڕاگواستنی کوردان وەك سیاسەتێك پیادەکرا، بەتایبەتیش لە قۆناغی دووەمی ڕاگواستن (١٩٧٥ـ١٩٩٠)، ڕووبەرێکی فراوانی کوردستانی باشور بە زەویە قەدەغەکراوەکان لەقەڵەم دران و لە مرۆڤ داماڵڕان،* ئەمە لەلایەك، لەلایەکی

---

* ناتوانین مەزندە بکەین ئەو ڕووبەرە دەکاتە چەندکیلۆمەتری دووجا، لەبەر ئەوەی هیچ ئامارێکی وردمان لە بەردەست نییە.

دیکەوە لە ناوچە ڕانەگوێزراوەکان بەتایبەتی لە شارە سەرەکیەکان و دەوروبەریان چڕی دانیشتووان زۆر بەرز بووەوە.

ـ جگە لەوەی رووبەرێکی فراوان بە شێوەیەکی فەرمی لە مرۆڤ دامالڕا، هەندێك ناوچەی دیکە زێتر رووبەڕووی دیاردەی کەم دانیشتووانی (Depopulation) ** هاتن تا دامالینێکی تەواو لە مرۆڤ. هەندێك لە دانیشتووانی ناوچە سەر سنووری و دوورەدەستەکان دوای راگواستنیان گەڕانەوە ناوچەکانیان، لە هەندێك شوێنی دیکەش، چونکە رژێم ئەو گوندانەی رانەگواست کە دەکەوتنە نزیك جادەی سەرەکی و نزیك بوون لە شارە سەرەکیەکان بەڵکو ئەوانەی راگواست کە کەمێك دوورتر بوون، دیسان ئەو ناوچانەش هەر دووچاری دیاردەی کەم دانیشتووانی هاتن.

ـ سێیەم دیاردە کە بە ئاشکرا دیارە، لەلایەك زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی شارەکانە، لەلایەکی دیکەوە کەمبوونی ژمارەی لادێنشینەکانە. ئەمەش لە خشتەی ژمارە ٥ باشتر دەردەکەوێ:

---

** کەم دانیشتووانی ( Depopulation ) بریتیە لە: ((کەمبوونی ژمارەی دانیشتووان، بەهۆی راگواستنیان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە)). بگەڕێوە بۆ: عامر المبيض، معجم مصطلحات التنمية الاجتماعية و العلوم المتصلة بها، الامانة العامة لادارة العمل الاجتماعي، نيسان ١٩٨٣، ص ٤٩.

هەروەها دکتور شاکر موستەفا پێی وایە کەم دانیشتووانی : کەمبوونەوەی زۆری دانیشتووانی کۆمەڵگا یان کۆمەڵێك دەگەیەنێت، لەبەر یەکێك لەم هۆکارانە: بەرزبوونەوەی رێژەی مردن، بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکان، زۆری شەڕوشۆڕ، کۆچە ئیرادیەکان، راگواستن، یاخود برسێیەتی...هتد. بگەڕێوە بۆ: شاكر مصطفى سليم، قاموس الانثروبولوجيا، جامعة الكويت، ١٩٨١، ص ٢٥٤.

## خشتەی ژمارە (٥)

## دینامیکی دانیشتووانی شارەکان و گوندنشینان لە باشوری کوردستاندا (١٩٦٥_١٩٨٧)

| سەرژمێر | دانیشتووان (هەزار) | گوندنشین | | شارنشین | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | % | هەزار | % | هەزار |
| ١٩٦٥ | ٢٢٧١ | ٥٦,٥ | ١٢٥٣ | ٤٣,٥ | ٩٦٤ |
| ١٩٧٧ | ٣٣٠٣ | ٤٥,٨ | ١٥١٢ | ٥٤,٢ | ١٧٩١ |
| ١٩٨٧ | ٤٣٨٧ | ٢٩,١ | ١٢٧٦ | ٧٠,٩ | ٣١١١ |

* د. عەبدوللا غەفور، ئەتنۆ ـ دیمۆگرافیای باشوری کوردستان، بلاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٧٠. ئەم خشتەیە لە کتێبەکەدا ئاماری زیاتر لەخۆدەگرێت واتە هەر لە ساڵی (١٩٢٧)ەوە، بەڵام تەنیا ئەو ماوە زەمەنییەمان وەرگرتووە کە بۆ ئێمە پێویست بوو.

ـ ئاکامێکی دیکەی راگواستن کەمبوونی رێژەی دانیشتووانە کوردەکانە لەو ناوچانەی کە هاوسنوورن لەگەڵ عەرەب، لە بەرامبەریشدا زێدەبوونی دانیشتووانە عەرەبەکانە بە شێوەیەکی ناسروشتی لەو ناوچانەدا. بۆ زیاتر زانیاری، بڕوانە خشتەی ژمارە ٦:

## خشتەی ژمارە (٦)

## ڕێژەی کورد و عەرەب لە لیوا (پارێزگا) کانی مووسڵ، هەولێر، کەرکوک و دیالا

| لیوا | نەتەوە | ڕێژەی % لە ئاماری ١٩٥٧ | ڕێژەی % لە ئاماری ١٩٧٧ | ڕێژەی زیادبوونی عەرەب و کەمبوونی کورد لەو ماوەیەدا |
|---|---|---|---|---|
| مووسڵ | عەرەب | %٥٦,١ | %٧٣,٧ | %١٧,٤+ |
| | کورد | %٣٠,٧ | %٢٤,٨ | %٥,٨- |
| هەولێر | عەرەب | %٦,٦ | %١٠,٤ | %٣,٨+ |
| | کورد | %٨٩ | %٨٦ | %٣- |
| کەرکوک | عەرەب | %٢٨,١٩ | %٤٤,٤ | ١٦,٢١+ |
| | کورد | %٤٨,٢٤ | %٣٧,٦ | %١٠,٦٤- |
| دیالا | عەرب | %٧٩,٢٦ | %٨٧,٥ | %٨,٢٤+ |
| | نەتەوە | %١٨،٢١ | %١٦،٣ | %١,٩١ ــ |

* جەلال جەوهەر عەزیز، پاکتاوکردنی نەژادی لە کوردستان، گۆڤاری کەرکوک، ژمارە ٢ ،ساڵی سێیەم، سلێمانی، زستانی٢٠٠٢، ل ١٣. بابەتەکە و هەروەها خشتەکەش داتای زیاتر لەخۆ دەگرێت، بەڵام ئێمە بەپێی پێویستی وەرمان گرتووە.

هەڵبەت هەموومان ئاگادارین لەوەی کە لە دوای ساڵی ١٩٧٧ سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان بەگڕو تینی زۆر زێتر بووە، بەڵام زانیاری و داتای پێویستمان لەبەر دەست نییە.

- ئاکامێکی دیکەی سیاسەتی ڕاگواستن کەمبوونەوەی سامانی ئاژەڵی بوو لە ناوچە کوردنشینەکان. بۆ ئەم مەبەستەش وەك نموونە سەیری خشتە ژمارە٧ بکە.*

لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاماری تایبەت بە ئەنفالەکانی بادینان کە مەزندە کراوە ژمارەی ئەو خێزانانەی لەو شاڵاوەدا بەر ئەنفال کەوتن ١٤,٥٩٥ خێزان بێت، مەزەندە کراوە لەو هەڵمەتەدا ئەو خێزانانە ٣١,١٩٧ ولاخ، ٢٥٠,٩٩٥ پەز، ٤٣,٦٠٣ مانگا و گامێش و ٢٧٤.٣٦٩ پەلەوەریان لەدەست دابێت.[١]

- ئاکامێکی دیکەش کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین، کەمبوونەوەی ڕێژەی دارودرەخت و دارستانەکانە لە کوردستانی باشوردا، بۆ نموونە بە پێی ئاماری فەرمی ساڵی ١٩٨٨ وەزارەتی نەخشەکێشان، لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٨٥-١٩٨٧ لەسەدا ١٥ی دارستان و جەنگەڵەکانی کوردستانی خواروو لەناو بران.[٢]

---

* زانیاری وداتا لەم بارەیەوە ئێجگار دەگمەنن و دەستناکەون، ئەگەرنا پێویست بوو بزانین ساڵی ١٩٨٨ ژمارەکەیان گەیشتوتە چەند، چونکە بەدڵنیاییەوە لە دوای ١٩٩١ ئاژەڵەکان لە هەرێمی کوردستاندا ڕێژەیان زیاد بووە.

1 روؤف عقراوي، حملة على البادينان و احوال اللاجئين، الطبعة الثانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠٢، ص ١١٥.

2 د. کەمال سعید خەیات، باری ئابوری - کۆمەڵایەتیی لادێی کوردستان، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، هەمان سەرچاوە، ل ٨.

## خشتەی ژمارە (٧)

## جیاوازیی ژمارەی مانگا، مەڕ و بزن لە پارێزگای سلێمانی (١٩٧٥ـ ١٩٩٧)

| جۆری ئاژەڵەکە |ساڵی ١٩٧٥ | ساڵی ١٩٩٧ | جیاوازی نێوان ئەو ماوەیە |
|---|---|---|---|
| مانگا | ١٩٩,٥١٢ | ٩٩,٥٩٨ | ٩٩،٩١٤ - |
| مەڕ و بزن | ٥٦٩.٩٤١ | ٤٨٢,٢٧٣ | -٨٧،٦٦٨ |

* سەرچاوەکانی خشتەکە:

- الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج تعداد عام للسكان لسنة ١٩٧٧.

- کاوە جەمال رەشید، مەسەلەکانی کشتوکاڵ و ئاودێری لە کوردستاندا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە ٤، ساڵی شەشەم، سلێمانی، تشرینی دووەمی ١٩٩٨، ل ١٥٤.

## باسی یەکەم: ئۆردووگا زۆرەملێکان

مەبەست لە ئۆردووگا زۆرەملێکان، یاخود بەدەستەواژەی رژێمی بەعس ((گوندە هاوچەرخەکان))، ئەو ئۆردووگایانەن کە حکومەتی بەعس لەدوای ساڵی ١٩٧٥ بەمەبەستی نیشتەجێ کردنی کوردە راگوێزراوەکان دەستی بە دروست کردنیان کرد. ئەم گوندە هاوچەرخانە زۆر جیاواز بوون لە گوندە کوردییە رەسەنەکان. هەروەها لەنێوان خۆشیاندا لە هەر قۆناغێکی راگواستندا گۆڕانیان تێدەکەوت، واتە ئێمە یەك نەخشەی ئۆردووگا یان خانوومان نییە کە بەسەر هەموو ئۆردووگاکان و خانووەکانی ناو ئەم ئۆردووگایانەدا بگشتێنین، بەڵکو ئەم ئۆردووگایانە لە چەند قۆناغێکدا دروستکران و تا پێش راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ حکومەت بەردەوام بوو لە دروست کردنیان.

مەبەستی رژێم لە دروست کردنی ئەم ئۆردووگایانە کۆکردنەوەی لادێنشینە کوردەکان بوو لە سەرەتادا ئینجا شارنشینەکان، لەو شوێنانەی کە زێتر دەسەڵاتی بەسەریاندا دەشکا. واتە بەدەر لەوەی ئامانجی رژێم لە راگواستن چی بوو و پاڵنەرەکان چ بوون، ئەو ئۆردووگایانە بە پلەی یەکەم بەمەبەستی کۆنترۆڵی دانیشتووان دروستکران. هەر بۆیە بانگەشەی حکومەت بەوەی کە گوندی نوێ دروست دەکات بۆ ئەوەی لادێنشینان زێتر سوودمەند بن لە خزمەتگوزارییەکان و هەروەها باشتر کردنی رەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتیان یاخود بەشارستانی کردنیان، بانگەشەیەکی بێ بنەمایە*.

---

* لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٣-١٩٧٧ لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی عێراق چەند کۆنگرەیەکی کشتوکاڵی بەستران. لە میانەی ئەم کونگرانەدا پلانی راگواستنی لادێنشینان خرایە ناو چوارچێوەیەکی زانستیەوە. گوتاری سەرەکی ئەم

ئەم ئۆردووگایانە سەرەڕای چەندین کەموکووڕی لەڕووی خانووبەرە و ئەندازەوە، بە بەراورد لەگەڵ گوندە کۆنەکاندا گوندی نوێ بوون، لەلایەکی دیکەشەوە سەبارەت بە ئاو و کارەبا و هەندێك خزمەتگوزاری دیکەی وەك پەروەردە و تەندروستی باشتر بوون، بەڵام ئەم نوێبوونەیان لەتوانایدا نەبوو دڵی ڕاگوێزراوان خۆشکات یاخود کاریگەری ئەو شۆکە لەسەریان کەمکاتەوە کە لە ئەنجامی ڕاگواستن و کاولکردنی گوندەکانیان دووچاری هاتبوون. حکومەت ئەگەر مەبەستی باشکردنی ڕەوشی لادێنشینەکان بوایە، خزمەتگوزاریەکانی وەك شەقام و کارەبا و نەخوشخانە و قوتابخانە...هتد لە گوندە کۆنەکان دروست دەکرد کە هەڵبەت گوژمەکەی کەمتر دەکەوتەوە لەسەری بەبەراورد لەگەڵ ئەو پارەیەی حکومەت لە ئۆردووگاکانی خەرج دەکرد و پشت کردنی لەو دەرامەتە کەمەی لە ئابووری کشتوکاڵی و مەڕداری لادێنشینانەوە دەهات.

هەموو کۆچکردنێك تەنیا گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوون نییە، بەڵکو بۆ تاکەکان بەتایبەتی ئەوانەی بەنێو تەمەندا چوونە وەك جۆرێك لە ڕەگوڕیشە هەڵکێشان وایە. ئەگەر کۆچەکە زۆرەملێ بێت ئەوا شۆکەکەی زۆر گەورەترە لەسەر دەروونی کۆچپێکراوەکان. هەر گۆڕانێك لە ژینگەی سروشتی یان کۆمەڵایەتی گۆڕانگەلێکی دیکەی بەدواوەیە لە ڕەفتار و کرداری تاکەکان. وێڕای ئەوەی گۆڕانەکانیش

---

کۆنگرانە لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە گوایە گوندەکانی عێراق بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی کەموکووڕیان زۆرە، بنکەی تەندروستی، قوتابخانە، تۆڕی ئاو و کارەبایان تێدا نییە و هەروەها لە سیمای شارستانی بێ بەشن. هەر بۆیە پێویستە کۆبکرێنەوە و لە ئۆردووگای مۆدێرن و زانستیدا نیشتەجێ بکرێن. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: د. ئازاد شێخانی، ئەنفال لە نێوان چوارچێوەی قۆناغەکانی دروستکردنی ئۆردوگا زۆرەملێیەکاندا، سەنتەری برایەتی، ژمارە٢٤، هەولێر هاوینی ٢٠٠٢، ل ٤٣٧ـ ٤٣٨ .

بەئاسانی ناسەپێن. هێزێك هەیە هەمیشە ڕێگرە لەبەردەم گۆڕانـدا، ئەگەرچی گۆڕانەکە لە ئەنجامدا هەر ڕوودەدات.

خەڵکی ڕاگوێزراو کە دەیزانی حکومەت بۆ بەرژەوەندی خۆی نـەك بەرژەوەندی ئەوان بەزۆر ڕاپێچـی کـردوون و خـانوو و کانیاوەکانیـانی تەقاندووتەوە، ئاگادار بـوون لـەوەی حکومـەت پیـلان دەگـێڕێت لـە دژیـان، دەیزانـی مەبەسـتی حکومـەت لـە ڕاگواسـتنیان زێـتر چەوساندنەوە و بەرزەفتە کردنیانە؛ هەموو ئەمـەش ئـەوانی هـاندەدا بەرنگاری ئەو سیاسەتە ببنـەوە، هەرچـەندە ئـەوان هیـچ ڕێوشـوێنێك یاخود میکانیزمێکی ئەوتویان نەبوو بۆ بەرنگاربوونەوە. نـاڕازیبوونی خەڵك بە ئاشکرا دیار بوو، ئەم نارەزاییە لە زۆر شـێوەدا دەردەکـەوت؛ بۆ نموونە حکومەت بۆ ئەوانەی لە ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ دا ڕاگوێزران ئۆردووگاگەلێکی ئامادە کردبوو کە ئاوی بـۆڕی، کارەبـا، قوتابخانـە، نەخۆشخانە، مزگەوت و خزمەتگوزاری دیکەی ئامـادە کردبـوون. دار تێلەکانی کارەبا لەسەر شەقامەکان هەموویان گلۆپیان هەبوو بەشەو شەقامەکانیان ڕووناك دەکردنەوە، بـەڵام لـە ماوەیـەکی کـەمدا هیـچ یـەکێك لـەو گلۆپانـە نـەمان، چونکـە منداڵـەکان بـە دار لاسـتیك هەموویانیان شکاند و کەسێك نەبوو ڕێگەیان لێ بگرێت یان داخی بۆ بخوات، ئەوان هەم بەم کارەیـان وایـان دەزانـی سـەرپێچی حکومـەت دەکەن و هەمیش کە لە تـاریکیدا گـەورە ببـوون چ پێویسـتیان بـەم ڕووناکیە نەبوو. ئەمە سەبارەت بە جـامی پەنجـەرەی قوتابخانـەکانیش ڕاستە. هەروەها ژمارەیەك لە دانیشتووانی ئەم ئۆردووگایانـە لـەدوای یەك دوو ساڵ یان زێتر مانەوەیان ڕێگەی چیاکانیان گرتەوە بـەر، یـان چوون بۆ ئێران یان گوندە وێرانکراوەکانیان ئاوەدان کردنـەوە، ئەمـەش جۆرێکی دیکەی بەرەنگاربوونەوەیان بوو لەدژی سیاسەتی ڕاگواستن.

پێـش ئـەوەی ئێمـە بپرژێینـە سـەر ژیـان لـە ئۆردووگاکـاندا و

لەبارەیانەوە بدوێین، پێویستە دوو شت لەبەر چاو بگرین: یەکەم، هەندێك لە ئۆردووگاکان لە سەرەتادا، واتە لە ناوەڕاستی حەفتاکان هەروەها دواتریش لە کۆتایی هەشتاکان وەك ئۆردووگای ساردا و لەنێوان مێرگەسوور و گەلی عەلی بەگ زۆر لە سنوورەکان دوور نەخرانەوە، یاخود بڵێین ژینگەی جۆگرافی هەندێك لە ئۆردووگاکان لەگەڵ ژینگەی خەڵکە راگوێزراوەکە هێندە جیاواز نەبوو، وەك ئۆردووگاکانی شێلادزێ، دێرەلۆك، عەنەب، بنگرد، گورەتوو، پێمالك.
لەکاتێکدا ژینگەی جۆگرافی هەندێکیان زۆر جیاواز بوو وەك ئۆردووگاکانی بەحرکە، پیرزین، سێبیران لە دەوروبەری هەولێر کە خەڵکی دەڤەرەکانی بارزان و باڵکایەتی لێ نیشتەجێ کران. بەشێکی دیکەیان ژینگەکەیان بە تەواوی جیاواز بوو وەك ئەوانەی لە باشووری عێراقدا دروستکران. ئەم ئۆردووگایانە بە شێوەیەکی گشتی خاوەن شێواز و پلانێکی ستاندار بوون، بەڵام لە مانەدا بە هیچ جۆرێك رەچاوی ئاووهەوا و فاکتەری کۆمەڵایەتی و ئابووری و پاشخانی کولتووری و بارودۆخی لادێنشینەکان نەکرابوو.[٣]
دووەم، بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی خەڵکی ئۆردووگاکان دەبێت سەیری ئۆردووگاکان نەکەین لە ئەمڕۆی خۆیاندا، بەڵکو هەندێك بگەڕێینە دواوە، بۆ سەرەتای دروست کردنیان و بزانین ئەو کات چۆن بوون نەك ئێستا، خانوو، شەقامەکان، بوونی دارودرەخت و دامەزراوەکان هەموویان ئەمڕۆ جیاوازن. پشتبەستن بە ژیانی ئەمڕۆی ئۆردووگاکان بۆ تێگەیشتن لە ژیان لە ئۆردووگاکاندا بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەو گۆڕانانەی بەسەریاندا هاتوون بەزەحمەت هەندێك لە واقیعمان بۆ رووندەبێتەوە؛ بۆ نموونە ئەمڕۆ لە ئۆردووگایەکی وەك

---

3 هەمان سەرچاوە، ل ٤٣٩.

ئۆردووگای بەحرکەدا کە هەندێك لە خانووەکانی زۆر نوێ و بەرچاون هەروەها جادەیەکی قیرتاوکراو بە ناوەڕاستیدا دەڕوات و لە دوورەوە لەبەر زۆری دارودرەخت لە باغێك دەچێت، شەقامی ناو کۆڵان و گەڕەکەکان راست و رێك و خاوێن و هەمووی بە بلۆك دروست کراو، زۆربەی خانووەکان سپی کراو یان بۆیە کراو، ئەمانە هەر لە سەرەتاوە بەم جۆرە نەبوون، بەڵکو دوای تێپەڕینی زێتر لە بیست ساڵ و بە سەردا هاتنی بارودۆخی جیاواز ئەو گۆڕانانەی بەخۆوە بینیون.

حکومەت لە سەرەتای دروست کردنی ئەم ئۆردووگایانەدا، واتە لە سالانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩، * زۆرترین ژمارەی ئۆردوگای دروست کرد. ئەم ئۆردووگایانە هەموویان یەك قەبارەیان نەبوو، [4] هەروەها یەك جۆر خانووش لە هەموو ئۆردووگاکاندا دروست نەکرا، ئەو کەرەستەیەی لە خانووەکانیشدا بەکار هات، هەمووی یەك جۆر کەرەستە نەبوو. بەگشتی دەتوانین بڵێین هەر خانوویەك لە دوو ژوور، موبەق، گەرماو، توالێت و حەوشەیەك پێکهاتبوو. [5] دیواری خانووی هەندێك لە ئۆردووگاکان لە بەرد و گەچ دروست کرابوون بانەکەشیان خۆل بوو، بە کاریتەی سپیندار یاخود ئەنگەلاین دارەڕا کرابوون. دیواری هەندێکی دیکە بە بەرد و چەمەنتۆ و بانەکەشیان کۆنکریت بوو، ئەمانە رووبەرەکەیان بچووکتریش بوو لە ئەوانەی پێشوو، بەڵام لە

---

* لەدوای نسکۆی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ راستەوخۆ حکومەت دەستی کرد بە دروست کردنی ئۆردووگا زۆرەملێکان، بەڵام ئێمە نموونەی ئەو ئۆردووگایانەمان لە بەر دەست نییە، چونکە لەو دوو ساڵەدا ئۆردووگا زۆرەملێکان لە باشوری عیراق دروست کران، تۆژەر نموونەی ئەو ئۆردووگایانەی نەبینیون، بۆیە کەمتر ئاماژەیان پێدەکات.

4 ژمارەی خانووکانی هەر ئۆردووگایەك لە نێوان ٣٠٠ـ ٤٠٠ و رەنگە زیاتریش بێ، بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: د. خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩، ص ٣٦٥.

5 بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

هەردوو جۆرەکەدا نە ناوماڵەکە چەمەنتۆ و نە دیوارەکان سپی و بۆیە کرابوون، هیچ یەکێك لە خانووەکانیش حەوشەیان بۆ نەکرابوو. رووبەری هەر خانوویێك بە حەوشەوە کە بۆی دیاریکرابوو نزیکەی ٢٠٠ مەترێك دەبوو. ئاوی بۆری لە زۆربەی ئۆردووگاکاندا رانەکێشرابوو هەروەها کارەباش بەهەمان شێوە، بە گشتی بە خانووەکانەوە دیار بوو کە پەلە لە دروست کردنیان کراوە. لە هەر ئۆردووگایەکدا دواتر قوتابخانە (سەرەتایی و ناوەندی)، بنکەی تەندروستی، مزگەوت، باخچەی ساوایان، فرنی سەمون، ناوەندی لاوان و رێکخراوی حزبی ... دروستکران، وێڕای راکێشانی ئاوی بۆری و کارەبا بۆ هەر ماڵێك. ساختومانە حکومیەکانی ناو ئەم ئۆردووگایانە لە هەموو ئۆردووگاکاندا تاڕادەیەك هەمان نەخشە بوون. ئەم ئۆردووگایانە لە سەرەتادا لە ژمارەیەکی زۆری خانووی بێ حەوشە و یەك رەنگ و لەیەکچوو زیتر شتێکی دیکەیان لێ نەدەبینرا، چونکە لە سەرەتادا ساختومانە حکومیەکان دروست نەکرابوون، هیچ درەختێك لە ناویاندا نە روێنرا بوو، مەگەر ئەوانەی شوێنەکەیان شاخاوی بێت بە خۆرسك هەندێ درەخت لەوێ روابن. راگوێزراوان زۆر جار بەزەحمەت بە خانووەکانیان دەکەوتنەوە، لەبەر تەواو پێکچوونیان کە هیچ شتێکی جیاواز لەنێوان خانووەکاندا نەبوو، بەڵام نابێت ئەم فۆرمەی ئۆردووگاکان بەسەر هەموویاندا بگشتێنین.

لە قۆناغەکانی دواتری نیشتەجێکردنی راگوێزراوەکاندا حکومەت زۆر کەمتر ئەرکی خانوو دروست کردنی لە ئەستۆ دەگرت، بەڵکو زیتر پارە یان کەرەستە یاخود هەردووکی بە راگوێزراوەکان دەبەخشی لەگەڵ پارچەیەك زەوی بۆ هەر خێزانێك کە خانووی لەسەر بکات. بەڵام سەبارەت بە ئەنفالکراوەکان (١٩٨٧ـ١٩٨٨)، بۆ نموونە ئەو پازدە هەزار کەسەی لە ساڵی ١٩٨٨ لە جێژنیکان نیشتەجێ کران،

حکومەت نەپارە و نەکەرەستە و نـە هیـچ شـتێکی پـێ بەخشـین بـۆ دروسـت کردنـی خـانوو، تەنانـەت دوای ئـەوەی سـاڵێك لـەوێ نیشتەجێبوون هێشتا هیچ نەخشەیەکی بۆ ئـەو ئۆردووگایـە کـە زۆر قەرەباڵغ بوو نەکێشابوو، دواتر شـەقامەکانیان بـۆ دیـار کـران و زۆر خانوو کـە لـە راستیدا خـانوو نـەبوون بـەر شـەقامەکان کـەوتن و تێکدران، بۆ ئەو ژمارە زۆرەی هاووڵاتیان تەنیا بنکەیەکی تەندروستی و قوتابخانەیـەکی سـەرەتایی دروسـتکران لەگـەڵ دوو سـاختومانی حکومی کە یەکێکیان رێکخراوی حزبی و ئەوی دیکە بنکەی پۆلیـس بوو، هیچ مزگەوتێك یاخود باخچەیەکی ساوایان دروست نەکرا (ئەمە رەوشی زۆربەی ئەو ئۆردووگایانە بوو کە لەو ماوەیەدا دروستکران).

ئـەو ئۆردووگایانـەی لـە هەشـتاکان دروسـتکران جیاوازیـەکی دیکـەیان لەگـەڵ ئەوانـەی حـەفتاکان ئـەوەبوو کـە ژمارەیـەکی زۆر خێزانیان لێ نیشـتەجێ دەکـرا، بـەجۆرێك کـە ژمـارەی دانیشـتووانی هەندێکیان زۆر زێتر بوو لە ژمارەی دانیشـتووانی هـەندێ شـارۆچکە. ژمارەی دانیشتووانی ئۆردووگاکانی نیـوەی یەکـەمی هەشـتاکان لـە نێوان ١٧٠٠٠ـ ٢٠٠٠٠ کەس دەبۆن، بەڵام ئەوانەی لە نیوەی دووەمی هەشتاکان دروستکران وەك بنەسلاوە، دارەتوو، شۆڕش، سمـوود...هتـد ژمارەی دانیشتووانیان زۆر زێتر بوون. ژمارەی دانیشتووانی ئۆردووگـای شۆڕش لە چەمچەماڵ گەیشتە ٦٠٠٠٠ کەس و ئۆردووگای سموودیـش ٥٠٠٠٠ کەس.[6] هەر بۆیەش دەبینین ئەمرۆ زۆر لەم ئۆردووگایانە بوون بە نـاوەندی ناحیـە، تەنانـەت قەزایـەکی وەك سـۆران کـە ئـەنجامی راگواستن بوو بـۆ بـە قـەزاو وا خەریکـە دەکرێتـە نـاوەندی پارێزگـا. هەروەها پێویستە ئەوەش لە یاد نەکـەین کـە تـەنیا لادێنشـینان لـە

6 د. ئازاد شێخانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤٠.

ئۆردووگاكان نیشتەجێ نەكران، بەڵكو زۆر لە راگوێزراوەكان كە لە ئۆردووگاكان نیشتەجێ كران دانیشتووانی شار و شارۆچكەكان بوون، وەك هەندێك لە دانیشتووانی شاری كەركوك یاخود دانیشتووانی دوو شارۆچكەی قەڵادزێ و هەڵەبجە.

ئەو راگوێزراوانەی بۆ ناوەڕاست و باشوری عێراق راگوێزران، رەنگە دووچاری خراپترین هەلومەرجی ژیان هاتبن، ئەوان بۆ ژینگەیەك راگوێزران (ناسریە، دیوانییە، رومادی...) كە دەكرێ بڵێین بۆ چیانشینەكان ژینگەی ژیان نەبوون، ئۆردووگاكان زێتر لە دۆزەخ دەچوون تاكو جێی حەوانەوە، ئەمانە هیچ شتێكی وەهایان لەگەڵ خویاندا نەبرد و زۆربەشیان بێ خانوو لەوێ نیشتەجێ كران، كەشوهەوایەكی گەرم، تەپ و تۆز، ئاوی كەم و گەرم و سوێر و... هتد. ئەگەرچی ژمارەیەكیان بۆ باكور راگوێزرانەوە وەك ئەوانەی لە ئۆردووگاكانی قوشتەپە نیشتەجێ كران، بەڵام ژمارەیەكی زۆریان ئێستاش هەر لەوێ ژیان بەسەر دەبەن وەك ئەوانەی لە فەلوجە كە ماندوویەتی و نامۆیی بە ئاشكرا بە سیمایانەوە دیارە.

دوای ئەوان دانیشتووانی پشتێنەی سنووری راگوێزران، رەنگە ئەم دەستەیە خۆشبەختترین راگوێزراوەكان بن. وێڕای هەموو ئەو دەردەسەریەی بە سەریان هات لە راگواستنیان و تەقاندنەوەی خانووەكانیان، هەموویان خانووی نوێیان بەركەوت و لە ناوچە كوردنشینەكان نیشتەجێ كران، هەمووشیان بەجۆرێك لە جۆرەكان قەرەبوو كرانەوە و رێگەیان پێدرا هەموو شتێكیان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن تەنانەت ئاژەڵەكانیان. بەڵام ئەمانەش هەموویان وەك یەك نەبوون لەڕووی قەرەبوو كردنەوە و نیشتەجێ كردنیان لە شوێنە جیاوازەكان. هەندێك لەم راگوێزراوانە لە دوای كۆتایی هاتنی جەنگی عێراق ـ ئێران، دیسان راگوێزرانەوە بۆ شوێنی دیكە وەك ئەوانەی

ئۆردووگـای گورەتـــوو لـــە قـــەزای مێرگەســـوور و پێمـــاڵك لـــە قەزای قەڵادزێ.
سێیەم گروپی ڕاگوێزراوەکـان کـە ژمارەیـان تاڕادەیـەك زۆر بـوو، پاشماوەی پەلاماری ئەنفالەکان بوون. ئەمانە دوای ئەوەی لـە مـەرگ و برسێتی و تینوویەتی رزگاریان بوو، هەر لە ناوچە کوردنشینەکان بـێ خانوو و بێ هیچ یارمەتی و کومەکێك و لەژێر چاودێریـەکی تونـدا نیشتەجێ کران، وەك ئەوانەی لە ئۆردووگاکـانی ناوچـەی گـەرمیان و ئۆردووگای جێژنیکان لە باکوری رۆژئاوای شـاری هـەولێر نیشـتەجێ کران. ئەم گروپە ئەگەرچی بـە رەوشـێکی زۆر سـەختدا تێپـەڕین تـا نیشتەجێ کران، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوانەی بۆ باشور ڕاگوێزران، دوای راپەڕینی ١٩٩١ ژیانیان باشتر بەڕێوە دەچێت و تاڕادەیـەکی بـاش لـە ئازادی سوودمەندن وەك هەموو خەڵکی کوردستانی باشور.
ئەو ڕاگوێزراوانەی لە ناوچـە عەرەبنشـینەکان نیشـتەجێ کـران، هەندێکیان گەڕانەوە ناوچە کوردنشینەکان و ژمارەیـەکی زۆریشـیان هەر لە بنەڕەتدا لە ئۆردووگاکان نیشتەجێ نـەکران، بـەڵکو بەسـەر گوندە عەرەبنشینەکاندا دابەش کران. ئەوانەی لە پەلاماری پشـتێنەی سـنووری ڕاگوێـزران ژمارەیـەکی زۆریـان چوونـەوە زێـدی خۆیـان و گوندەکانیان ئاوەدانکردنەوە، بەڵام ئەو ئۆردووگایانە نەك تەنیا لە ناو نەچوون، بەڵکو یان وەك خۆیان مانەوە یان گەورەتر بـوون و بـۆن بـە ناوەندی ناحیە و قەزاکان. لەو نێوەدا دەتوانین تەنیا ئاماژە بـە چـەند حاڵـەتێکی زۆر دەگمـەن بکـەین کـە وەك ئۆردووگـا نەماونەتـەوە، لەوانەش سێ ئۆردووگای جێژنیکان، بەرحوشتر و گردەچاڵ لە بـاکوری شاری هەولێر، کە نیشتەجێیەکانیان پاشماوەی کیمیابارانی هەڵەبجـە، ئەنفالی بادینان و ئەو خەڵکەی ناوچە جیاجیاکان بوون کـە لـە دوای لێبوردنی ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨ لە ئێران و تورکیـا گەڕابوونـەوە.

ئەم سێ ئۆردووگایە دوای راپەڕین چۆڵکران و زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانیان بۆ زێد و ناوچەکانیان گەڕانەوە و چیتر وەك ئۆردووگا سەیریان ناکرێت.

دانیشتووانی ئەو ئۆردووگایانەی لە ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩دا نیشتەجێ کران، بەگشتی دوای راگواستنیان باری ئابووریان بەرەو باشتر چوو. خانووەکانیان ئەگەرچی حکومەت هیچ بایەخێکی وای پێنەدابوون، بەڵام بەزۆری لەو خانووانە گەورەتر و خوشتر بوون کە لە گوند هەیانبوو، رەوشی تەندروستی و خوێندەواری گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەجۆرێك دەتوانین بڵێین ئەم راگوێزراوانە لە سوودمەندترین راگوێزراوەکان بوون. لەبەرئەوەی ئەوکات حکومەتی عێراق لە لوتکەی دەولەمەندی و خوشگوزەرانی خۆیدا بوو. بەگشتی ژیان لە عێراقدا بەئاسانی و بەبێ ماندوبوونێکی ئەوتوو بەرێوەدەچوو. ئەم راگوێزراوانە زۆربەیان لە ژینگەیەکدا راگوێزرابوون کە ژیان تێیدا زۆر سەخت بوو، بەڵام بەوەی کە پارەیەکی تاڕادەیەك زۆریان لە حکومەت وەرگرت و ژمارەیەکی زۆریان وەك کارمەند لە دامەزراوە حکومیەکاندا دامەزران و ئەوانی دیکە کاری تریان دەکرد و پارەیەکیان دەست دەکەوت کە ژیانیان پێ بەرێوەدەچوو. ژیانیان زۆر بەلاوە ئاسان ببوو، بەجۆرێك کە ئامادە نەبوون بەهیچ شێوەیەك نە زۆر خۆیان ماندوو بکەن و نە زۆر لە خەمی ژیاندا بن، لەبەرئەوەی ئەوان هیچ کاتێك وەکو ئەودەم پارەیەکی زۆریان لەلای خۆیان نەبینیبوو، هیچ شارەزاییەکیان لە چۆنییەتی مامەڵەکردن بە پارە و هەروەها سەرمایەگوزاری کردنی ئەو پارەیە لە پرۆژەکانی دیکەدا نەدەزانی، لەماوەیەکی کەمدا زۆربەیان ئەو پارەیەی هەیانبوو لە دەستیان دا و بەدەگمەن کەسانێك لەو خەڵکە توانی سوود لەو پارەیە وەرگرێت، بەڵام ئەوەی بۆیان مایەوە تێکەڵاوبوونیان بوو بە خەڵکی دیکە و

خۆرزگارکردنیان بوو لەو ژیانە ساکارەی جاران و دواتریش خوێندەواربوونیان. ئەم گروپە ژیانیان زۆر گۆڕاوە، بەجۆرێك کە دوای زێتر لە بیست ساڵ بەزەحمەت جیاوازی لەنێوان شێوازی ژیانی هەندێك لەوان و شارنشینەکاندا دەکرێت.

دەشێ باس لەوەش بکەین کە دوای راپەڕین و ئەو قات و قڕیەی کوردستانی خوارووی گرتەوە، لەنێو هەرسێ شێوەی نیشتەجێیەکان (شار، لادێ و ئۆردووگا)دا دانیشتووانی ئۆردووگاکان دووچاری خراپترین رەوشی ئابووری هاتن، چونکە لادێنشینەکان زێتر پشتیان بە زەوی و زار و ئاژەڵەکانیان بەست و خەڵکی شارەکانیش زێتر کاریان دەست دەکەوت. هەژاری و پەشێوی زێتر لەو ئۆردووگایانەدا دەرکەوت کە لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا دروستکران. ئەو ئۆردووگایانەی لە ١٩٨٧ـ١٩٨٨ دروستکران. خەڵکی ئەنفالکراویان لێ نیشتەجێ کردن. ئەمانە لە میانەی ئەنفالدا نە پارە و پول و نە کەرەستەی ناومال و نە هیچ شتێکیان نەمابوو. لە ئۆردووگا سەرلەنوێ دەستیان پێ کردەوە. ئەوانەش کە لە ١٩٨٩ـ١٩٩٠ راگوێزران وێڕای ئەوەی کەرەستەی خانوویان پێ بەخشرا، بەڵام بەوەی سەرلەنوێ خانوویان دروست کردنەوە پارەیەکی زێتریان رۆیشت و حکومەت کەرەستە و ئەو پارە پێویستەی پێ نەبەخشین کە پێویست بوو لە دروستکردنی خانوودا خەرجی بکەن. هەروەها لەبەرئەوەی راستەوخۆ لە ساڵی ١٩٩٠ قەیرانی ئابووری عێراق سەریهەڵدا، ئەم دوو گروپەی راگوێزراوان لەو ماوە کەمەدا نەیان توانی رەوشی ئابووری خۆیان رێکبخەنەوە. بۆیە لە دەیەی رابردوودا هەژاری زۆر کاری تێکردن.

لەبارەی پیشە لە گوندی کوردیدا، پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە لادێنشینە کوردەکان زۆربەی هەرە زۆریان جوتیار بوون،

بەدەستەواژەیەکی دیکە لە بـواری کشـتوکاڵدا کاریـان دەکـرد، زەوی داچاندن، بـەخێوکردنی مـەڕومـاڵات ... بـە نیشـتەجێ کردنیـان لـە ئۆردووگاکـاندا نـەیانتوانی درێـژە بـەم پیشـانە بـدەن، چونکـە بـە ڕاگواستنیان هەموو زەوی و زارەکانیان لەدەست چوو، هەروەها وێـڕای ئەوەی بەشێکی زۆری دانیشتووانی ئەم ئۆردووگایانە تا ئەمڕۆش ئاژەڵ بەخێو دەکەن، ژمارەی ئاژەڵەکانیان زۆر کەمترە لە جاران و بە دەگمـەن مەڕ و بزن بەخێو دەکەن، بـەڵکو چێڵێـك یـان زێـتر بـەخێو دەکـەن، ئەویش بـۆ پێویسـتیی ڕۆژانـە نـەك زێـتر. چیـتر ئـەوان لـەو ژیانـە ساکارەشیاندا ناژین کـە پشـت بـە بـەخێو کردنـی ئـاژەڵان ببەسـتن، سەرباری ئەوەی کە لەوەڕگا لە دەوروبەری ئەو ئۆردووگایانە زۆر کەم و تەسکن و بەکەڵکی بەخێو کردنی مەڕوماڵات نایەن.

هەر لەگەڵ ڕاگواستنی لادێنشینان بەتایبەتی خـەڵکی پشـتێنەی سەر سنوور هەروەها ئەوانەی پێش ئەنفالەکان ڕاگوێزران، ڕوویـان لـە کۆمەڵێك پیشەی دیکـە کـرد: فەرمانبـەری حکومـی، دوکـانداری، شوفێری، کرێکاری ... لە سەرەتادا ژمارەی فەرمانبەرەکان لە هـەموو ئەوانی دیکە زێتر بوو، بەڵام لە دوای ئـەوەی شـەڕی عـێراق ـ ئـێران درێژەی کێشا، حکومەتی بەعس دەستی کرد بە سەربازگیری و دروست کردنی ((فەوجە خەفیفـە))کـان زۆربـەی زۆری پیاوەکـانی نـاو ئـەم ئۆردووگایانە ڕوویان لە ناونووسی کـرد لـەو فەوجانـەدا و بـوون بـە جاش، تا کۆتایی هاتنی شەڕی عێراق ـ ئێران تاکوتـەرا نێرینـەکانی سەروو هەژدە ساڵی کە قوتابی نەبوون مانەوە نەبن بە جاش. لێرەشـدا وێڕای ئەوەی کە زۆربەی زۆری ئەو خەڵکـە لـە ناچـاری و بـە ئـاپۆرە دەچوون خۆیان نـاونووس دەکـرد، خـەڵکێکی بـەرچاویش بـە حـەزەوە چەکیان لە شان کرد. لێرەدا نـاکرێ ڕۆڵـی ئـەو سـەرۆك عەشـرەت و ئاغایانە لـەبیر کـەین کـە فـەوجی خەفیفـەیان دەرکـرد و بـوون بـە

((موستەشار))، ئەمانە بە خۆشی و ناخۆشی خەڵکیان ناچار دەکرد چەك لە شان کەن. ئەو ئاغایانە دوای ئەوەی لە گوندەکان راگوێزران و ئەو رۆڵ و پێگەیەی جارانیان لە دەستدا کە خاوەنی بوون، چونکە لە ئۆردووگا هەمیشە خەڵك ناچار نەبوو ئاغا کێشەکانیان چارەسەر بکات و هەمیشەش بۆ ئاغا نەدەلوا دەست بخاتە ناو ورد و درشتی ژیانی خەڵکەکە، موستەشاری و فەوجی خەفیفە دەرفەتێکی زێرین بوو بۆ زۆربەی ئاغاکان کە هەم ئەو دەسەڵاتە لەدەستچووەی جارانیان بەدەست بهێننەوە و هەمیش پارە و پولێکی زۆر بەسەر یەکەوە بنێن. بەڵام بە هیچ شێوەیەك ناکرێ بڵێین ئاغایەتی لەو ماوەیەدا وەك ئاغایەتی جاران بوو یاخود خەڵکی بەهەمان چاوەوە سەیری موستەشاریان دەکرد کە لە گونددا سەیری ئاغایان دەکرد. لەو ماوەیەدا خەڵکێك کە پێشتر ئاغا نەبوون توانیان ئەو هەلە بقوزنەوە و لە ئاغا کۆنەکان دەسەڵاتیان زێتر بێت یاخود ئەوانەی خۆیان خزاندە نێو دەزگای ئاسایش و هەواڵگریی رژێمی بەعسەوە دەسەڵاتیان لە موستەشارەکان زێتر بوو.

جاشایەتی تاکە پیشەی خەڵکی ئۆردووگاکان نەبوو، زۆرێك لە دوکاندار، شوفێر، کرێکار، بازرگان و...هتد کە خۆیان ناونووس کردبوو بۆ تەنیا چەند رۆژێکیش نەچوون بۆ ناو رەبیەیەك، بەڵکو ئەمانە "بن دیوار"یان پێ دەگوت و موستەشار ئەو پارەیەی بە ناوی ئەوانەوە لە حکومەت وەردەگرت، دەئاخنییە گیرفانییەوە و ئەوانیش ئیجازەی بەردەوامیان بۆ دەهاتە ماڵەوە و لە سەر ئیش و کارەکانیان بەردەوام بوون.

راگوێزراوەکان لە ئۆردووگاکاندا یەکەمین شت کە رووبەڕووی دەهاتن رێکخراوی حزب بوو، رێکخراوی حزبی بەعس داوای خۆ بەحزبی کردنی لە هەموو هاووڵاتییەك دەکرد، هەروەها جگە لە

بەخشینی ئیمتیاز و بەڵێنپێدانیان بە زۆر شت، ترسیان وەك میکانیزمێك بەکار دێنا، بەعس لە مەدا تارادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو، تەنانەت توانی وا لە خەڵك بکات هەمیشە ترسیان لە دڵدا بێت و متمانە بە یەکتر نەکەن، کێشەکەش لە بەحزبی کردنی تاکەکان کۆتایی نەدەهات، ئەندامی حزبی بەعس پێویست بوو لە سەری راپۆرتی بەردەوام بنووسێت و کاریان بۆ بکات. بۆیە لەم قۆناغەدا سیخوری بوو بە پیشەی کەسانێکی بەرچاو و بەهۆی ئەم سیخۆڕانەشەوە کەسانێك لە سێدارە دران و کەسانێکی زۆر زێدەتریش دووچاری ئەشکەنجەی جۆراو جۆر هاتن. هەرچەندە ئەم دیاردەیە لە شار و گوندە رانەگوێزراوەکانیش هەبوو، بەڵام وەك بەرچاو دەکەوت لە ئۆردووگاکان زۆر ترسناك تر بوو، چونکە لەوێ بە حوکمی شێوەی دروستکردنی خانووەکانی ئۆردووگا و ئەو تێکەڵاویەی لە نێوان خەڵکەکەدا هەبوو هیچ شتێك بە شاراوەیی نەدەمایەوە. هەروەها ئەم کۆنترۆڵ و چاودێریە بەردەوامەی بەعسیەکان لەسەر دانیشتووانی ئۆردووگاکان، ژیانی ئەوانی بەرەو بێزاری و دڵەڕاوکێیەکی بەردەوام برد بوو، چونکە جگە لەوەی کە زۆر توند بوو، ئەم خەڵکە کە زۆربەیان لە لادێی دوورەدەستەوە راگوێزرابوون، بە هیچ شێوەیەك لەسەر ئەم چاودێریکردنە رانەهاتبوون و لە لادێ خۆدزینەوە لە چاودێری و کۆنترۆڵی دەسەڵات ئاسانترە.

لەگەڵ راگواستندا لادێنشینان کەوتنە فەزایەکی کۆمەڵایەتی دیکەوە. لە فەزای گوندەوە کە دانیشتووانی زۆربەی گوندە کوردیەکان لە دەیان کەسەوە بۆ سەدان کەس تێنەدەپەڕی، ئەوانیش هەموویان خزم و ناسیاوی یەکتر بوون، هەمان شێوەزار و هەمان وردە کولتوور، زۆربەی کات یەك ئاغا و یەك مەلا، یەك شێوازی ژیان کە لە باوك و باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە، جیاوازی ئەوان لەگەڵ ئەوانەی پێشە خۆیان

هێندە کەمە بە زەحمەت دەکرێ دەستنیشان بکەین. بە گواستنەوەیان بۆ ئۆردووگا کە نەك تەنیا دانیشتووانی چەند گوندێك، هەندێ جار دانیشتووانی چەند خێڵ و ناوچەیەکی جیاوازی لێیە، فەزایەکی کۆمەڵایەتی دیکەی جیاواز لەوەی پێشوو دروست بوو. قەزای سۆران کە بەرهەمی پێش هەر شتێك زێتر راگواستنە یاخود قەزای بنەسڵاوە و ناحیەی دارەتوو ئەمڕۆ زێتر لە مۆزایکێکی وردە کولتوورەکان[*] دەچن، جۆرێك لە مۆلتی وردە کولتوور لەو ئۆردووگا ـ شاروچکانەدا زاڵە. خەڵکی چەندین ناوچەی جیاجیا تیایاندا کۆکراونەتەوە، کە بەبێ بوونی ئەم ئۆردووگایانە و سیاسەتی راگواستن نەدەکرا ئەم هەموو وردە کولتوورانە پێکەوە کۆببنەوە. لە ئەنجامیشدا ئەو کارلێکە کۆمەڵایەتیەی نێوانیان دروست ببێت. ئەگەرچی لە ئۆردووگادا خزم و کەسوکارەکان یاخود دانیشتووانی هەر گوندێك هەوڵیان دەدا پێکەوە لە گەڕەکێك یان لە نزیك یەکەوە نیشتەجێ بن. هەرچەندە لە هەندێك حاڵەتدا ئەم هەوڵانە سەرکەوتوو بوون (بەتایبەتی لەو ئۆردووگایانەی لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو دروستکران)، بەڵام هەندێ کات دانیشتووانی گوندێك بەسەر دوو ئۆردووگا دابەش دەکران و هەندێ جاریش خەڵکی دوو سێ عەشرەت لە گەڕەکێکدا کۆدەبوونەوە، ئەم پێکەوە ژیانەیان بەتێپەڕینی کات وای کرد تێکەڵاویەکی زۆر لە نێوانیاندا دروست ببێت و دوستایەتی و خزمایەتی لێ بکەوێتەوە، ئەم نزیکبوونەوەیەی لادێنشینەکانی ناوچە جیاوازەکان نەك تەنیا بووە

---

* وردە کولتوور بریتیە لە:((کولتوورێکی بچووکتر لە ناو کولتوورێکی گەورەتردا، کە سەرەڕای تایبەتمەندیەکانی وەك بەشێك لە سیستمێکی کولتووری بەرفرەوان دەژمێردرێت.)) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم چەمکە بگەڕێوە بۆ: منوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، و. رێبوار سیوەیلی و ئەوانی دیکە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ۲۰۰۲، ل ۱۱۲ـ ۱۱٦.

هـۆی ئـەوەی وێنـە و تەسـەوری ئـەوان لـە سـەر خـەڵکی ناوچـە و دێهاتەکانی دیکـە گۆڕانـی تێبکـەوێت، بـەڵکو سـیحری ئینتیمـای گوندایەتی و خێڵایەتیشی بـەرەو جۆرێـك لـە لاوازبـوون بـرد. پێـش ڕاگواستن، تێکەڵاویەکی کەمتر لەنێوان لادێنشینەکاندا هەبوو، تـرس لە ئەوانی دیکە ـ خەڵکی دەرەوەی بازنەی خێڵەکەی، چونکە ئەوانی تر بە پلەی یەکەم تاکەکانی خێڵەکانی دیکە بوون ـ یـاخود جۆرێـك لـە نادڵنیابوون و خۆپـارێزی لـە تێکـەڵاوی و هەڵسـوکەوت لەگـەڵیاندا بوونی هەبوو. ڕاگواستن لە زۆر حاڵەتدا ئەم ترسەی بـۆ کـەمترین ڕادە کـەمکردەوە. لـێرەدا نـاکرێت وا تێبگـەین کـە کێشـە خێڵایـەتی و ناوچەییەکان کۆتاییان پێهات یان ئینتیمای خێڵایەتی نەما، بـەڵکو شان بەشانی ئـەو تێکەڵاوبوونـەش کێشـە و گرفتـی وا لـەنێوانیاندا سەریان هەڵدا کە هەندێك لەو کێشە خێڵایەتیانە کاتێکیان دەوێت تا لەبیر دەکرێن.

بەگشتی، ژیانی ئۆردووگا زۆرەملێکان زۆر زێتر لە ژیانی گوندەکان کێشە و گرفتی هەبوو. هەموو ئەم کێشە و گرفتانەش وەکـو زۆربـەی کێشەکانی لادێ سـادە و سـاکار نـەبوون. کێشـەکانی لادێ زۆربـەیان بـەهۆی زەوی و زار و ئـاو و ئـاودێری و ژن و ژنخوازیـەوە بـوون و زۆربەشیان لەنێوان خزمەکان خۆیاندا دروست دەبوون، چارەکردنیشیان هێندە ئاڵۆز نەبوو، بەڵام کێشەکان لە ئۆردووگادا تەنیا ئەوانە نەبوون و هەندێکیشـیان هێنـدە سـادە نـەبوون، وێـڕای ئـەوەی کـە چارەسەرەکەشیان بەڕیش سپیەك یاخود ئاغایـەك هەمیشـە نـەدەکرا. ئەم کێشـانەش هـەر لەسـەرەتاوە دەرنەکـەوتن، بـەڵام بـە زۆربوونـی دانیشتووان و بەردەوام هـاتنی خـەڵکی نـوێ و زۆربوونـی بێکـاری و کەمبوونی خانووەکان زیادیان کرد. کاتێك لە سـەرەتادا ئۆردووگاکـان دروسـتکران، نـەك تـەنیا دوو بـرا و خێزانـەکانیان کـە پێکـەوە لـە

خانووێکدا دەژیان لە گوند، یەکو خانوویان بەرکەوت، بەڵکو هەر پیرەمێرد و پیرەژنێکیش کە لەگەڵ منداڵەکانی دەژیا خانووێکی بەرکەوت یان کەلوپەلی خانووکردن و پارچە زەویەکی پێ بەخشرا. بەوەی کە هەر سەرۆك خێزانێك بۆ بە خاوەنی خانوویەکی سەربەخۆ بەپێچەوانەی لادێ، کاریگەریەکی وەهای نەبوو لە سەر بونیادی خێزانی کوردی بەتایبەتی لە ساڵەکانی سەرەتادا. هەروەکو زۆربەی بەها، دابونەریت و نۆرمە کۆمەڵایەتیەکانیش دوای ماوەیەکی درێژتر و بە هەوڵ و کاریگەری هۆکارگەلێکی دیکە گۆڕانیان تێکەوت. هەندێ جار سێ چوار برا پێکەوە کە هەر یەکێك بە ماڵ و منداڵەکانییەوە خانوویەکی سەربەخۆی هەبوو، پێکەوە دەژیان و تەنیا بۆ خەوتن دەچوونەوە خانووەکانیان و لەیەکتر جیا دەبوونەوە، لە کاتەکانی خواردن و دانیشتن پێکەوە کۆدەبوونەوە، یەك کابان و یەك گەورەی ماڵیان هەبوو کە هەموو پارە و پولی ماڵەکەی لەژێر دەست بوو، بڕیارە گرنگەکانیش لە ئەوەوە دەردەچوون. ئێستاش حاڵەتی لەم جۆرە لە ئۆردووگاکاندا زێتر لە شار و لە لادێ دەبینرێن. لێرەشدا دەشێ بڵێین فۆرمی خێزانی کوردی بە گۆڕانی شوێنی جوگرافی، خانوو، باشتر بوونی رەوشی ئابووری و زێتر تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی دیکە گۆڕانێکی وای بەسەردا نەهات کە شیاوی باس بێت، ئەگەر ئەمڕۆ گۆڕانێك دروست بووە لەدوای ئەم ماوە تارادەیەك درێژە وێڕای راگواستن ئەوا بەهەولی هۆکارگەلێکی دیکەش بووە.

ئەگەرچی راگوێزراوەکان وەکو جەستە هەندێکیان بۆ ماوەی ١٥ ساڵ، هەندێکی دیکە ١٢ ساڵ و... بە تەواوی لە زێدی خۆیان دابڕان، بەڵام ئەم دابڕانە کارێکی نەکرد کە ئەوان زێدەکەی خۆیان لەبیر بکەن یاخود بۆ ماوەیەکی کەمیش بیری لێ نەکەنەوە. لە زۆربەی دانیشتن و

کۆبوونەوە خێزانی یاخود کات بەسەربردنییەکاندا هێندەی باسی گوندی کۆن و رووداو و ئەو بەسەرهاتانەی لەوێ روویانداوە دەکرا، هێندە ژیانی دوای راگواستنیان کە ئەزموونیان دەکرد باسی لێوە نەدەکرا. ئەوان بەتەواوی لە سەر رابردوو دەژیان و چاوەڕێی زووترین دەرفەتیان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ زێدەکەیان بەبێ ئەوەی لەبیریان بێت یان هەست بکەن کە لەگەڵ ئەم ژیانە ئاسانەی ئێستا راهاتوون و چیتر ناتوانن وەکو جاران ئەو ژیانە سەختە تاقی بکەنەوە و پشت لە بەرژەوەندی و ئیش و کارەکانی ئێستایان بکەن. ئەگەرچی ئەوان هێندە تامەزروی رزگاربوون بوون لە ئۆردووگاکان کە گوێچکەی منداڵەکانیانیان پڕ کردبوو لە وەسفی گوندی کۆن، ئەو منداڵانەی کە بە هیچ شێوەیەك ئەوێیان نەبینیبوو ناوی زۆر شوێنیان لە گوندی باوك و دایکیان دەزانی، چونکە هێندە لای ئەوان باسکرا بوون، بەڵام دوای ئەوەی دەرفەتی گەڕانەوە رەخسا کارەکە تاڕادەیەك پێچەوانە کەوتەوە، وەك چاوەڕێ دەکرا راگوێزراوەکان نەگەڕانەوە زێدەکەیان، سەرەڕای بەشێك لە ئاسانکاریەکانیش تا ئێستا ژمارەیەکی بەرچاوی گوندەکان ئاوەدان نەکراونەتەوە، ئاوەدان کراوەکانیش هێندە قەرەباڵغ نین و خەڵکێکی زۆر لە ئۆردووگا و شارەکان مانەوە و ئامادە نین ژیانی خۆیان لە شوێنی ئێستایان بە ژیان لە گوندە ئاوەدانکراوەکاندا بگۆڕنەوە.

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین ئافرەت زێتر لەپیاو بە راگواستن حەسایەوە، وەك باسمان کرد ئافرەت لە گوندی کوردیدا ئەرکگەلێکی زۆری لە سەر شان بوو. دووچاری شەکەتیەکی زۆر دەهات و رەنجێکی فرەی دەکێشا. بە راگواستنیان بۆ ئۆردووگا چوونە بیر لە دەرەوەی ئاوایی و یارمەتیدانی پیاوەکەی لە کاری وەرزێری... لە کۆڵ بوونەوە و تەنیا کارەکانی ماڵەوەی بۆ مانەوە، ئەوانیش کەم بوونەوە بەهۆی

نەمان یان کەمبوونەوەی ئاژەڵەکان بە ڕێژەیەکی زۆر، نەچوونە سەر کانی و مەشکە و...هتد سەرەڕای ئەوەی کە وەکو پیاو نەدەکەوتە ژێر چاودێری و بۆ سەربازی بانگ نەدەکرا. بەباشتر بوونی ڕەوشی ئابووری و تەندروستی ئافرەت سوودمەند بوو لە خزمەتگوزاری جیاجیا. تاکە ئەرکێك کە پێمان وایە قورستر بوو پەروەردەکردنی منداڵان بوو، وێڕای ئاسانکاریەکان لە بواری پەروەردەی منداڵ و بەخێوکردنی لە ئۆردووگادا، ئافرەتان ڕەنجێکی زۆریان بە بەخێوکردنی منداڵانەوە دەکێشا، چونکە لەبەر زێدە لە هۆکارێك لەم ماوەیەدا ڕێژەی لە دایکبوونی منداڵان لە وڵاتی عێراقدا بە گشتی زیادی کرد، مردنی منداڵانیش بەرەو کەمترین ڕێژەی ڕۆیشت بەبەراورد لەگەڵ پێشتر.

هەروەها پێم وایە هاوکات لەگەڵ ڕاگواستن، بە دوورکەوتنەوەی ئافرەت لە ژینگەی گوند لە ئازادیەکەشی کەم بووەوە، هەڵبەت ئازادی کۆمەڵایەتی. بەهۆی نەمانی چوونە سەر کانی و ئیشەکانی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ، بەرە بەرە لە پانتایی ئازادیەکەی کەمبووەوە. ئەم دەرنەچوونە لە ماڵ ئەگەر بۆ ئافرەتی شارنشین زۆر ئاسایی بێت، ئەوا بۆ ئافرەتێك کە جگە لە کاتی نووستن زۆربەی کاتەکانی خۆی لە دەرەوەی ماڵەوە بەسەر بردبێت ئاسایی نەبوو. دواتریش ئافرەت لە ئۆردووگا بەپێچەوانەی کچ و ژنەکان لە شاردا بە تایبەتی نەوەی نوێ کە ژمارەیەکی بەرچاویان لە دەرەوەی ماڵ کاردەکەن وەك فەرمانبەر، مامۆستا... کچانی ئۆردووگا کەمتر ئەو دەرفەتەیان بۆ ڕەخسا و زۆربەیان بوون بە ئافرەتی ماڵەوە.

خاڵێکی دیکە کە پێویست دەکات ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە کە ئۆردووگا بە لەخۆ گرتنی خەڵکێکی زۆر لە عەشرەت و دەڤەرە جیاوازەکان، وەك کۆرەیەکی لێهات و زۆر لە دابونەریتە کۆن و تایبەت بە یەکێك لە ناوچەکانی تواندنەوە، هەروەها گۆڕانگەلێکی زۆر بەسەر

رەفتار، هەڵسوکەوتەکان و شێوازی ژیانی رۆژانەدا هاتن. ئەم کارلێکەی نێوان وردە کولتوورەکان بۆوە هۆی لەیەکتر نزیکبوونەوەی تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان، ئەم کارلێکە تایبەت نەبوو بە عەشرەت و خێڵە نیشتەجێکانەوە، بەڵکو لەنێوان ئەوان و خێڵە نیمچە کۆچەرەکانیشدا دروست بوو، دوای ئەوەی کاولکردنی گوندەکان و فرەوانبوونی ناوچە قەدەغەکراوەکان هاتووچووی ئەوانی زۆر سنووردار کرد، عەشرەتەکانی وەك هەرکی و مەنتك ... بەزۆری لە ئۆردووگاکاندا نیشتجێ بوون، ئەمەش ئاکامێکی کۆمەڵایەتی دیکەی سیاسەتی راگواستن بوو.

لە کۆتایشدا دەکرێ ئەوە دووبارە بکەینەوە کە ئەم فۆرمەی نیشتەجێبوون (ئۆردووگای زۆرەملێ) وێڕای ئەوەی فۆرمێکی نامۆ بوو بە مێژووی نیشتەجێبوونی کوردەکان، بۆ بە واقعێك و شوێنی خۆی کردەوە.

## باسی دووەم: کاریگەری راگواستن لەسەر شاری کوردی*

لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان لەبارەی شارەکانی کوردستانی خواروو هەرچەند وەك زۆربەی تۆژینەوە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە زۆر کەمن، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ شێوەکانی دیکەی نیشتەجێبوون (ئۆردووگا، لادێی نوێ) هەندێك باشترن، وێڕای ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبەر دەستن کەموکووڕیان ئێجگار زۆرە.

---

* بێگومان لێکۆڵینەوە لە رۆڵی هۆکارێکی وەك راگواستن لە گۆڕینی سیما و پێکهاتەی شارەکان لەو ماوەیەدا کارێکی ئاسان نییە، لە توانای ئەم باسەشدا نییە زۆرترین ئاکامە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو سیاسەتە بخاتەڕوو. هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم باسە خۆی تەرخان کردووە بۆ کاریگەری هۆکارێك لەو هۆکارانەی کە بوون بە هۆی گەشەسەندن و فرەوانبوونی شارەکان، پێویستە خوێنەران ئەوە لەبەر چاو بگرن و کاتێك بە دوور و درێژی باسی خەسڵەتە گشتیەکانی شارە کوردیەکان لەو ماوەیەدا نەکراوە بە کەموکووڕی لە قەڵەم نەدەن.

*ئەنتۆنی گیدێنز* دەڵێت: لە سەدەی بیستدا ((بەشارییوون)) پرۆسەیەکی جیهانی بوو، جیهانی سێیەمی بە شێوەیەکی بەرفرەوان گرتەوە. ناوبراو درێژەی پێدەدات و دەڵێ: قۆناغی سەرەکی پەرەسەندنی شارەکانی جیهانی سێیەم لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست دەست پێ دەکات.[7] ئەگەر بە پشت بەستن بە گوتەکەی *گیدێنز* بپەرژێینە سەر گەشەسەندنی شارەکانی کوردستانی خواروو لە سەدەی بیستدا، ئەوا دەبێت ئەو گەشەسەندنەیان بۆ سێ قۆناغ دابەش بکەین، بەم شێوەیە: لەسەرەتای سەدەی بیستەوە تا ساڵی ١٩٧٠، لە ساڵی ١٩٧٠وە تا ساڵی ١٩٩١، لە دوای ساڵی ١٩٩١، هەر یەکێك لەم قۆناغانە خاوەن نیشانەگەلێکی تایبەت بە خۆیە کە جیاوازن لە تایبەتمەندیەکانی قۆناغەکانی دیکە.

لەم باسەدا هەوڵدەدەین تیشك بخەینە سەر هەندێك لەو گۆڕانکاریانەی بەسەر ژیانی شارنشینی و شارەکاندا هاتوون لە دوو دەیەی حەفتا و هەشتادا. لە سەرەتادا ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە ئەوەی بە شار ناودەبرێت، لە ئاستی جیهاندا یەك تێگەیشتنی نییە. تەنانەت لەسەر ئاستی ولاتێکیشدا شارەکان وەك یەك پەرەناسێنن و چۆنایەتی ئەوان خەسڵەتگەلێکی جیاوازی هەیە. بۆ دەستنیشانکردنی شاریش سوود لە کۆمەڵە پێوەر و پێودانگێکی جیاواز وەردەگیرێت.[8]

لە هەموو جیهاندا زێتر پشت بە پێوەری ئاماری دەبەسترێت بۆ

---

7 انتونی گیدنز، جامعەشناسی، ت: منوچهر صبوری، نشرنی، تهران ١٣٧٠ (١٩٩١)، ص ٥٩٥.

8 منوچهر محسنی، جامعەشناسی پزیشکی، چاپ ششم، انتشارات طهوری، تهران ١٣٧٩ (٢٠٠٠)، ص ٩٧.

جیاکردنەوەی شار لە لادێ.[9] ئەو ژمارەیەی دیاردەکرێت لە ولا تێکەوە بۆ ولاتێکی دیکە جیاوەزە، بەڵام وەك ((برۆدڵ)) دەڵێت مەسەلەکە تەنیا بە ژمارە سنووردار ناکرێت، شار تەنیا بەبەراورد لەگەڵ شێوەی خوارتر لە خۆی (خێڵ، گوند) بەرگی شارانە دەپۆشێت و دەبێتە شار.[10]

زۆر لە کۆمەڵناسان بە پێوەری ئاماری رازی نین، ئەوان لەو بڕوایەدان دەوروبەری شار (ضواحي المدينة) زێتر لە شارنشینی نزیکە ئەگەر ژمارەی دانیشتووانیشی بەو رادە پێویستە نەگەیشتبێت کە بۆ ستاتۆسی شار دیاریکراوە، لە کۆبوونەوەیەکی دانیشتووانی کشتوکاڵی کە ژمارەیان بە رادەی ئاماری خوازراو گەیشتبێت.[11]

کۆمەڵناسان زێتر پشت دەبەستن بە ژمارە و چڕی دانیشتووان، بوونی پیشە ناکشتوکاڵیەکان، پێکهاتەی کولتووری و رەفتاری بەکۆمەڵ، جۆری پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، شێوەی ژیان بەڵام لەبەر ئەوەی لە ولاتی عێراقدا پێوەرەکە زێتر کارگێریە، هەموو ناوەندی ناحیە، قەزا و پارێزگایەك بە شار لەقەڵەم دەدرێت، ئێمەش ناچار لەم باسەدا بەم پێوەرە مامەڵە لەگەڵ ئەو ناوەندانە دەکەین.*

---

9 منوچهر محسني، جامعه‌شناسی عمومی، چاپ هفدهم، انتشارات طهوری، تهران ۱۳۷۹ (۲۰۰۰)، ص ۱۹۶.

10 فرنان برودل، سرمایداری و حیات مادی، ت: بهزاد باشی، نشر نی، تهران، ۱۳۷۲ (۱۹۹۳)، ص ٤۹٥.

11 مجموعة من المؤلفين، دراسات في المجتمع العربي المعاصر، تحرير خضر زكريا، ط ۱، الاهالي للطباعة والنشر و التوزيع، دمشق، ۱۹۹۹، ص ۸٤ ـ ۸٥

* هەروەکو خوێنەر لە لاپەڕەکانی دواتردا دەبینێت، ئێمە دەپەرژێینە سەر ئەو شار و شارۆچکانەی کە لادێنشینەکان روویان تێکردووە، واتە ئەو شار و شارۆچکانەی لە دوای راپەڕین ئازاد کران، چونکە شار و شارۆچکەکانی دیکە لە ژێر دەستی بەعسدا مانەوە و ئازاد نەکران، لەبەر ئەوەی لادێنشینە کوردەکان روویان تێنەکرد یان زۆر کەمتر روویان

یەکەمین دیاردە کە تۆژەر لە شاری کوردیدا لە دوو دەیەی حەفتا و هەشتاکاندا تێبینی دەکات، گەورەبوون و فرەوانبوونـــی شـارەکانە لـە هــەردوو رووی، بــەرفرەبوونی شارنشــینی (The Urban Expannsion) و پلــەی بەشــاریبوون (Degree of Urbanization)، بـــەلام بــە گشـــتی بەرفرەبوونە شارنشینییەکە ئاســۆیی بـوو نـەك سـتوونی، ئەمــە لــە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە وەرگرتنـــی خەســڵەتی بەشـاریبوونە لــە هەندێك ئاوەدانی دیکە کە تا ئەو کات بە شار لە قەڵــەم دەدران. لــە نێوان ســاڵەکانی ۱۹۷۷ ـ ۱۹۸۸ دەوڵــەتی عــێراق ٤٠ ناحیــەی لــە کوردســتانی باشــور بــە تــەواوی ســڕیەوە و زۆربەشــیانی چۆڵکــرد.[12] لەکاتێکدا زۆربەی ئەو شارانەی کە مانەوە گەشەیەکی بـەرچاویان بــە خۆوە بینی، گەورە بوونی شارەکانیش لە شارێکەوە بۆ شــارێکی دیکــە جیاواز بوو، لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز.

پێش ئەوەی بــاس لــە گــەورەبوونی قــەبارەی شــارەکان و پــەلوپۆ هاوێشــتنیان بکــەین کــە دەکــرێ دەســتەواژەی گیدێــــنز بـــۆ ئـــەو گەشەسەندنە بەکار بهێنین کە دەڵێت: دەوروبەری شارەکان لە جیــهانی

---

تێ کردووە، هەروەها کوردنشینەکانی ئــەو شــارانەش زۆرتریــن ژمارەیــان راگوێــزران و عەرەبیان لە شوێنی ئەوان نیشتەجێ کردن، رەوشێکی کۆمەڵایەتی جیاوازیــان هەیــە و پێمان وایە ئەم شار و شارۆچکانە پێویستیان بە تۆژینەوەیەکی ســەربەخۆ هەیــە. هــەر باسکردنێکیان لێرەدا بەتایبــەتیش بەوەی کە رەوشی ئەم شارانە لەرووی کۆمەڵایەتیــەوە جێگیر نییە و تۆژەر دەســتی پێیــان ناگــات و زانیــاری و داتــا لــە بارەیانــەوە کــەمن، باسکردنێکی پڕ لە کەموکووڕی دەبێت. لە بەشــی سێیەمیشــدا هیــچ ئاماژەیــەك کــە شیاوی باس بێت بەو شار و شارۆچکانە نەکرا، چونکە وێڕای کەمی زانیاری و داتاکـــان لەبارەیانەوە، لە بەراوردەکەدا سوودێکی وەهای بە باســەکە نەدەگــەیاند، نــەك لەبــەر هۆیەکی دیکە.

12 د. عەبدوللا غەفوور، فەرهەنگی جوگرافیایی کوردستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ۲۰۰۲، ل ۱۳۱.

سیّ (( قارچلك ئاسا گەشەیان دەسەند))،[13] ئەوە لە یـاد نەکـەین کـە ئەو گەشەسەندنەی ئـەمڕۆ بـە شـارەکانی کوردسـتانەوە دیـارە هـەم لەڕووی قەبارە و هەم لەڕووی جوانکاریەوە بەرهەمی تەنیا دوو دەیـەی حـەفتا و هەشـتاکان نییـە، بـەڵکو دوای راپـەڕینی سـاڵی ١٩٩١ قۆناغێکی گرنگە لە گەشەسەندنی شارەکانی کوردستانی خوارووداٴ.[14]

شارەکانی کوردستان بە تایبەتی لە هەشـتاکانی سـەدەی رابـردوو گەشەیەکی بەرچاویان سەند، بەڕێوبەری شارەوانی هـەولێر لـە سـاڵی ١٩٨٥ لە پاساو هێنانەوەی بۆ ئەوەی کە نـەیانتوانیوە خزمـەتگوزاری پێویست بگەیننە گەڕەکە نویّ دروستکراوەکان گوتی: ((دەبوایە شاری هەولێر لە ساڵی دوو هـەزاردا بـەم گەورەبوونـەی ئێسـتای (١٩٨٥) گەیشتبا)).[15] سەبارەت بە گەورەبوونی شاری دهۆکیش دەتوانین ئاماژە بە زیادبوونی خانووەکانی ئەو شارە بکـەین، لـە سـاڵی ١٩٧٧ تـەنیا ٣٦٦٨ خانوو لە شاری دهۆك هـەبوو، کـەچی سـاڵی ١٩٨٣ ژمـارەی خانووەکان بە ٩١٤١ خانوو گەیشت، واتە لەو حەوت سـاڵەدا ژمـارەی خانووکانی نزیکەی جار و نیوێك یاخود بە رێژەی ١٤٩٪ زیادیان کرد،

---

13 گیدنز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١٣.

14 لەم بارەیەوە دەتوانین ئاماژە بە تێبینیی نووسـەرێکی میسـری بکـەین کـە سـاڵی ١٩٨٨ دوای نۆ ساڵ ژیان لە شاری هەولێر گەڕایەوە میسر و جارێکی دیکە لـە ١٩٩٩ سەردانی شاری هەولێری کرد، ئەو دەڵێت: (( لە کۆتایی هەشتاکان خانووکانی شـاری هەولێر لە هۆتێلی دیاریەوە تا نەخۆشخانەی لەدایکبوون بۆ خانووی ئـەمین عامـەکان لە سەر جادەی شەست مەتری لە جوانترین خانووکانی ئەو شارە بوون)). بگـەڕێوە بـۆ: رجائی فاید، اربیل ٨٨ هـەولێر ٩٩، مؤسسـة موکریـانی للطباعـة و النشـر، هـەولێر، ٢٠٠٠، ص ٥٤، هەروەها لە لاپەڕە ٥٢ باسی فراوانبوونـی دوو گـەڕەکی پیشەسـازی و راپەڕین (٧ نیسانی جاران) لە شاری هەولێر دەکات.

15 گیدنز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٠.

رووبەری شارەکەش سێ جار هێندەی خۆی گەورە بوو.[16]

لەو دوو دەیەدا، شارەکانی کوردستانی خواروو وەك زۆر لە شارەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لە سەدەی نوزدە، گەشەسەندنی دانیشتووانە شارنشینەکان هاوکات بوو لەگەڵ کەمبوونی رێژەی دانیشتووانە لادێنشینەکان هەروەها لەم ماوەیەدا بەوەی کە شارەکان پەلوپویان دەهاوێشت و رووبەرەکەیان فرەوان دەبوو ((بە خێرایی ناوچە لادێنشینەکانیان دەگۆڕی بۆ ناوچەی دەورووبەری شار)) وەك *شپنگلەر* لە وەسفی شارەکانی ئەوروپا بۆی چووە.[17]

ئەم بارە واتە گەورەبوون و فرەوانبوونی رووبەری زەوی شار و شارۆچکەکان خەسڵەتێکی هەموو ئەو شارە کوردیانە بوو لە کوردستانی خواروو کە بواری فرەوانبوونیان هەبوو لەڕووی سیاسی و ژینگەی سروشتیەوە. هەرچەند زێدەبوونی سروشتی شارنشینان، بەرزبوونەوەی داهاتی تاکەکەس لە کۆتایی حەفتاکان، مۆدێرنە... رۆڵیان هەبوو لە پەرەسەندن و فرەوانبوونی شارەکان، بەڵام گەورەترین هۆکار کۆچکردنی لادێنشینان بوو بۆ شارەکان. لەو دوو دەیەدا لادێنشینان بە لێشاو بەرەو شارەکان کۆچیان دەکرد. لە ئەنجامی ئەوەشدا تەنیا گەڕەکی نوێ دروست نەبوون و شار سنوورەکانی خۆی فرەوان نەکرد، بەڵکو چڕی دانیشتووانیش لە شارەکاندا رووی لە زیادی کرد.

ئەگەر لە رۆژئاوا شۆڕشی پیشەسازی هۆی سەرەکیی پەرەسەندنی شارەکان بوو بێت، ئەوا لە کوردستانی خواروو راگواستن بە پلەی

---

16 هاشم خضر الجنابی، مدينة دهوك، دراسة في جغرافية المدن، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥، ص ٤٢ ـ ٤٣.

17 ماکس وبر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣.

یەکەم بەرپرسە لەو دیاردەیە. پەرەسەندنی شارەکانی کوردستانی خواروو لە حەفتا و هەشتاکانی سەدەی رابردوو لە شێوەی پەرەسەندنی شارەکانی رۆژئاوا، لە سەردەمی بە پیشەسازیبوونیاندا بوو.[18]

ژمارەی کۆچکردووەکان بۆ شاری هەولێر لە ماوەی نێوان ١٩٧٧ ـ ١٩٨٤ گەیشتە ١٢٨,٨٤٣ کەس.[19] لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتووانی شاری هەولێر سالّی ١٩٧٧ تەنیا ١٩٣,٥٥٨ کەس بوو.[20] رووپێوی ئاوەدانی شارەکەش لە ١٥٤٧ هێکتارەوە بووە ٢٢٧٢ هێکتار لە ماوەی نێوان سالآنی ١٩٧٥ـ١٩٨٠.[21] هەروەها ژمارەی دانیشتووانی شاری دهۆك لە ١٩٧٧ ـ ١٩٨٣ بە رێژەی ٢٢٠٪ زیادی کرد. لە ماوەی ئەو حەوت سالّەدا ٣٥,٩٥٣ کەس لە ناوچەکانی دیکەوە بۆ شاری دهۆك کۆچیان کردووە.[22] ژمارەی دانیشتووانی شاری دهۆك کە سالّی ١٩٧٧ تەنیا ٤٠,١٩١ کەس بوون،[23] لە ماوەی تەنیا حەوت سالّدا واتە لە ١٩٨٣ بە ٨١,٣٤٧ کەس گەیشت.[24]

لە تۆژینەوەیەکدا هاتووە کە سالّی ١٩٧٠ شاری دهۆك تەنیا ٣٤٪ کۆی دانیشتووانی ناوەندەکانی شارنشینی لە پارێزگاکەدا لەخۆ

---

18 لە بارەی پەرەسەندنی شارەکانی رۆژئاوا بگەرێوە بۆ پێشەکیە راڤەییەکەی *مارتیندال* لەم سەرچاوەیەدا: ماکس وبر، هەمان سەرچاوە، ل ٢٧.

19 هاشم خضر الجنابی، مدینة اربیل، دراسة فی جغرافیة الحضر، مدیریة دار الکتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٧، ص ١٦٩.

20 الجمهوریة العراقیة، وزارة التخطیط، الجهاز المرکزی للاحصاء، نتائج التعداد العام للسکان لسنة١٩٧٧.

21 د. خلیل اسماعیل محمد، اربیل دراسات جغرافیة ـ اقتصادیة، وزارة الثقافة، اربیل، ٢٠٠٣، ص ٩٩.

22 هاشم خضر الجنابی، مدینة دهوك، دراسة في جغرافیة المدن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨.

23 الجمهوریة العراقیة، وزارة التخطیط، الجهاز المرکزی للاحصاء، سەرچاوەی پێشوو.

24 هاشم خضر الجنابی، مدینة دهوك دراسة في جغرافیة المدن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥.

گرتبوو، ئەو ڕێژەیە ساڵی ١٩٨٧ بوو بە ٥٦٪ .[٢٥] هەر لەم بارەیەوە تاهیر زێباری لە توێژینەوەیەکدا لە بارەی شاری دهۆك دەڵێت: ژمارەی ئەوانەی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٨٧ کۆچیان کردووە بۆ شاری دهۆك ٣٩,٨٤٩ کەس بوون، لە شوێنێکی دیکەی هەمان باسەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ڕێژەی شارنشینی لە ساڵی ١٩٧٧ کە تەنیا ٣٧,٤٪ بوو، ساڵی ١٩٨٧ بۆ ٥٢,٣٪ زیادی کرد.[٢٦] بەڵام ناوبراو باس لەوە ناکات چەند لەم شارنشینانە شارستانن. ئەوانەی لەو ماوەیەدا بۆ شارەکە کۆچیان کردووە، هەموویان شارنشینن بەڵام ناکرێ هەموویان بە شارستان لەقەڵەم بدرێن. یەکەم لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان لە ژینگەیەکی لادێییەوە کۆچیان کردووە بۆ ناو شار. دووەم، ژمارەیەکی زۆریان ڕەنگە تەنیا ئەوە دوو سێ ساڵ بێت بۆ شارەکە کۆچیان کردبێت. پرۆسەی شارستان بوونی تاکەکەس کورتخایەن نییە، هەر بۆیە پێویستە بۆچوونی کۆمەڵناسی لەم بوارەدا جیاواز بێت لە بوارە زانستییەکانی تر. تەنیا بوونی جەستەیی لە شاردا بە پێوست مانای بەشداریکردنی تاکەکەس لە ژیانی شارنشینیدا نابەخشێت. ڕەنگە کۆچکردوو لە شاردا بژیت، بەڵام ئینتیمای بۆ شارەکە نەبێت، لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ ژینگەی شارەکەدا نەگونجێت، هەروەها پەیوەندیەکانی لە رادە بەدەر سنوودار بن، بەتایبەتی لە یەکەم قۆناغەکانی نیشتەجێبوونی لە شارەکەدا.[٢٧] جیاوازیەکی زۆر لە نێوان

---

25 د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد، دابەشبوونی جوگرافی دانیشتووانی شاری دهۆك، سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢، ئەیلوولی ١٩٩٧، ل ٥١.

26 تاهیر حەسو زێباری، ئاقارەکانی شارنشینی لە شاری دهۆك، سەنتەری برایەتی، ژمارە ١٦، هاوینی ٢٠٠٢، ل٣٠٣.

27 جیرالد بریز، مجتمع المدينة في البلاد النامية، ت: د. محمد الجوهري، دار المعرفة الجامعية، القاهرة ١٩٨٩، ص ١٧٠.

خەسڵەتەکانی کۆچکردووە نوێکان بۆ ئەو شارانەی بە خێرایی پەرەدەسێنن و خەڵکی کۆنی شارەکە هەیە، ئەویش لەڕووی پێگە، ئاستەکانی داهات، ئاستی رۆشنبیری، رەفتاری شاریانە ...[28] هەر سەبارەت بەمە کۆمەڵناسی ئەمریکی ((وێرس)) پێی وابوو کە رێژەی گشتی ئەو دانیشتووانانەی لە شارەکاندا دەژین، بە شێوەیەکی ورد و تەواو رێژەی ((بەشاریبوونی)) جیهانی هاوچەرخ دەرناخات.[29] لە خشتەی خوارەوەدا رێژەی سەرسوڕهێنەری زیادبوونی دانیشتووانی هەندێك لە شارەکانی کوردستانی خواروو لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧ ـ ١٩٨٧ دەخەینەڕوو.

بەڵام گەورەترین شەپۆلی کۆچی لادێنشینان بۆ هەندێك لە شارەکان ساڵی ١٩٨٨ دەستی پێ کرد، کاتێك زێتر لە ١٦٠٠ گوندی کوردستانی خواروو لە میانی پەلاماری ئەنفالدا خاپوور کران،* وێڕای ئەوەی چەندین شار و شارۆچکە لەو ساڵەدا لە ستاتۆسی ناحیەوە بۆ گوند بچووککرانەوە یاخود بە تەواوی چۆڵ کران.

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە دیاردەی بەرفرەوانبوونی شارەکانی کوردستان و زیادبوونی چڕیان تایبەت نەبوو بە هەموو شار و شارۆچکەیەك، وێڕای چۆڵکردنی ژمارەیەکی زۆری ناحیەکان کە چیتر وەك شارۆچکە بوونیان نەما، ئێمە چەند شارۆچکەیەکی دیکەشمان هەیە کە ژمارەی دانیشتووانیان یان بە رێژەیەکی زۆر کەم زیادیان کردووە کە شیاوی باس نییە یان لە کەمیان داوە. لە (خشتەی ژمارە٨) ئاماژە بە هەندێك لەو شارانە دەکەین.

---

28 هەمان سەرچاوە، ل ١٤٧.

29 گیدنز، هەمان سەرچاوە، ل ٦٠٠.

* بەداخەوە هیچ ئامارێکی ئەو ساڵەمان دەست نەکەوت.

## خشتەی ژمارە (٨)

## زیادبوونی ناسروشتیی دانیشتووانی هەندێك لە شارەكانی كوردستانی خواروو لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٨٧

| ژمارە | ناوی شار | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٧٧ | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٨٧ | ژمارەی دانیشتووانە زیادبووەكان لە دە ساڵدا | رێژەی زیادبوون لە ساڵێكدا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هەولێر | ١٩٣٥٥٨ | ٤٤٥٩٣٧ | ٢٥٢٣٧٩ | ٪١١،١١ |
| ٢ | سلێمانی | ١٧٥٤١٣ | ٣٦٤٠٩٦ | ١٨٨٦٨٣ | ٪٩،٧ |
| ٣ | دهۆك | ٤٠١٩١ | ١١٤٣٢٢ | ٧٤١٣١ | ٪١٦،٧ |
| ٤ | زاخۆ | ٣٠٢٩٩ | ٦٠٦٥٥ | ٣٠٤٥٩ | ٪٩،١ |
| ٥ | چەمچەماڵ | ١٣٤٢٣ | ٥٠٣٠٠ | ٣٦٨٧٧ | ٪٢٤،٩ |
| ٦ | كەلار | ٩٢٧٤ | ٦٣١٠٢ | ٥٣٨٢٨ | ٪٥٢،٧ |
| ٧ | ئاكرێ | ٨١٢٢ | ١٦٨٢٢ | ٨٧٠٠ | ٪٩،٧ |
| ٨ | رانیە | ٧٩٣٢ | ٤٩٩٨٦ | ٤٢٠٥٤ | ٪٤٨،١ |
| ٩ | عەنكاوە | ٥٧٥٥ | ١٩٣٤٠ | ١٣٥٨٩ | ٪٢١،٤ |

* سەرچاوەكانی خشتەكە

ـ الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧.

ـ الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، الجهاز المركزي للاحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٨٧.

## خشتەی ژمارە (٩)

## گۆڕانی ژمارەی دانیشتووانی هەندێ شاری دیکەی کوردستانی خواروو لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٨٧

| ژمارە | ناوی شار | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٧٧ | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٨٧ | گۆڕانی ژمارەی دانیشتووان لە یەک دەیەدا | ڕێژەی گۆڕان لە ساڵێکدا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەڵادزێ* | ١٣٦٨٥ | ١٤٤٨٧ | ٨٠٢ | %٠،٤ |
| ٢ | ڕەواندز | ٨٥٨٣ | ٨٦١٦ | ٣٣ | %٠.٠٢ |
| ٣ | سەرسنگ | ٧٧٦٠ | ٤٠١٣ | ٣٧٤٧- | %٤،٣- |
| ٤ | ئامێدی | ٦٩٤٧ | ٤٨٧٢ | ٢١٧٤- | %٢،٨- |
| ٥ | توزخورماتوو | ٦٨٨٣ | ٦٥٦٠ | ٣٢٣- | %٠،٣- |

سەرچاوەکانی ئەم خشتەیە هەمان سەرچاوەی خشتەکەی پێشووترن

---

* دانیشتووانی شارۆچکەی قەڵادزێ ساڵی ١٩٨٩ ڕاگوێزران.

بەبەراورد کردنی دوو خشتەی سەرەوە دەگەینە دوو ئەنجام: یەکەم، هەندێك لە شارەکان بە شێوەیەکی سەیر پەرەیان سەندووە و لە بەرامبەریشدا هەندێك شاری دیکە کە ژمارەیان زۆر کەمترە لە دەستەی یەکەم ژمارەی دانیشتووانیان زۆر لە کەمی داوە. دووەم، هەندێك شارۆچکە کە ژمارەی دانیشتووانیان زۆر کەم بوون لەم ماوەیەدا بوون بە شاری تەواو وەك چەمچەماڵ، کەلار، رانییە ... لە بەرامبەر ئەمەشدا هەندێك شار کە هەر لە کۆنەوە بە شار ناسراون لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو هەر نەمان یاخود زۆر بچووك بوونەوە وەك رەواندز، هەڵەبجە، قەڵادزێ، ئامێدی...هتد ئەم دەستەیە لە کاتێکدا ئێمە بە باشی هەست بە بچووك بوونەوەیان دەکەین ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو ئۆردووگا زۆرەملێیانەی کە لە دوای ساڵی ١٩٨٧ دروستکران. هەموو ئەو شار و شارۆچکانەی قەبارەیان گەورە نەبوو یان رێژەی دانیشتووانیان وەکو پێویست زیادی نەکرد، وێڕای ئەوەی پەیوەندیەکی زۆریان بە راگواستنی لادێنشینانی دەوروبەریانەوە هەیە، هەندێکیان گرفتی دیکەشیان هەبوو وەك ژینگەی سروشتی و تۆبۆگرافییان.

خەسڵەتێکی دیکەی شارەکانی کوردستانی خواروو لەو ماوەیەدا، زاڵبوونی کەشێکی پڕ لە ترس و نائارامی بوو. لە دوای نسکۆی شۆڕشی کورد ساڵی ١٩٧٥ خەڵکی ناوچە کوردنشینەکان بە گشتی تووشی بێهیوایی بوون، دواتریش زۆری نەخایەند عێراق کەوتە ناو شەڕێکی گەورەوە لەگەڵ وڵاتی ئێران. شەڕ تا دەهات درێژەی دەکێشا و قوربانییەکانیشی زێتر بوون. بۆیە هەموو پیاوەکان جگە لەوانەی زۆر بەتەمەن بوون دەکرا رەوانەی بەرەکانی شەڕ بکرێن. ئەو شەڕەی کە کوردەکان بە پیرۆزیان نەدەزانی، بۆ ئەوان گرنگ نەبوو ئەگەر عێراق بیدۆڕێنێت. بۆیە بەشداری کردن لە شەڕێکی لەم جۆرەدا جگە لە

ترسی مردن و بەدیل گیران، لەڕووی دەروونییەوە زۆر ئازاردەر بوو. دوای کۆتایی هاتنی شەڕی عێراق ـ ئێرانیش لە ماوەیەکی کەمدا عێراق وڵاتی کوێتی داگیر کرد، بۆیەش کەوتە ناو شەڕێکی زۆر گەورەترەوە. جگە لەوەش دامودەزگا حزبی و حکومیەکانی بەعس لەناو شارەکاندا بەردەوام خەڵکیان ئازاردەدا و لە هاووڵاتیانیان دەپێچایەوە، زۆر لەو ئاغا عەشایرانەی کە لە لادێوە هاتبوون بۆ شار ((مەفرەزەی خاسە)) (المفارز الخاصه)یان دەرکرد، ئەم مەفرەزانە لەو شارنشینانەی کە ببوون بە ئەمن و ئیستخبارات میهرەبانتر نەبوون. بۆیە زیادەڕەوی نییە ئەگەر بڵێین ئەو ماوەیە رەنگە سەختترین قۆناغی ژیان بوو بێت لە شارەکانی کوردستانی خوارووداا.

هەروەها لەگەڵ هاتنی ئەو خەڵکە زۆرە لە لادێکانەوە بۆ ناو شار، مەگەر بە دەگمەن، دەنا پیشەی هەموویان لە داچاندنی زەوی و مەڕدارییەوە گۆڕا بۆ پیشەی دیکە کە تایبەتن بە شارنشینییەوە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ئەمە بووە هۆی کەمبوونی دەرفەتەکانی کار و زۆربوونی بێکاری یان بێکاری داپۆشراو، چونکە هەموو ئەو بەناو جاشانەی کە نەدەچوون بۆ رەبیەکان یان ئەوانەی لە گوندەکانەوە هاتبوون بۆ ناو شار و ئیشێکی وەهایان دەست نەدەکەوت، هەروەها ژمارەی زۆری فیرار و موتەخەلیفەکان هەموویان ئاماژە بە بوونی بێکاریەکی داپۆشراو دەکەن لەو ماوەیەدا. بەڵام ئەوەی رێگەی لەوە دەگرت ئەم بێکاریە کێشەی ئابووری دروست بکات، ئەوەبوو کە ئابووری عێراق بەهێز بوو و خەڵك لە خۆشگوزەرانییەکی ئابووریی رێژەییدا دەژیان. هەموو کەسێك دەیتوانی بە ئاسانی ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێ. لە خێزانێکی بۆ نموونە هەشت کەسیدا، تەنیا تاکێك لەو خێزانەدا کاری دەستکەوتبا، ژیانی خێزانەکە دابین دەبوو.

لەم ماوەیەدا، شارەکانی کوردستان دووچاری دیاردەیەکی زۆر

بەرچاو هاتن کە دەکرێ بە ((بەلادێبوونی شار)) نـاوبنێین. بەلادێبوونی شار بریتییە لە دەرکەوتنی خەسڵەتگەلێکی شێوازی ژیانی لادێییانە لە ناو شارەکاندا. هەڵبەت شێوازی ژیانی شاری و لادێیی لە زۆر رووەوە لێك جیاوازن، وێڕای ئەوەی ئەم جیاوازیانە بەپێی وڵات و شارستانییەت و تەنانەت ناوچە دەگۆڕێن. هەروەها جیاوازی نێوان ژیانی شار و ژیانی لادێ شتێکی جێگیر و نەگۆڕ نییە، بەڵکو هێندە گۆڕاوە و هێندە راڤەی زۆرە کە لێکجیاکردنەوەی ئەم دووانە لە زۆر بارودۆخدا زەحمەتە. هەر چۆنێك بێت ئامادەیی خەڵکی لادێ لە ناو شاردا چ بە خێزانەوە لە وێ نیشتەجێ بن یاخود تەنیا رۆژانە بۆ کار و پێویستیەکانی رۆژانە لە ئۆردووگا و گوندە نزیکەکانەوە سەردانی شاریان کردبێت، بەهاتنیان بۆ شار نەبوون بە شارستانی، بەڵکو چەند کولتووری شار کاریگەریی لەسەر ئەوان هەبوو، کولتووری شار بە کولتووری ئەوان کاریگەر دەبوو، واتە ئەو دوو کولتوورە لە پەیوەندیەکی دیالیکتیکیانەدا بوون.

تاکی شارنشین جیاواز لە تاکی لادێنشین دەژیت، جیاوازی ئەم دووانە، رەنگدانەوەی جیاوازی نێوان کولتوور و وردە کولتووری ئەو دوو ناوچەیەیە، واتە جیاوازی لە بۆچوون و رەفتارەکان و رەنگە لە جلوبەرگ، شێوەزار بەم پێیەش وێڕای ئەوەی کە جیاوازیگەلێك لە نێوان ئەم دووانەدا هەیە، ئەوان بۆچوون و رەفتاری هاوبەشیشیان هەیە، چونکە هەردووکیان ئەندامی کولتوورێکی گەورەترن.[30] شارەکانی کوردستان ئەو زەمینە پتەوەیان نەبوو بەتایبەتی لەڕووی ئابوورییەوە تا بتوانن ئەو ژمارە زۆرەی راگوێزراوان لەخۆ بگرن و ئەو

---

30 جی. بی. جیتامبار، مقدمەای بر جامعەشناسی، ت: احمد حجاران و مصطفی ازکیا، نشر نی، تهران، ١٣٧٣،ص ١٠٥.

خەڵکە بکەنە شارستانی. تەنانەت رەنگە لە هەندێ باردا خەڵکە شاریەکە خەسڵەتی گوندیان هەڵگرتبێ و خەسڵەت و نۆرم و بەهاکانی لادێنشینان بەسەریاندا زاڵ بن. وێڕای ئەوەی رەگوڕیشەی شارنشینی لە کوردستاندا بۆ ماوەیەکی زوو دەگەڕێتەوە، بەلاّم کولتووری شارنشینی و ژیانی شارستانیانە بەردەوام دەگۆڕێن و کاریگەر دەبن بەو پێشکەوتن و داهێنانانەی رۆژانە سەرهەڵدەدەن و بە زۆر هۆکاری دیکەش. بۆیە لە هەموو شوێنێك و لە هەموو ماوەیەکی زەمەنیدا مەرج نییە هەموو شارەکان پێشکەون، هەندێ کات بۆ دواوە دەگەڕێنەوە.

لادێنشینەکان بە هاتنیان بۆ شار پیشەکانیان گۆڕان، خانووەکانیان گۆڕان و ئەوان کەوتنە ناو چوار دیوارەوە (بەو مانایەی کەمتر لە ماڵەوە دەردەچوون)، کەرەستەکانی ماڵەوە یاخود ئەوەی پێی دەڵێن ناوماڵ تارادەیەك گۆڕانی تێکەوت، بەلاّم رەفتاری کۆمەلاّیەتی و هوشیاری کۆمەلاّیەتیان درەنگتر گۆڕانی تێکەوت و بە رێژەیەکی کەمتر. بە هاتنیان بۆ ناو شار رەز و باخەکانیان لەدەستدا، بەلاّم ئامادە نەبوون بە ئاسانی دەست لە بەخێوکردنی پەلەوەر و ئاژەڵەکانیان هەڵگرن.* بەلای لادێنشینەکانەوە ئاسان نەبوو پەیوەندیەکانیان زێتر بن بە لاوەکی (پانوی) و رووکەشانە، یاخود دابونەریت و بەهاکانیان بگۆڕنەوە بە داب و نەریت و بەها شاریەکان.

---

* لە ساڵی ١٩٨٥ بەڕێوبەری شارەوانیی هەولێر لە نووسینێکدا وتی: (( هەزار جار دووپاتی قەدەغەکردنی بەخێو کردنی ئاژەڵ و بەرەلاّکردنی مەڕ و ماڵات کراوە و سزاشمان داون ئاژەڵەکانیشمان گل داوەتەوە، چونکە پیسی لە ئەنجامی بەخێوکردنیان و دروست کردنی هۆری بچووك لە تەك ماڵیانەوە پەیدا دەبێت)) بڕوانە: تەحسین چیچو و شێرزاد قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧.

لێرەشدا بە تێگەیشتنی ئوگبێرن* بۆ کولتوور ئەوان دووچاری دواکەوتنی کولتووری** -Cultural lag- هاتن.

هەروەها دیاردەیەکی دیکە کە لە شارەکانی کوردستانی خوارووداسەری هەڵدا، دەرکەوتنی شێوەزاری جیا جیا بوو لە شارەکاندا. هەڵبەت مەبەستمان ئەوە نییە کە بڵێین ئەم شێوەزارانە زۆر لە یەکتر جیاوازن، مەبەست زێتر ئەوەیە کە بە حوکمی ئەوەی پێش چارەگەی کۆتایی سەدەی بیست، جۆرە دابڕانێك و بەسەریەکەوە نەچۆنی خەڵکی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان لە ئارادا بوو، بە هۆی کۆمەڵێك فاکتەرەوە، لە ئەنجامی ئەمەشدا شێوەزاری هەر ناوچەیەك کەم تا زۆر لە شێوەزارەکانی ناوچەکانی دیکە جیاوازە. لە ناو خەڵکی شارەکانیشدا شێوەزارێك زاڵ بوو کە خەڵکی ناوچەکەی پێ دەناسرانەوە، بەڵام بە هاتنی خەڵکێکی زۆر لە ناوچە جیاجیاکانەوە لەپاڵ ئەو شێوەزارەی لە شارەکەدا زاڵ بوو. شێوەزاری دیکەش هاتنە ناو شارەوە، بەمەش شێوەزارەکان کاریان لەیەکتر دەکرد و ئەمەش هۆیەکی یارمەتیدەر بوو بۆ دروست بوونی زمانی یەکگرتووی کوردی.

---

*ویلیام ئۆگبێرن (W.Ogburn) جەخت دەکاتە سەر رۆڵی داهێنان لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، بە رای ئەو داهێنان گەشەسەندنی کولتووری مادی خێرا دەکات. ئەمەش دەلبێتە هۆی (( دواکەوتنی کولتووری ))، لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: د. محمد الجوهری و اخرون، دراسة علم الاجتماع، الطبعة الثانية، دار المعارف بمصر، القاهرة ١٩٧٥، ص ٥٠.

**دواکەوتنی کولتووری کاتێك روودەدات کە یەکێك لەو دوو لایەنەی کولتوور کە وابەستەن بە یەکەوە بەر لە لایەنەکەی دیکە و بە رێژەیەکی زێتر بگۆڕێت، بەم شێوەیەش ئەم دوو لایەنە کە پێشتر گونجاوبوون پێکەوە، بە جۆرێك لە نەگونجاوی لە نێوانیاندا دروست دەبێت. بگەڕێوە بۆ: پروین سازگارا، نگاهی بە جامعەشناسی: با تاکید بر فرهنگ، انتشارات کویر، تهران، ١٣٧٧ (١٩٩٨)، ص ٩٦.

هەروەها کۆمەڵناسی ئەمریکی ویلیام ئۆگبێرن یەکەم کەس بوو ئەم چەمکەی خستەڕوو. بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ: مەنوچێهر موحسنی، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، هەمان سەرچاوە، ل ١٢٢.

خەسڵەتێکی دیکەی بەلادێبوونی شـــارەکان کۆبوونـەوەی خـەڵکی ناوچەیەك بوو لەگەڕەکێك یاخود چەند گەڕەگێکی لێك نزیك و لـــەوێ بەردەوامی بـــە ژیانیـــان بـدەن کـە لـەڕووی دابونـەریت و پەیوەندیـە کۆمەلاّیەتیەکانەوە هەمان ژیانی لادێ بوو نەك شار، ئەمەش لە گشت شارەکانی کوردستانی خوارووددا دیارە، بـۆ نموونـە لـە شـاری هـەولێر گەڕەك بە ناوی عەشرەتەوە دروست بوون. هــەروەها جۆرێکــی دیکــەی دابەشـبوونی دانیشـتووان لـە شـارەکاندا دروسـت بـوو، بـۆ نموونـــە خۆشناوەکان بە زۆری لە گەڕەکی سێتاقانی سـەروو، خـەڵکی دەشـتی بەرانەتی و بەتاییەتی عەشرەتی گەردی لە تـەیراوە، خـەڵکی دەشـتی هەولێر لە گەڕەکی کوران کۆبوونەوە کە ئەو شـــوێنانە دەروازەی شـار بوون بەلای ناوچەکانیاندا، ئەمەش رەنگـــە بگەڕێتـەوە بـۆ پـەیوەندی مرۆڤی کورد بەو خاکەوەیە کە لەسەری لە دایك بووە و ئیشـــی تێـدا کردووە.

هاتنی خەڵکی زۆر لە لادێوە بۆ شار لەلایەك و پارێزگاریکردن لـە رێژەی زۆری زیادبوونی سروشتی لەلایەکی دیکەوە، بووە هـــۆی ئـەوەی ژمارەیەکی زۆر لـــە تاکـەکان لـە خـانووێکدا کۆببنــەوە. دوو هۆکـار دەستیان لە دروست بوونی ئەم دیاردەیەدا هەبوو: یەکەم لاوازی مەیلی دروست کردنی خــێزانی نـاوەکی لــە لایـەن شارنشـینەکانەوە. دووەم، خراپی باری ئابووری ئەو لادێنشینانەی دەهاتنە شار، ئەوان هەمیشـــە نەیاندەتوانی خانوو دروست بکەن یان خانوویەکی ســـەربەخۆ بـەکرێ بگرن. بۆیە چڕی دانیشتووان لە هەر خانووێکدا زیـادی دەکـرد، واتـە زێتر لە بەر لە دەیەیەك.

هەرچـەندە لـە پـەنجا و شەسـتەکانی سـەدەی رابردووشـدا رێـژەی خێزانی گەورە لە کوردستانی خوارووددا زۆر نەبوو، بەڵام ئەم رێژەیە لـە حەفتا و هەشتاکانی سەدەی رابـــردوودا گۆڕانێکــی بـەرچاوی بـەخۆوە

نەبینی. واتە زۆر کەمی نەکرد، وێڕای ئەو گۆڕانە زۆرەی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی لادێنشین و شارنشینەکاندا هات. بۆیە دەتوانین بڵێین جیاوازی پێکهاتەی خێزان لە شارەکان لەڕووی چەندێتییەوە لەگەڵ خێزانی لادێدا جیاواز بوو نەك لەڕووی چۆنایەتیەوە، لە شاریش وەك لە شارە عەرەبیەکان خێزانی گەورە مایەوە لەگەڵ مەیلێکی بەرچاو بەرەو خێزانی ناوەکی.[31] سەبارەت بە دەسەڵاتی خێزان دیسان گۆڕانەکە هێندە بەرچاو نەبوو، باوك ئەوکات و ئێستاش هەر دەسەڵاتی یەکەمی هەیە. بڕیارە گرنگەکان، بە دەگمەن نەبێت، دەنا هەر لە دەستی ئەو و هەندێك جار ئەو و برا گەورە دان، ئەو چەمکەی ((هیشام شەرابی))* بەکاری هێناوە، واتە ((باوکسالاری نوێ)) ڕەنگە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو گۆڕانەی بەسەر سستەمی باوکسالاریدا هاتووە، لە کوردستاندا لە سایەی ئەم سستەمەدا ویستی باوك ویستێکی ڕەهایە.[32] ڕۆڵی ئافرەت هەرچەند زۆر نەگۆڕا، بەڵام باشتر بوو لە جاران، ئەویش لەبەر ئەوەی

---

31 د. حليم بركات، المجتمع العربي المعاصر، الطبعة السابعة، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠١، ص ٩٦.

* هیشام شەرابی بە درێژی باس لەو گۆڕانە دەکات کە بەسەر باوکسالاریدا هاتووە لە کۆمەڵگای عەرەبیدا. دەڵێت: (( لە سەد ساڵی کۆتاییدا گۆڕانێکی گەورە بەسەر کۆمەڵگای عەرەبیدا هاتووە، بەڵام ئەم گۆڕانە نەبووە هۆی گۆڕینەوەی سستەمی کۆن بە سستەمی نوێ، بەڵکو کۆنەکەی نوێ کردەوە بەبێ ئەوەی لە ڕەگوڕیشەوە بیگۆڕێت، لە ئەنجامی ئەوەشدا باوکسالاری نوێی لێ کەوتەوە. ئەم سستەمە هاوکات بانگەشەی نەریت و مۆدێرنە دەکات)). هەروەها دەڵێت ئەم سستەمە چەندە لە نەریت دوورە هێندەش لە مۆدێرنە. لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ : د. هشام شرابي، النظام الابوي واشكالية تخلف المجتمع العربي، ت: محمود شريح، الطبعة الثانية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٣.

32 د. هشام شرابي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

ڕێژەیەکی زۆری ئافرەتان پێشینەیەکی لادێییانەیان هەیە،* ئافرەتی لادێیش لە دەیەکانی پێشتردا ئازادتر بوو لە ئافرەتی شار. دواتریش ئافرەت لە شار چیتر تەنیا وەك جاران لە ماڵەوە نەمایەوە، بەڵکو ڕێژەیەکی بەرچاویان لە دەرەوە کاریان دەکرد و هەندێکیان ئابووریەکی تایبەت بە خۆیان هەبوو. ئەو شتانەی کە پێویست بۆ کار لە خێزانە کۆچکردووەکان بۆ شار بکات: پێویستی خۆگونجاندنیان بوو لەگەڵ بارودۆخی نوێ لە ژینگەی شارنشینی، قەرەباڵغی ئەو خانووەی کە خێزانەکە لە شاردا دەستی دەکەوێت، ڕووبەڕووبوونیان لەگەڵ شێوازی ژیانی شارنشینی نوێ، ئەم هەموو پێویستیانەش بەگشتی خەڵکی نوێ هاتووی بۆ شاری ناچار دەکرد بەرە بەرە واز لە شێوازی ژیانی کۆنیان بێنن.

## باسی سێیەم: گوندی نوێ لە کوردستانی خوارووا

مەبەست لە گوندی نوێ ئەو گوندانەن کە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لە کوردستانی خوارووا ئاوەدانکراونەتەوە، نەك ئەوەی کە دامەزراوەی نوێ و شێوازێکی ژیانی نوێیان هەبێت.**

---

* لە باسی ((خولی ژیانی خێزانی کورد)) کە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییەلە شاری هەولێر، نموونەی باسەکە لە ٢٥٠ ئافرەت پێکدێت، ئەم نموونەیە بە شێوەیەکی هەرەمەکی لە دە گەڕەکی جیاوازی شاری هەولێر وەرگیراوە، دەرکەوتوە کە ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی لە لادێ لە دایك بوونە (٧٤٪) ە، ئەوانەی لە شار لە دایك بووین تەنیا (٢٦٪)ە. لە کاتێکدا ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی تەمەنیان لە چل ساڵ کەمترە ٧٦٪ باسەکە پێکدێنن. بڕوانە: عەبدولحەمید بەرزنجی، خولی ژیانی خێزانی کورد، سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢٥، هەولێر پایزی ٢٠٠٢، ل ٣٩ ـ ٥٣.

** هەرچەندە ئێمە گوندگەلێکی زۆرمان لە کوردستانی خوارووا هەیە کە خەڵکەکەیان ڕانەگوێزراون و خانووەکانیان نەتەقێنراونەتەوە. لە هەردوو سەردەمی بەر لە ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین خزمەتگوزاری (ئاوی بۆری، کارەبا، قوتابخانە، بنکەی تەندروستی، شەقامی نوێ...)ی تا ڕادەیەکی باش بۆ خەڵکەکە دەستەبەرکران، ڕەوشی

دوای نەمانی دەسەڵاتی سیاسی بەعسیەکان لە کوردستانی خواروو، هەندێك لە لادێنشینە راگوێزراوەکان، ئەگەرچی ژمارەشیان کەم بوو، گەڕانەوە گوندەکانیان، لە ناوچە شاخاویەکان بەزۆری بەهەمان بەردەکانی خانووە کۆنە رووخاوەکانیان هەوڵیاندا جارێکی تر خانوو دروست بکەنەوە، بەڵام لە پێدەشت وەکو جاران بە خشت خانوویان دروست کردن. لەبەر رەوشی زۆر خراپی ئابووری ئەوکات، ئەوانەی کە گەڕابوونەوە نەیانتوانی خانووێك دروست بکەن کە جیاواز بێت لە کۆنە خانووە رووخاوەکانیان، هەم لەڕووی قەبارە و ئەندازەوە و هەمیش لەڕووی کەرەستەکانی بیناسازیەوە.* دیواری ئەم خانووە نوێیانە بە زۆری لە بەرد و قوڕ یان خشت دروست کراون و بانەکانیان بە کاریتە دارەڕادەکران و زۆربەی ئەو بانانەش نزم بوون، هەروەها لە ژوورێك یان دوو ژوور پێکدەهاتن.

خەڵکی ئەم گوندانە دوور لە کارەبا و ئاوی بۆری لە ماڵ، نەبوونی قوتابخانە یان نەخۆشخانەی نزیك درێژەیان بە ژیاندا. دەکرێ بڵێین ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەوان لەگەڵ ژیانی پێشوویان واتە، پێش راگواستن، هێندە جیاواز نەبوو. ژیانی نوێیان زێتر لە ژیانی پێش راگواستنیان دەچوو تاکو ژیانی نێو ئۆردووگا کە هەندێکیان زێتر لە

---

ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتووانی لە رەوشی دانیشتووانی گوندە تازە ئاوەدانکراوەکان باشترە، بەڵام ئێمە لەم باسەدا ئەوانمان بە گوندی نوێ ناو نەبردووە، چونکە مەبەستی ئێمە لە وشەی (نوێ) تەنیا ئەوەیە کە سەر لە نوێ ئاوەدانکراونەتەوە (دوای راپەڕینی ١٩٩١).

* نموونەی ئەم خانووانە هێشتا لە هەندێك لە گوندە تازە ئاوەدانکراوەکاندا ماون. لەو گوندانەی کە رێکخراوە بیانییەکان کاری خۆیان تێدا چڕ نەکرد و هێشتا خێرو بێری بڕیاری ٩٨٦یش پێیان نەگەیشتووە، هەندێك لە خەڵکی لەو خانووانەدا دەژین، لەو گوندانەش کە خانووی نوێیان بۆ دروست کردوون، بۆ بەخێو کردنی ئاژەڵەکانیان سوود لەو خانووانە وەردەگرن.

ده ساڵ بوو تاقیان دەکردەوە. دانیشتووانی هەندێك لەم گوندانە وەکو جاران هەموویان لە ژوورێك دەخەوتن، ژووری خواردن و خەوتن هەر هەمان ژوور بوو. بە کەر و گا جووتیان دەکرد و زۆربەی هەرە زۆریان ئەوانەشیان نەبوو، پیشەیان بووەوە بە مەڕداری (بەڵام ژمارەی ئاژەڵەکانیان لە جاران کەمتر بوون) و داچاندنی زەوی. شەوچەرە، سەرکانی ژنان، کاری زۆر و بەردەوام ... تاڕادەیەك هەموو ئەمانە لەو ماوەیەدا زیندوو بوونەوە.

دواتر (دوای دوو سێ ساڵ یان زیاتر) لەبەر بەرەو خراپتر چوونی رەوشی ئابووری وڵات، هەروەها بێزاربوونی خەڵك لە ژیانی ئۆردووگاکان، جۆرێك لە کۆچی پێچەوانە (لە ئۆردووگاوە بۆ گوند) بە شێوەیەکی بەرفرەوانتر لە کوردستانی خواروو روویدا. ئەم کۆچە، کۆچێکی زۆرەملێ نەبوو، بەڵکو لە زۆر باردا کۆچێکی ناچاری بوو، لە کەم حاڵەتیشدا کۆچێکی ئیرادی بوو، چونکە وێڕای ئەوەی خەڵکێك بەبێ ئەوەی زۆریان لێ بکرێت یان گوشارێکی سیاسیان لەسەر بێت، گەڕانەوە بۆ گوندەکانیان و دەستیان کرد بە ئاوەدانکردنەوەیان. ئەوان بۆ شوێنێك گەڕابوونەوە کە نە قوتابخانە، نە نەخۆشخانە، نە کارەبا و لە هەندێك حاڵەتیشدا جادەیەکی وەهایان نەبوو کە شیاوی باس بێت. ئەگەر ناچاری نەبوایە ئەوان بەو شێوەیە بۆ ئەوێ کۆچیان نەدەکرد، هەرچەند زێدی خۆشیان بێت. ئەوەی کە ئەوانی ناچارکرد کۆچ بکەن، کۆمەڵە هۆکارێك یان پاڵنەرێك بوون لەوانە: خراپی باری ئابووری لە ئۆردووگاکان (پێشتر ئاماژەمان بەوەکرد کە لەو ماوەیەدا ـ دوای راپەڕین ـ رەوشی ئابووری ئۆردووگاکان لە رەوشی ئابووریی دانیشتووانی شار و لادێکان خراپتر بوو)، کەمی دەرفەتەکانی کار، خراپی خزمەتگوزاریەکان، دەسپێکردنی شەڕی ناوخۆ لە نێوان حزبە کوردستانییەکاندا، هاندانی دەسەڵاتی کوردی بۆ ئاوەدانکردنەوەی

گوندەکان، دەکرێ ئەوانە بە هۆکاری پاڵپێوەنەری کۆچی پێچەوانە ناو بنێین. چەند هۆکارێکی دیکەش هەبوون کە پەیوەندیان بە ژینگە و هەلومەرجی گوندەکانەوە هەبوو و سەرنجی کۆچکردووەکانیان رادەکێشا لەوانە: بوونی زەوی کشتوکاڵی بەو هیوایەی لەوێ بەروبومێکی کشتوکاڵیان دەسکەوێت و لەمەترسیی برسێتی رزگاریان دەبێت، دوورکەوتنەوەیان لە مەترسی شەڕی براکوژی کە تەڕ و وشکی دەسوتاند، بوونی بیرەوەری خۆشی ژیانی رابردووی گوند لە یادەوەری راگوێزراوەکاندا، یارمەتی و هاوکاریی رێکخراوە مرۆییە بیانییەکان بۆ لادێنشینان.*

هەر وەك چوون هەموو ئۆردووگاکان یەك فۆرم، یەك قەبارە و شێوەیان نەبوو، گوندەکانیش بە هەمان شێوە لەگەڵ ئاوەدانبوونەوەیان لە دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ فرە جۆرترن و بە هیچ شێوە ئێمە یەك شێوەی گوندمان نییە کە بگشتێنین و بڵێین گوندی کوردی بە تەواوی بەم شێوەیەیە، جیاوازی نێوان گوندەکان بە پێی ناوچە جیاوازەکان دەگۆڕێت، ئەمە لەڕووی قەبارە و شێوەوە، لەلایەکی دیکەشەوە گوندمان هەیە خزمەتگوزاری کەمی پێ گەیشتوون کە شیاوی ئاماژە پێ کردن نین، گوندیشمان هەیە زۆربەی خزمەتگوزارییە پێویستەکانی

---

* بەشێکی ئەم خێزانە گەڕاوانە (بەتایبەتی لە ناوچە سەر سنوورییەکان) بوون بە دوو خێزان، یەکێکیان لە گوند و ئەویتر لە ئۆردوگا، کۆمەڵێکی دیکەی ئەو خێزانانە تەنیا لە زستاندا دەبوون بە دوو خێزان، ئەویش بۆ ئەوەی خوێندنی منداڵەکانیان نەفەوتێت، چونکە لە گوند قوتابخانە نەبوو. دواتریش هەندێك لەو کۆچکردووانە لە گوندەوە گەڕانەوە ئۆردووگاکان و وازیان لە ژیانی گوند هێنا، ئەویش لە بەر: شەڕی حزبە کوردیەکان بە تایبەتی pdk ، puk، pkk ، هەروەها لەبەر خراپی خانووەکانیان کە بەرگەی بەفر و بارانی کوێستانەکانیان نەگرت، باشتر بوونی رەوشی ژیانی ئۆردووگاکان لە دوای بڕیاری ٩٨٦ و کەمی خزمەتگوزارییەکان لە گوند.

بۆ ڕۆیشتوون. سەرەڕای ئەوەش ئەم جیاوازیە نابێتە هۆی ئەوەی ڕەگەزگەلێکی گشتی لە نێوان زۆربەی گوندە نوێکاندا نەبینینەوە و بە هۆی خەسڵەتگەلێکەوە لە ژیانی دانیشتووانی گوندەکانی حەفتاکان و هەروەها ئۆردووگاکان جیانەکەینەوە.

ئەو خانووەی ئێمە لە سەرەتای ئەم باسەدا ئاماژەمان بە دروست کردنی لە لایەن گەڕاوەکانەوە کرد (ئەو خانووەی لە سەر شێوەی خانووی کۆنە)، هەرچەند لە ناوچە شاخاویەکاندا ژمارەیان کەم بوو، بەڵام بەرەو کەمتریش ڕۆیشتوون، چونکە دوای ئەوەی خەڵکی زێتر گەڕانەوە گوندەکان و دەستیان بە کار کرد، لەپاڵ داچاندنی زەوی و بەخێوکردنی ئاژەڵان ژمارەیەکی زۆری لادێنشینەکان بە پیشەیەکی دیکەشەوە خەریك بوون، بەمەش ڕەوشی ئابووریان بەرەو باشتری چوو، بەرە بەرە هەوڵیاندا خانووەکانیان گەورەتر بکەن و زێتر بایەخ بە جوانکاریەکەی بدەن. لە زۆر لە گوندە تازە ئاوەدانکراوەکانیشدا ڕێکخراوە بیانییە مرۆییەکان ڕاستەوخۆ دوای ڕاپەڕین لە ناوچە جیاجیاکاندا ئەرکی دروست کردنی خانووی هەندێك لە هاووڵاتیان یاخود بەشێکی ئەرکەکەی وەك بەخشینی بەشێکی کەرەستەی خانووبەرە پێیان، لە ئەستۆ گرت. بە دەرچوونی بڕیاری ٩٨٦ی نەتەوە یەکگرتووەکان (نەوت بەرامبەر خۆراك)، هەم ڕەوشی ئابووری لادێنشینان هاوکات لەگەڵ ڕەوشی دانیشتووانی شار و ئۆردووگاکان بەرەو باشتری چوو، هەمیش ڕێکخراوەکانی سەر بە UN لە بوارە جیاوزاەکاندا خزمەتگوزاری جیاجیایان پێشکەش بە ژمارەیەك دانیشتووانی گوندەکان کردن بەجۆرێك کە ئەو گوندانەی یارمەتیان درا لەڕووی خزمەتگوزاریەکانەوە بە تەواوی لە گوندەکانی شەست و حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو جیاوازن، جیاوازیەکەش بە ڕادەیەکە کە بە زەحمەت دەشێ بەراورد بکرێت. بەڵام لە پێدەشتدا (بۆ نموونە دەشتی

هەولێر) ئەو خانووەی لەسەر شێوەی خانووی کۆن دروستکرایەوە ڕێژەی زۆر زێترە لەو خانووەی بە شێوەی جیاواز لە جاران دروستکرا. هەروەها کەرەستەی بیناکردنیش لەم جۆرە گوندانەدا بەزۆری خشتە و کەمتر پەنایان بۆ بلۆك بردووە. ڕێکخراوە NGO یەکانیش کەمتر هاوکاری خەڵکی ئەم لادێیانەیان کردووە. لەلایەکی تریشەوە دەرفەتەکانی کارکردنیش لەبەردەم دانیشتووانی ئەم لادێیانەدا کەمتر بوون. وەکو دیاریشە ئەو خەڵکەی گەڕاوەتەوە ئەم گوندانە زێتر خەڵکێکی هەژار بوون، بەپێچەوانەی ناوچە شاخاویەکان کە تەنیا هەژارەکان نەگەڕانەوە. بۆیە گوندی نوێی پێدەشت زێتر لە گوندی کۆن دەچێت.

یەکەم شتێك لە گوندی ناوچە شاخاویەکادا کە لە گوندە شەترەنجیەکان (ئۆردووگا) وەرگیراوە، نەخشەی خانووە،* خانوو لە گوندی نوێدا، هەڵبەت نەك هەموو خانووێك بەڵکو زۆریان (ئەوانەی ئێمە بینیومانە) بەتایبەتی ئەوانەی پێش بڕیاری ٩٨٦ دروست کراون لە سەر نەخشەی خانووی ئۆردووگا یاخود نەخشەیەکی نزیك لەوەوە دروست کراون. ئەو خانووانەی درەنگتر دروستکران یاخود خەڵکێك دروستی کردن کە باری ئابووریان باشتر بوو، دەکرێ بڵێین لەڕووی گەورەیی و کاری ئەندازەییەوە خانووی گونجاو بوون. هەروەها کەرەستەی خانووی گوندی نوێ جگە لەو خانووە سەرەتاییەی یەکسەر لە دوای ڕاپەڕین دروست کرا، زۆربەی هەرە زۆری خانووەکان بەرد و گەچ، بەرد و چەمەنتۆ یاخود بلۆکی کۆنکریت و چەمەنتۆ بوون، زۆر کەمیش کەرپووچ تیایاندا بەکار هاتوون. هەروەها چیتر داری مازوو یان بەڕۆ لە دارەڕاکردنی خانوودا بەکار نایەت، ژمارەیەکی بەرچاوی بانی خانووی گوندەکانیش کۆنکریتن، ئەگەر بانەکانیان خۆلیش بن

---

* ئەم دیاردەیە تایبەتە بەو ڕاگوێزراوانەی لە ئۆردووگاکاندا نیشتەجێ کران.

ئەوا یان حەسیر یان تەنەکە تیایدا بەکار هاتووە. دیواری خانووەکان وەك جاران نزم نین یاخود پەنجەرەیان کەم نییە و پەنجەرەکانیش بچووك نین.

لەم ساڵانەی دوایی بە هۆی پرۆگرامی نەوت بەرامبەر خۆراك، کۆمەڵێك خانووی بە کۆمەڵ لە شوێنە جیاجیاکان دروستکران، ئەم خانووانە ئەگەرچی لەڕووی قەبارەوە خانووی گەورە نین، بەڵام لەڕووی کەرەستە و کاری هونەری و ئەندازەییەوە نموونەیین و ئێمە لەو بڕوایەدا نین پێشتر لە گوندی کوردیدا بەو شێوەیە بایەخ بە خانوو درابێت بەتایبەتی لەڕووی کاری ئەندازەییەوە. هەمدیس لەم خانووانەدا خزمەتگوزاریەکانی وەك کارەبا، کەرەستەی تەندروستی ... لەبیر نەکراون. بۆیە لە بارەی خانووی گوندی کوردیەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین چ لەڕووی قەبارە و کاری ئەندازەییەوە بێت یاخود لەڕووی کەرەستەی بیناسازی، خانوو لە گوندا گەشەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە و زۆر لە خانووی حەفتاکانی سەدەی رابردوو جیاوازە.** وێڕای ئەوەش بە پێچەوانەی ماڵی پێش چارەگە سەدەیەکی گوندی کوردی، ئەمڕۆ خانووەکان لە گوند کەلوپەلێکی زۆر زێتر لە جاران لە خۆیاندا جێ دەکەنەوە و کەلوپەلەکانیش هەمووی سادە نین، یاخود تەنیا پێویستیە بنەڕەتیەکان نین.

دیاردەیەکی دیکە لە گوندی نوێی کوردیدا ئەوەیە کە ئەو گوندانەی هەندێك دوور بوون لە شەقامی سەرەکی، دانیشتووانیان لە جیاتی ئەوەی هەوڵبدەن جادەیەك بۆ گوندەکەیان بکەنەوە، لە شوێنە

---

** مەبەست لێرەدا خانووی ئەو گوندانەیە کە رێکخراوە ((NGO)) کان بەچڕی کاریان بۆ ئاوەدانکردنەوەیان کردووە. حزبە کوردیەکانیش (PUK . PDK) رۆڵیان هەبوو لەوەی رێکخراوەکان چالاکیەکانیان لە هەندێ ناوچەدا چڕبکەنەوە.

بەرزەکان هاتوونەتە خـــوارەوە و خۆیـان لـە شـەقامی سـەرکی نزیـك کردووتەوە. نزیکی لە شەقامی ســەرەکی پێویســتیەکی ژیانیـان بـوو نەدەکرا چاوپۆشی لیّ بکەن. بۆ گۆڕینی شوێنی گوندەکەش ســیّ شـت یارمــەتیدەر بـوون: یەکـەم، نـەمانی ئـــەو هۆکــارەی کــە هــانی لادێنشـینەکانی دەدا شـوێنی سـەخت و شـاراوە بـۆ شـوێنی گونـــد هەڵبژێرن. دووەم، ئاســـانی گواســتنەوەی سـەرچاوەی ئـاوی گونـد بـۆ شوێنێکی نزمتر لە شـــوێنی گونـدی کـۆن. سـێیەم، هەسـتکردن بـە پێویستی خۆنزیککردنەوە لە شـــەقامی سـەرەکی، چونکـە بـە نزیـك بوونەوەیان لە شەقامی سەرەکی زۆر لە کارەکانیان ئاساناتر جێبـــەجیّ دەبن. هەروەها ئەگەرچی لادێنشـــینەکان ئـەمڕۆش بـۆ هـەندێك کـار پێویستیان بە راگرتنی ولاخ مابێت، ژمارەیـەکی خـەڵکی لادیّ کـەر، ئێستر یان ئەسپ بەخێو بکەن، ئەوە مانای ئەوە نییە کـە لـە بایـەخی ئوتۆمبێل کەم دەبێتەوە. تەنیا چەند پێویستیەکی کەم و سنووردار بـە ولاخ جێبەجیّ دەبن. بۆیـــەش رەنگـە هیـچ گوندێکـی بچووکیـش لـە کوردســتانی خـواروودا نـەبێت ئوتۆمبێلـی لیّ نـەبێت. نـەك تـــەنیا ئوتۆمبێلی وەك تەراکتۆر و تۆیۆتا کە زێتر ئوتۆمبێلــی عەمــەلین بـۆ گوند، بەڵکو هەموو جۆرە ئوتۆمبێلێکی نەفەر هەڵگری بچووکیـــش کە ئەمڕۆ لە شارەکان هەن لە هەندیّ لادیّ دەسدەکەون.

سەبارەت بە ژمارەی دانیشتووان و چڕی لە گوندی نوێــدا دەتوانــین بڵێین ئەم لایەنە، رەنگە تاکە شتێك بێت لە گوندی نوێدا کـە لەگـەڵ گوندی کۆن جیاوازیەکی زۆری نـــەبێت. وێـڕای ئـەوەی دانیشــتووانی کوردستانی خواروو لە سیّ دەیەی کۆتاییدا بە بەراورد لەگـــەڵ پێشــتر ژمارەیان زۆر زیاد بووە، شار و شارۆچکەکانی ئەمڕۆ بە بەراورد لەگەڵ شاری حەفتاکان لە رادە بەدەر گەورە بووین، هەروەها ئۆردووگاکان لــە هەموو لایەکیانەوە پەلۆپوو دەهاوێن، ســەبارەت بـەو گوندانــەش کـە

دانیشتووانیان بەر پەلاماری راگواستن نەکەوتن، زۆر چڕترن لە جاران، بەڵام گوندە نوێکان زۆربەیان لەڕووی چڕی دانیشتووانەوە زۆر زیادیان نەکردووە. ئەمەش لە بەر ئەوەی ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی زۆربەی لادێکان گەڕاونەتەوە، چونکە لەلایەکەوە دەرامەتی هەر گوندێک سنووردارە، بەتایبەتیش کە زێتر پشت بە کشتوکاڵ دەبەستن، بەشی خەڵکێکی زۆر ناکات. لەلایەکی دیکەشەوە خەڵکی ئەو گوندانە لە ژینگەی نوێیاندا بەبۆنەی پیشەی نوێیان و هەندێك بابەتی دیکە وا بە باش دەزانن کە بە ئێکجاری یان بەلای کەمەوە لەم بارودۆخەی ئێستادا نەگەڕێنەوە بۆ گوندەکانیان. بەڵام لەبەر ئەوەی خانووەکانی ئەمڕۆ بەگشتی قەبارەیان گەورەترە لە خانووە کۆنەکان هەروەها چیتر وەك جاران ناچار نین لە نزیك سەرچاوەی ئاوەوە لەپاڵ یەك دروست بکرێن، قەبارەی گوند گەورەتر و خانووەکان پەرت و بڵاوترن، بەڵام دیسان چونکە ژمارەی خێزانە گەڕاوەکان لە زۆربەی گوندەکاندا کەمە، ئەو جیاوازیە (قەبارەی گوندی نوێ و کۆن) هێندە زۆر نییە.

دەکرێ بڕیاری نەوت بەرامبەر خۆراکی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە خاڵێکی وەرچەرخێنەر لە ژیانی هەندێ لە لادێنشینە کوردەکان لە کوردستانی خوارەوودا لەقەڵەم بدەین. لە ئەنجامی ئەو بڕیارەوە قوتابخانە و بنکەی تەندروستی زۆر لە گوندەکان دروستکران، هەروەها گەلێك پرۆژەی ئاو و ئاوەڕۆ کرانەوە. هەرچەند لە سەردەمی رژێمی بەعسدا جادەی عەسکەری گەیشتە لوتکەی زۆر لە چیا بەرزەکان، بەڵام جادە بۆ زۆر لە گوندەکان تا بەم دواییانەش نەچوو بوو، لە ئەنجامی ئەم بڕیارەدا جادەی زۆر گوند کرایەوە. کارەبا کە پێویستیەکی ئەم سەردەمەیە یەکەم جار بەهۆی ((موەلیدەی کارەبایی بچووك)) لە رێی هەندێك خێزانی خوشگوزەرانەوە چووە ناو زۆر لەو گوندانەی کە تا ئەو کات کارەبایان نەبینیبوو. بە هۆی جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارەوە

موەلیدەی کارەبایی تارادەیەك گەورە بەسەر زۆر لە گوندەکاندا دابەشکران.

ناکرێ بە هیچ شێوەیەك رۆڵی کارەبا لە ژیانی لادێنشینان و دروست کردنی گۆڕان لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیاندا پشت گوێ بخەین. تەلەڤزیۆن زۆرترین کاریگەری هەبوو لە هاتنی کارەبا بۆ گوند، بە دەستەواژەیەکی دیکە تەلەڤزیۆن هۆی گەیشتنی کارەبا بوو بۆ یەکەم جار لە زۆر لە گوندەکاندا. وێڕای ئەوەی کارەبا و روناکی سیمایەکی تازە بە گوند دەبەخشن و سەرنج راکێشن، بەڵام زێتر تەلەڤزیۆن یان باشتر بڵێین سەتەلایت بوو نەك روناکی رۆڵی گەورەی گێڕا لە گەیشتنی کارەبا، سەرەتاش لەرێی موەلیدەی بچوکەوە. سەتەلایت هەر زوو جێگەی چیرۆك و سەربوردە کۆنەکانی بەرئاگردانی کوردەواری گرتەوە، خەڵکی لادێ لە جیاتی ئەوەی وەك جاران لە دیوەخانێك کۆببنەوە، لە ماڵێکا کۆدەبوونەوە کە سەتەلایتی هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی بە هۆی بڕیاری ٩٨٦ وزەی کارەبا گەیشتە زۆر لە گوندەکان و باشتر بوونی باری ئابووری گوندنشینان، ژمارەی سەتەلایتەکان لە هەندێك لە گوندەکان نزیکەی ژمارەی ماڵەکانی گوندەکانی لێهات،* دواتریش زۆربوونی ئامێرەکانی CD لەپاڵ رادیۆ و ستریۆدا، لە ئەنجامی هاتنی ئەم ئامێرانە و هەندێك هۆی دیکە نەك تەنیا کۆبوونەوەی لادێنشینەکان شەوانە لە یەکێك لە ماڵەکاندا کەمبووەوە بەڵکو سەردانی لادێنشینانی زوو زوو بۆ ماڵی یەکتر بەرەو کزی رۆیشت، هەڵبەت کەمبوونەوەی ئەم کۆبوونەوە و سەردانانە

---

* ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ژمارەی سەتەلایتەکان لە هەندێك لە گوندە سەر سنووریەکان و ناو شاری هەولێر بکرێت، بە مەرجێك رەچاوی ژمارەی خێزانەکان لەو بەراوردەدا بکرێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە ژمارەی سەتەلایتەکان لەو گوندانە زیاتردەبن وەك لە شاری هەولێر.

کاریگەری بەرچاوی لەسەر پەیوەندی هاوگوندیەکان هەیە.[*] رەنگە ئەمە یەکێك لەو هۆکارانەش بێت کە ئێمە ئەمڕۆ کەمتر شایەدی هاوکاری و کاری هەرەوەزین لە گوندە نوێکاندا.

ژیان لە ئەمڕۆی گوندی کوردیدا وەك جاران سەخت نییە، لادێنشینان وەك جاران رووت و رەجاڵ و برسی و چەوساوە نین. هەروەها بە گەورە و گچکەوە وەکو پێشان مێرووله ئاسا خەریکی کار و بزاڤ نین، دەگمەنن ئەوانەی جووت بە کەر و گا یاخود ئامێرە سەرەتاییەکان دەکەن، یان بە شێوەی جاران زەوی دەکێڵن و مەڕ و ماڵات بەخێو دەکەن. ئەمڕۆ لادێنشینان لە ژیانیاندا تەنیا پشت بە مەڕداری یاخود داچاندنی زەوی نابەستن، لەپاڵ ئەوەدا کە زۆربەیان مانگایەك یان چەند سەر مەڕ و بزنێك بەخێو دەکەن و چاودێری چەند دار و درەختێك و هەندێك بەروبۆمی کشتوکاڵی دەکەن، سەرقاڵن بە پیشەیەکی دیکەی وەك شوفێری، دوکانداری، فەرمانبەری...هتد. هەروەها بەشێکی خەڵکی لادێکان هێندە خۆیان بە بەروبۆمە خۆماڵیەکانی دیکەی وەك تەماتە، باینجان، سەوزە و میوەوە خەریك ناکەن، چونکە بەبێ ماندووبوون و بە نرخێکی گونجاو دەستیان دەکەون. لە دوای بڕیاری ٩٨٦ رۆژ لە دوای رۆژ لادێنشینان لە ناوچە شاخاویەکاندا پشت لە داچاندنی زەوی دەکەن و بەگشتی زۆر کەمتر لە جاران

---

* رێبوار سیوەیلی لە وتارێکی درێژدا بە ناوی ((وردە مێژوو: حەکایەتی ئامێرە تەکنەلۆژیەکان))، بە درێژی پەرژاوەتە سەر کاریگەری رۆڵی ئامێرە تەکنەلۆژیەکانی وەك رادیۆ، کامێرای کۆداك، کامێرای ڤیدیۆ... لەم وتارەدا باس لە رۆڵی ئەم ئامێرانە دەکات لە دروست کردنی گۆڕان لە شێوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و ئەو وێنانەی لە زەینی تاکەکاندا بوون. بەڵام ناوبراو کەمتر ئاماژەی بە رۆڵی تەلەڤزیۆن کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە لە بایەخی ئەو باسە کەم ناکاتەوە، بەوەی کەتوانیویەتی تیشك بخاتە سەر ئەم لایەنەی مێژووی کۆمەڵگاکەمان کە ئەوانی دیکە فەراموشیان کردووە. لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: رێبوار سیوەیلی، دنیای شتە بچووکەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩، ل ١٨٣ ـ ٢١٤

خەریکی کاری کشتوکاڵین.
کەمبوونەوەی ئاژەڵ و پەلەوەرەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە دیاردەیەکی بەرچاوی دیکەیە لە گوندی نوێی کوردیدا. ئەگەرچی لادێنشینان ئەمڕۆش هەموویان ئاژەڵ بەخێو دەکەن، بەڵام ژمارە و جۆری ئەو ئاژەڵانەی بەخێو دەکەن بەتایبەتی مەڕ و بزن و رەشەولاغەکان زۆر لە کەمی داوە و وەك جاران ئێواران مێگەلە مەڕ رێچکە نابەستن بۆ گوند و پێشوازیکردن لە بێریەکان، بەمەش چیتر هەموو پیاو و ئافرەتێکی گوند لە قۆناغێکی تەمەنیدا نابێت بە شوان یان بێری.
ئەمڕۆ دەسەڵات لە گونددا بە شێوەیەکی جیاواز لە گوندەکانی جاران یاخود ئۆردووگا زۆرەملێکاندا دەردەکەوێت. لە دوای ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان زۆر کەم لە ئاغاکان یاخود دەوڵەمەندەکان گەڕاونەتەوە، بەڵکو لە شارەکاندا نیشتەجێ بوون. ئەو ئاغایانەی کە گەڕاونەتەوەش وەك جاران دەسەڵاتیان بەسەر تاکەکاندا ناشکێت، تەنانەت ئەگەر ئەو ئاغایە دەسەڵاتێکی حزبی یان عەسکەری لە یەکێك لە حزبە دەسەڵاتدارەکانیشدا هەبێت. ئاغاکان ئەمڕۆش بە شێوەی جاران لە خەمی کۆکردنەوەی پارە و پول دان و هەموو هەوڵێکیان رووەو ئەوەیە لە دەسەڵاتیان زیاد بکەن، بەڵام میکانیزمی گەیشتن بەو مەبەستە گۆڕاوە، بە شێوازی کاری جاران ئەوان هەرگیز بەو مەبەستەیان ناگەن، چونکە چەوساندنەوەی جووتیارێك یان دەستگرتن بەسەر زەوی و زاری لادێنشینەکاندا هەم ئاسان نییە و هەمیش بۆ ئەو وەك جاران سوودی نییە، بۆیە ئەوان کەمتر پەنا دەبەنە بەر کاری وا و خەریکی کاری دیکەن، لە هەموو کارێکیش زێتر رەنگە بەڵێندەرایەتیان هەلبژارد بێت.
ئینتیمای حزبیش هەندیك جێ پێی ئینتیمای خێڵەکی لەق کردووە. وێڕای ئەوەی کە هەر خێڵێکی کوردی زێتر خۆی داوەتە پاڵ

حزبێك، بەڵام دەگمەنن ئەو خێڵانەی بەگشتی خۆیان دابێتە پاڵ یەکێك لە حزبەکان. هەندێك لە ئەندامەکانی خێڵێك کەوتوونەتە جەمسەری دژی خێڵەکەیان بەوەی کە ئینتیمایان بۆ حزبێکی جیا لەو حزبە هەیانە کە خێڵەکە خۆی داوەتە پاڵ، بەو پێیەی کە حزبەکانمان زێتر وەك دژ نەك وەك هاوکار و هاوخەبات مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن.

ئەوەی زۆر گۆڕاوە پەیوەندی نێوان شار و لادێیە. لە بەشی دووەمی ئەم تۆژینەوەیەدا ئاماژەمان بەوە کردووە کە لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی رابردوو یاخود پێشتر زۆربەی گوندەکانی کوردستان کیفایەتێکی زاتی ( خودکەفایی ) یان هەبوو. واتە زۆربەی ئەو شتانەیان بەرهەمدەهێنا کە پێویستیە سەرەکیەکانی ژیانیان بوون. هەر بۆیە لادێنشینەکان ناچار نەبوون بۆ دابین کردنی پێداویستیە رۆژانەییەکانیان سەردانی شار بکەن، چونکە تەنانەت جلوبەرگ و پێڵاویشیان هەر لە گوند بەرهەم دەهێنا. لادێنشینان وێڕای کشتوکاڵ و مەڕداری خۆیان بە پیشەگەلێکی دیکەوە خەریك دەکرد، ئەو پیشانەش بەرهەمیان لێ دەکەوتەوە و بۆ فرۆشتنی ئەو کەلوپەلە بەرهەم هاتووانەش سەردانی شاریان دەکرد. ئەوەی زۆر پێویستیان پێ بوو و لە گوند دەستیان نەدەکەوت کەلوپەلێکی کەمی وەك شەکر، چا ... هتد بوون. واتە شار بەوەی زێتر بەکاربەری کەلوپەلە بەرهەم هاتووەکانی لادێنشینان بوو نەك دابین کەری زۆربەی پێویستیەکانی لادێ، لە توانایدا نەبوو گوندەکان بکات بە پاشکۆی خۆی و فەرمانڕەواییان بەسەردا بکات. *هەر لەگەڵ دروست بوونی گوندە شەترەنجیەکان و دواتریش گوندی نوێ، پەیوەندیەکە گۆڕا و گوند بوو بە پاشکۆی شار و شار وەك ئیمپراتۆریەت هەڵسوکەوت لەگەڵ لادێکانی دەوروبەری دەکات، چونکە ئەمڕۆ نەك گوندەکان خودکەفا

---

* دەربارەی پەیوەندیی نێوان شار و لادێ، بگەڕێوە بۆ: فرنان برودل، هەمان سەرچاوە، ل ٤٩٧ ـ ٥٠١.

نین و بەژداری لە گەشەسەندنی شارەکاندا ناکەن، بەڵکو بە هیچ شێوەیەك توانای دابین کردنی پێداویستیە رۆژانەییەکانیشیان نەماوە. بۆ هەموو پێویستیەك و بۆ زۆربەی کارەکان ناچارن روو لە شار بکەن، بەمەش دەسەڵاتی شار بەسەر لادێدا دەشکێ و پەیوەندی نێوانیان تا رادەیەکی زۆر پێچەوانە بۆتەوە.

بە هۆی مانەوەی لادێنشینان بۆ ماوەیەکی تارادەیەك درێژ لە ئۆردووگاکان، تێکەڵاوبوونیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی دیکە، زۆری ئامرازەکانی پەیوەندی، بەربڵاوی هۆیەکانی گواستنەوە و گەیاندن، هاتنی ئامێری تەکنەلۆژی نوێ بۆ ناو ژیانیان ... کاریگەریەکی زۆریان لەسەر ژیانی لادێنشینەکان هەبوو و ئاکامەکانی ئەو کاریگەریەش لە جۆری جلوبەرگی بۆ نموونە منداڵ و گەنجەکان، شێوازی هەڵسوکەوت و رەفتار، جۆری خواردنەکان، پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، دابونەریت و بەهاکاندا دەردەکەوێت.

لە ئەنجامی هەموو ئەوەی لە سەرەوە باسکرا، ئێمە تاکێکی لادێیی جیاوازمان هەیە لە تاکەکەسە لادێنشینەکانی پێش دوو سێ دەیە، تاکەکەسی لادێیی چیتر وەك جاران مرۆڤێکی دەست و پێ سپی و خاوەن کەسایەتیەکی سادە و ساکار نییە. چیتر ناکرێ وەك کەسانێکی بێ ئاگا و ناهوشیاری دوور لە شارستانییەت و ژیانی نوێ لێی بڕوانین. هێشتا جیاوازی هەیە لە نێوان کەسایەتی شارنشین و لادێنشیندا، لە نێوان قەرەباڵغی شار و هێمنی لادێ، لە نێوان وردە کولتوورە جیا جیاکانی شار و وردە کولتووری لادێدا، بەڵام هەموو ئەم جیاوازیانەی لە نێوان شار و لادێی کوردیدا هەن لەمڕۆی کۆمەڵگای کوردی لە کوردستانی خوارووداد، جیاوازی نێوان لادێنشینێك و شارنشینێك زۆر کەمترە لە جیاوازی نێوان لادێنشینێك و شارنشینێکی پێش سێ دەیە. ئەم دوو گروپە بە هۆی کۆمەڵێك فاکتەری جۆراوجۆر جاران زۆر لێکجیاوازتر بوون وەك لە ئێستا.

# بەشی شەشەم

# خستنەڕوو و ڕاڤەی خەسڵەتە گشتیەکانی تۆژینەوە

## باسی یەکەم: خستنەڕووی خەسڵەتە گشتیەکانی نموونەکە

لەم باسەدا هەندێك لە خەسڵەتە گشتیەکانی نموونەی تۆژینەوەکە دەخرێنەڕوو، بەو مەبەستەی باشتر ڕوونببێتەوە نموونەی تۆژینەوەکە هەڵگری چ خەسڵەتگەلێکە و تایبەتمەندیەکانی چین، چونکە ئێمە لەو بڕوایەداین دەستنیشانکردنی خەسڵەتە گشتیەکان یارمەتیمان دەدات لە ناسینی هەلومەرجە جیاوازەکانی نموونەکە و دەردەکەوێت نموونەکە چەندە گوزارشت لە کۆمەڵگای تۆژینەوە دەکات. لە هەر لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەلایەتیدا لێکۆڵەر هەوڵدەدات ئەو خەسڵەتە گشتیانە بخاتەڕوو کە بە پێویستیان دەزانێت بۆ ناسین و زانینی هەلومەرجی نموونەکەی، نەك هەموو خەسڵەتێکی گشتی.

ئێمەش لەم تۆژینەوەیەدا ئەو خەسڵەتانەمان بەرچاو خستوون کە بە پێویستمان زانیون، ئەوانیش بریتین لە: ڕەگەز، تەمەن، ئاستی خوێندن، باری ئابووری، باری کۆمەلایەتی، ساڵی ڕاگواستن، شوێنی نیشتەجێبوون، جۆری پیشەی نموونەکە پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن.

### ١- پێکهاتەی ڕەگەز

پێکهاتەی ڕەگەز یەکێکە لەو خەسڵەتە گشتیانەی تۆژەران جەختی

لەسەر دەکەنەوە. مەبەست لە پێکهاتەی رەگەز لەم خشتەیەدا دابەشکردنی نموونەی تۆژینەوەکەیە بۆ دوو رەگەزی نێر و مێ.

لە خشتەی ژمارە (١٠) دا، کە تایبەتە بە رەگەزی نموونەکە دەردەکەوێت کەوا ٢١٣ کەس لە کۆی ٣٠٠ کەس بە رێژەی ٧١٪ لە رەگەزی نێرن و ٨٧ کەسیش بە رێژەی ٢٩٪ لە رەگەزی مێن. هەروەك دیارە جیاوازیەکی بەرچاو لەنێوان رێژەی دوو رەگەزەکەدا هەیە، دەکرێ ئەمەش لە روانگەیەکەوە بە کەموکوورییەکی باسەکە لەقەڵەم بدرێت. ئەو کۆمەڵناسانەی لە راڤەکانیاندا پشت بە تیۆری کۆمەڵناسیی فیمینیستی دەبەستن، کۆمەڵناسی بەوە تاوانبار دەکەن کە زانستی رەگەزی نێرە و هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا بایەخ بە حەز و ویست و کێشەکانی ئەو رەگەزە دەدات.[1] بێگومان دەکرێ گومانیان لە هەموو ئەنجامەکانی ئەم باسەش هەبێت ئەگەر لەو گۆشەنیگایەوە لێی بڕوانن. هەرچەند دەمانویست رێژەکان لە یەکترەوە نزیك بوونایە و هەوڵیشمان لەو بارەوە دەدا، بەڵام لە کۆمەڵگایەکی نەریتخوازدا بە زەحمەت دەکرێ ئەو هاوسەنگیە رابگیرێت.

**خشتەی ژمارە (١٠) رەگەزی نموونەی تۆژینەوەکە**

| رەگەز | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نێر | 213 | 71.00% |
| مێ | 87 | 29.00% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

١ لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: پاملا ابوت و کلر والاس، جامعەشناسی زنان، منیژە نجم عراقی، نشر نی، تهران، ١٣٨٠، ص ٢٣ـ٢٤.

### ٢ـ پێکهاتەی تەمەن

لــە خشــتەی ژمــارە (١١)دا کــە تایبەتــە بــە تەمــەنی نموونــەی تۆژینەوەکە دەردەکەوێت کەوا یەکەم ڕێژەی نموونەکــەمان کــە دەکاتــە ٢٥,٦٧٪تەمەنیان دەکەوێتە نێوان ٣٠ـ٤٠ ساڵی. دووەم ڕێــژەش کــە دیســان ڕێژەیــەکی نزیکــە لــە ڕێــژەی یەکــەم و دەکاتــــە ٢٤,٦٧٪ تەمەنیان دەکەوێتە نێوان ٤١ـ٥١ ساڵی. ڕێژەی سێیەمیش ڕێژەیــەکی بــەرزی نموونەکــەمان پێکدێنێــت و دەکاتــە ١٨,٣٣٪، ئەمانــەش تەمەنیان لە نێوان ٥٢ـ٦٢ ساڵیدایە. ئەوانەش کە تەمەنیان لــەنێوان ١٩ـ٢٩ ساڵیدایە ڕێژەیەکی کــەمتر لــە ڕێــژەی ســەرەوە پێکدێنــن، و دەکاتە ١٦,٦٧٪. ئەوانەش کە تەمەنیان لە نێوان ٦٣ـ٧٣ ســاڵیدایە ڕێژەکەیان دەکاتە ٩,٦٧٪ و دوا ڕێژەش کە کەمترین ڕێژەیــە و دەکاتــە ٥٪ نموونەکــە ئەوانــەن کــە تەمــەنیان لــەنێوان ٧٤ـ٨٤ ســاڵیدایە. هەڵبەت ئەم ڕێژەیەی کۆتایی کە ڕێژەیەکی کەمــە بەبــەراورد لەگــەڵ ڕێژەکانی دیکە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك کــە زیــاتریش پەیوەندیان بەباری تەندروستی تاکــەکانی کۆمــەڵگاوە هەیــە. ڕێــژەی بەتەمەنەکان لە ڕێژەی گەنج و منداڵەکان کەمترە و نێونجی تەمــەنیش لە کۆمەڵگاکانی وەك کۆمەڵگای ئێمە کە کاری قورس و ژینگەیەکی سەختیان هەیە و کەمتریش تاکــەکان بایــەخ بــە تەندروســتی خۆیــان دەدەن نزمترە وەك ئەوەی لە ڕۆژئاوا هەیە. ڕەنگە لــێرەدا ئــەو پرســیارە دروست ببێت کە ڕێژەی ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان ١٩ـ٢٩ ســاڵیدایە ڕێژەیــەکی بــەرزە و باشــتر وابــوو کەســانێکی بەتەمــەنتر وەك نموونــە وەرگرین کە ئەزموونێکی ژیانی زیاتریــان لــە ژینگــەی کــۆن (لادێ) هەبوو. ئــەوەی دەکــرێ لــە وەڵامــی ئــەوەدا بڵێــین ئەوەیــە کــە ئێمــە هەوڵمانداوە نموونەکەمان لەکاتی ڕاگواستنندا بەلای کەمەوە تەمــەنی لــە دە ســاڵان کــەمتر نــەبێت و ١٩ ســاڵیش کــە نزمــترین تەمــەنی

نموونەکەمانە بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە راگواستن تا دوا رۆژەکانی رژێمی بەعس بەردەوام بووە، ١٩ ساڵی تەمەنێکی لەبارە بۆ نموونەی تۆژینەوەکەمان. هەروەها بە بەکارهێنانی پێوەری "نێونجی تەمەن" (متوسط العمر) دەرکەوت کەوا ناوەندی تەمەنی نموونەکەمان دەکاتە ٤٢,٢ ساڵ.

**خشتەی ژمارە (١١) تەمەنی نموونەی تۆژینەوە**

| تەمەن | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| 19-29 | 50 | 16.67% |
| 30-40 | 77 | 25.67% |
| 41-51 | 74 | 24.67% |
| 52-62 | 55 | 18.33% |
| 63-73 | 29 | 9.67% |
| 74-84 | 15 | 5.00% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

## ٣- ئاستی خوێندن

مەبەست لە ئاستی خوێندن دابەشکردنی نموونەی تۆژینەوەکەیە بەپێی قۆناغەکانی خوێندن، وەك نەخوێندەوار، خوێندەوار، قۆناغی

سەرەتایی، قۆناغی ناوەندی... هتد.

لە داتاکانی ناو خشتەی ژمارە (١٢)دا کە تایبەتن بە ئاستی خوێندنی نموونەی تۆژینەوەکەمان دەردەکەوێت کەوا نەخوێندەوارەکان زۆرترین ڕێژەی نموونەکەمان پێکدێنن کە دەکاتە ٣٦,٣٣٪، ئەمەش ئەگەرچی وەك باسمان کرد یەکێك بوو لە گرفتەکانی پڕکردنەوەی پرسیارنامەکە، بەڵام ئەوەمان لەبەرچاوە کە ڕێژەی نەخوێندەواران لە کوردستانی باشووردا ڕێژەیەکی بەرزە بەتایبەتیش لەنێو بەتەمەنەکاندا، چونکە لە سەردەمی منداڵی یاخود گەنجێتی ئەواندا کە ماوەی خوێندن و فێربوونیان بوو ڕێژەی قوتابخانەکان زۆر کەم بوو و حکومەت کەمتر بایەخی بەم بوارە دا و وێڕای کەمتر بە پێویست زانینی خوێندەواری.

ئەوانەش کە تەنیا دەزانن بخوێننەوە و بنووسن و پلەیەك لە سەرووی نەخوێندەوارەکانەوەن ڕێژەکەیان بەرزە و دەکاتە ١٢,٦٧٪، دوو ڕێژەکەی سەرەوە نزیکەی نیوەی نموونەی باسەکەمان پێکدێنن. ئەوانەش کە سەرەتاییان تەواو کردووە ڕێژەکەیان بەرزە و دەکاتە ١٥٪ نموونەکەمان. لە قۆناغی سەرەتایی بە سەرەوە ڕێژەکان کەم دەبنەوە و ئەمەش بارێکی ئاساییە لە وڵاتێکدا کە دەرفەتەکانی خوێندن زۆر نین و جارانیش زۆر کەمتر بوونە لە ئێستا. ئەوانەی قۆناغی ناوەندیان تەواو کردووە ١٢٪ نموونەی باسەکەمان پێکدێنن. هەڵگرانی بڕوانامەی پەیمانگاش ١١,٣٣٪ نموونەکەمانن و ئەوانەی لە کۆلێژیش دەخوێنن یاخود بەکالۆریۆسیان هەیە ١٢,٣٣٪ نموونەکەن و تەنیا دوو کەسیش بە ڕێژەی٠,٦٧٪ نموونەی باسەکە خوێندنی باڵا (ماستەر، دکتۆرا)یان تەواو کردووە.

خشتەی ژمارە (١٢) ئاستی خوێندنی نموونەی تۆژینەوەکە

| ڕێژەی سەدی | ژمارە | ئاستی خوێندن |
|---|---|---|
| 35.33% | 106 | نەخوێندەوار |
| 12.67% | 38 | خوێندنەوە و نووسین |
| 15.00% | 45 | سەرەتایی |
| 12.00% | 36 | دواناوەندی |
| 11.33% | 34 | پەیمانگا |
| 12.33% | 37 | کۆلێژ |
| 0.67% | 2 | خوێندنی باڵا |
| 0.67% | 2 | بێ وەڵام |
| 100.00% | 300 | کۆی گشتی |

### ٤ـ باری ئابووری

ئێمە پێوەرێکی چەندێتیمان نییە بۆ ئەوەی بزانین کێ باری ئابووری باشە و کێ باری ئابووری خراپ. هەروەها ئابووریناسانیش نەیانتوانیوە وەك ئەوەی لە زۆر لە وڵاتی دیکەدا هەیە هێڵێ هەژاریمان بۆ دیار بکەن کە هەر کەسێك سامانەکەی لە خوار ئەو هێڵەوە بوو بە هەژاری ناوبنێین. بۆیە ئێمە وەك زۆربەی تۆژەرەکانی دیکە ئەو بوارە بۆ نموونەکان خۆیان دەهێڵینەوە پێمان بڵێن باری ئابووریان چۆنە؟ هەڵبەت ئەمەش مەسەلەیەکی زۆر زاتیە و پەیوەندی بە خودی کەسەکەوە هەیە، دەشێ دوو کەس سامانێکی وەك یەکیان هەبێت، بەڵام لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا تەواو پێچەوانەی یەکتر بیر بکەنەوە.

خشتەی ژمارە (١٣) باری ئابووریی نموونەکە

| ڕێژەی سەدی | ژمـارە | *باری ئـابـووری* |
|---|---|---|
| 16.00% | 48 | بـاش |
| 64.00% | 193 | مـامنـاوەنـدی |
| 19.00% | 58 | خـراپ |
| 100.00% | 300 | *کـۆی گشـتـی* |

زۆرترین ڕێژەی نموونەکەمان پێیان وایە باری ئابوورییان مامناوەندیە، ڕێژەیان دەکاتە ٦٤,٦٧٪. دووەم ڕێژەش کە دەکاتە ١٩,٣٣٪ی نموونەکە پێیان وایە باری ئابووریان خراپە. کەمترین ڕێژەش کە دەکاتە ١٦٪ نموونەکە، ئەوانەن کە پێیان وایە باری ئابووریان باشە.

### ٥- باری کۆمەڵایەتی

خشتەی ژمارە (١٤) باری کۆمەڵایەتیی نموونەی باسەکەمان دەخاتە ڕوو. وەکو هەمیشە خێزاندارەکان زۆرترین ڕێژەی نموونەی باسەکە پێکدێنن، ڕێژەیان لە باسەکەماندا دەکاتە ٦٧,٦٧٪، ئەمەش ڕێژەیەکی نەك تەنیا چاوەڕوانکراو بەڵکو کەمیشە بۆ کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای کوردی کە هێشتا هاوسەرگیری و تاکی بەهاوسەربوو مامەڵەیەکی تایبەتیتری لەگەڵدا دەکرێت و کۆمەڵگا بە چاوێکی تر

لێی دەروانێت. نزمترین تەمەنی نموونەکەمان ١٩ ساڵانە کە لە کۆمەڵگا لادێییەکاندا تەمەنێکی لەبارە بۆ هاوسەرگیری، بەڵام ئەگەر وا گریمان بکەین کە هەموو ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان ١٩ـ٢٩ ساڵیدایە نەبۆنەتە هاوسەر ئەوا هێشتا رێژەی ئەوانەی بە سەڵتی ماون کەم نییە (بگەڕێوە بۆ خشتەی ژمارە ـ ١١ ـ ). واتە پێویستە کەسانێکی دیکە کە تەمەنیان لە سەرووی ٣٠ ساڵیەوەیە سەڵت بن.

خشتەی ژمارە (١٤) باری کۆمەڵایەتی نموونەکە

| باری کۆمەڵایەتی | ژمارە | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| سەڵت | 71 | 24% |
| خێزاندار | 203 | 67.67% |
| تاکمردوو | 22 | 7.33% |
| تەڵاقدراو | 3 | 1.00% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

سەڵتەکان لە باسەکەماندا رێژەیان دەگاتە ٢٤٪، ئەوانەش کە تاکمردوون رێژەیان ٧,٣٣٪ یە، دەشێ ژمارەیەکیان ئەو ئافرەتانە بن کە پیاوەکانیان ئەنفالکراون، چونکە ئەوان مەگەر بەدەگمەن دەنا هەر بە تەنیا و بێ هاوسەر دەژین. ئەوانەش کە جیابوونەتەوە (تەڵاقدراوەکان) تەنیا ١٪ نموونەی باسەکە پێکدێنن.

**٦ـ ساڵی راگواستن**

خشتەی ژمارە (٦) ساڵی راگواستنی نموونەی باسەکەمان روون دەکاتەوە. ئێمە ساڵی راگواستنی نموونەکەمان بۆ ٣ گروپ دابەش

کردووە (هەروەك لە خشتەی ژمارە ـ١٥ـ دیارە).

زۆرترین ڕێژەی نموونەکەمان لەنێو ئەوانەدان کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠ـ١٩٩٠ ڕاگوێزراون کە دەکاتە ٥٧٪. هەروەها ڕاگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦٩ـ١٩٧٩ دووەم ڕێژەی بەرزی نموونەکەمان پێکدێنن کە دەکاتە ٣٩٪. بەڵام ڕاگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ١٩٩١ـ٢٠٠١ ڕێژەیان بەبەراورد لەگەڵ ڕاگوێزراوەکانی دوو گروپەکەی پێشوو زۆر کەمە و تەنیا ٤٪ نموونەکە پێکدێنن. ئەمەش لەبەر ئەوەی لەم ماوەیەدا خەڵکێکی زۆر کەم ڕاگوێزراون.

خشتەی ژمارە (١٥) ساڵی ڕاگواستنی نموونەکە

| ڕێژەی سەدی | ژمارە | ساڵی ڕاگواستن |
|---|---|---|
| 39.00% | 117 | 1969- 1979 |
| 57.00% | 171 | 1980-1990 |
| 4.00% | 12 | 1991-2001 |
| 100.00% | 300 | کۆی گشتی |

### ٧ـ شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی تۆژینەوە بە پێی پارێزگا

خشتەی ژمارە (١٦) نموونەکەمان بەپێی پارێزگاکان دیار دەکات. لەبەرئەوەی ئێمە هیچ ئامارێکمان نەبوو پیشانبدات کە هەر پارێزگایەك چەند کەس ڕاگوێزراون، ناچار بەمەزندەی خۆمان ڕێژەکانمان بەسەر پارێزگاکاندا دابەش کردن، کە دواجار بەم شێوەیە

نموونەکەمان لە هەر پارێزگایەك وەرگرت: کەرکوك ـ دیالا ٨٧ کەس بە ڕێژەی ٢٩٪، دوو پارێزگای هەولێر و سلێمانی بە ڕێژەی یەکسان، واتە ٢٤,٦٧٪ و دوا ڕێژەش ڕاگوێزراوەکانی دوو پارێزگای دهۆك ـ مووسڵ بە ڕێژەی ٢١,٣٣٪.

((کەرکوك ـ دیالا)) و ((دهۆك ـ مووسڵ)) مان پێکەوە وەرگرت، یەکەم لەبەر ئەوەی سنووری ئیداریی پارێزگای کەرکوك و دیالا بەردەوام گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و لێکجیاکردنەوەیان قورستر بوو، دووەمیش چونکە ڕێژەی ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای مووسڵ ڕێژەیەکی نزمە و ڕووبەری پارێزگای دهۆکیش بچووکترە لە پارێزگاکانی دیکە بەباشمان زانی پێکەوە وەریانگرین.

خشتەی ژمارە (١٦) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی تۆژینەوە

| پارێزگا | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| کەرکوك ـ دیالا | 87 | 29.00% |
| هەولێر | 74 | 24.67% |
| سلێمانی | 74 | 24.67% |
| دهۆك ـ مووسڵ | 65 | 21.67% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

## ٨ـ جۆری پیشەی نموونەکە لە پێش ڕاگواستن

خشتەی ژمارە (١٧) تایبەتە بە پیشەی نموونەی باسەکە لە پێش ڕاگواستن. ئەوانەی خۆیان بە بێکار لەقەڵەم داوە ڕێژەیەکی بەرچاون

که دەکاتە ٨,٦٧٪. ئەوانەش کە کاسبکارن واتە بۆ خۆیان کاسبی دەکەن (بارهەڵگری، دوکانداری، کرێکاری...) ٨,٣٣٪ی نموونەکەمان پێکدێنن. ڕێژەی کابان و ئەو ئافرەتانەی کاری ماڵەوە دەکەن دەکاتە ١٨٪نموونەکە. هەروەك دیارە ڕێژەی ڕەگەزی مێ لە باسەکەماندا زۆر لەوە زۆرترە، بەڵام دیارە هەندێکیان کاری دیکەیان کردووە، واتە ٣\١١ی ڕەگەزی مێ پێش ڕاگواستن کاری دەرەوەیان کردووە.

ڕێژەی قوتابیانیش لە نموونەکەدا ڕێژەیەکی بەرزە و دەکاتە ١٦٪ نموونەکە، بەڵام بەرزترین ڕێژەی نموونەکەمان لە پێش ڕاگواستن جووتیارەکان پێکی دێنن کە دەکاتە ٢٤,٦٧٪ و ئەگەر ئەوانەی پیشەیان ئاژەڵداری بووە یاخود ئاژەڵداری و داچاندنی زەوی کە یەکەمیان ٣,٦٧٪ و دووەمیان ٨٪ نموونەکە پێکدێنن بۆ ڕێژەی سەرەوە (جوتیاری) زیاد بکەین نزیکەی ٣\١١ نموونەکەمان پێش ڕاگواستن خەریکی کاری ئاژەڵداری و داچاندنی زەوی بووین. چەکدارەکانیش ٤٪ نموونەکەمان پێکدێنن، ڕێژەی پیشەکارەکانیش (تەنەکەچی، جۆلا، دارتاش...) هەمان ڕێژەی چەکدارەکانە (٣,٦). دوا کۆمەڵەش فەرمانبەرەکانن کە ڕێژەیان دەکاتە ٥٪نموونەکە.

خشتەی ژمارە (١٧) جۆری پیشەی نموونەکە لە پێش ڕاگواستن

| ڕێژەی سەدی | ژمارە | پیشەی نموونەکە لە پێش ڕاگواستن |
|---|---|---|
| 8.67% | 26 | بێکار |
| 8.33% | 25 | کاسبکار |
| 18% | 54 | کابان و کاری ماڵەوە |

| خوێندکار | 48 | 16% |
|---|---|---|
| جوتیار | 74 | 24.67% |
| پێشمەرگە* | 13 | 4.33% |
| فەرمانبەر | 14 | 4.67% |
| ئاژەڵدار | 11 | 3.67% |
| پیشەکار | 11 | 3.67% |
| ئاژەڵداری و داچاندنی زەوی | 24 | 8.00% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

### ٩- جۆری پیشەی نموونەکە لەدوای ڕاگواستن

خشتەی ژمارە (١٨) پیشەی ڕاگوێزراوەکان (نموونەی باسەکە) لەدوای ڕاگواستن ڕووندەکاتەوە. بەبەراوردکردنی ئەم خشتەیە لەگەڵ خشتەی پێشوو دەردەکەوێت کەوا هەندێك لە پیشەکان گۆڕانێکی گەورەیان بەسەردا هاتووە و هەندێکیشیان کەمتر گۆڕاون. بۆ نموونە کاری ئاژەڵداری و داچاندنی زەوی کە لە خشتەی پێشوودا بەرزترین ڕێژەی هەبوو، لەم خشتەیەدا کەمترین ڕێژەیە (٥,٣٣٪). هەروەها

---

* لە ڕاستیدا پێشمەرگایەتی پیشە نییە، بەتایبەتی پێش ڕاپەڕینی ١٩٩١، بەڵام لەبەرئەوەی هەندێك لە نموونەکانی تۆژینەوەکەمان لە جیاتی پیشەکانی دیکە پێشمەرگایەتیان نووسیبوو، ئێمەش هەر وەك خۆی نووسیمانەوە نەك لەبەر ئەوەی پێشمەرگایەتی بە پیشە لە قەڵەم دەدەین.

ڕێژەی فەرمانبەران لە بەرامبەردا بەرزبۆتەوە لەدوای ڕاگواستن کە دەکاتە ١٩,٦٧٪ نموونەکە. ڕێژەی کاسبکارانیش لەدوای ڕاگواستن ڕێژەیەکی بەرزە و دەکاتە ١٨,٣٣٪ واتە دوو هێندەی پێش ڕاگواستن .
پیشەکارەکانیش لەدوای ڕاگواستن ڕێژەیان زۆر بەرز بۆتەوە( پێش ڕاگواستن ڕێژەیان تەنیا ٣,٦٧٪ بوو، دوای ڕاگواستن بوو بە ١٠,٣٣٪). ڕێژەی قوتابیان لەدوای ڕاگواستن دەکاتە ١٣٪ نموونەکە کە هەندێك نزیکە لە ڕێژەکەیان لە پێش ڕاگواستن. هەروەها ڕێژەی بێکارەکان و ئەو ئافرەتانەی کاری ماڵەوە دەکەن و لەگەڵ چەکدارەکان ڕێژەی زۆر نزیکن لە ڕێژەی هەمان ئەو گروپانە پێش ڕاگواستن . بەتایبەتیش ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی کاری ماڵەوە دەکەن ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئافرەتی ڕاگوێزراو کەمتر توانیویەتی کاری دەرەوە بکات، بەڵکو زیاتر کاری ماڵەوە دەکەن.

خشتەی ژمارە (١٨) جۆری پیشەی نموونەکە لەدوای ڕاگواستن

| پیشەی نموونەکە لەدوای ڕاگواستن | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| بێکار | 30 | 10.00% |
| کاسبکار | 50 | 16.67% |
| کابان و کاری ماڵەوە | 55 | 18.33% |
| جوتیار | 16 | 5.33% |
| خوێندکار | 39 | 13.00% |

| پێشمەرگە | 21 | 6.67% |
|---|---|---|
| فەرمانبەر | 59 | 19.67% |
| پیشەکار | 31 | 10.33% |
| کۆی گشتی | 300 | 100.00% |

لە میانەی ئەو داتایانەی لەم باسەدا خرانە ڕوو، دەردەکەوێت ڕێژەی ڕەگەزی نێر زۆر زێترە لە ڕێژەی ڕەگەزی مێ، واتە ٧١٪ بەرامبەر ٢٩٪. هەروەها بچووکترین تەمەنی نموونەکە ١٩ ساڵە و بەرزترینی ٨٤ ساڵ، ناوەندی تەمەنیش ٤٢،٢ ساڵ. نەخوێندەوارەکانیش ڕێژەیەکی بەرز (٣٥,٣٣٪) نموونەکە پێکدەهێنن. ڕێژەی ئەوانەش کە باری ئابووریان مامناوەندیە دەکاتە ٦٤٪ و زۆرینەی نموونەکە لەمانەن. سەبارەت بە باری کۆمەڵایەتیش، خێزاندارەکان زۆرینەی نموونەکە پێکدێنن بە ڕێژەی ٦٧,٦٧٪. زۆرترین ڕێژەی نموونەکەش کە دەکاتە ٥٧٪ لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٠ـ١٩٩١ ڕاگوێزراون، بەڵام لەمەڕ پیشە لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن هەست بە گۆڕانێکی بەرچاو دەکرێت، بۆنموونە ئەوانەی پێش ڕاگواستن خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون زێتر لە ٣٦٪ نموونەکە بوون کەچی دوای ڕاگواستن تەنیا ڕێژەیان ٣٣,٥٪. هەروەها ڕێژەی پیشەکار و کاسب و فەرمانبەرەکان لەدوای ڕاگواستن گەلێ زیادیان کردووە.

## باسی دووەم: خستنە ڕوو و ڕاڤەی زانیاریە تایبەتیەکانی نموونەی تۆژینەوە

لەم باسەدا کە تایبەتە بە ڕاڤەکردنی خەسڵەتە تایبەتیەکانی

نموونەی تۆژینەوە، هەوڵدەدرێت لە هەر خشتەیەکدا پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو روونبکرێتەوە. بەو مەبەستەی زێتر دەرکەوێت راگواستنی کوردان چ ئاکامێکی کۆمەڵایەتی لیّ کەوتووتەوە.

لە خشتەکاندا دەردەکەوێت کەوا گەلیّ پشتمان بە سیّ گۆڕاوی ساڵی راگواستن، رەگەز و شوێنی نیشتەجێبوون (پێش راگواستن) بەستووە. ئەم سیّ گۆڕاوە لە زۆر لە خشتەکاندا و لەگەڵ زۆر لە گۆڕاوەکانی دیکە کۆکراونەتەوە. دەکریّ هۆیەکەش لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە.

١ـ رەگەز گۆڕاوێکی گرنگە. بۆچوونی دوو رەگەزەکە لەمەڕ زۆر بابەت و هەلوێست جیاوازە. زێتریش بۆ زانینی ئەم جیاوازییە لەنێوان بۆچوونی پیاو و ئافرەتی کورددا ئەم گۆڕاوە لەگەڵ یەکێك لە گۆڕاوەکانی دیکە لە زۆر خشتەدا کۆکراوەتەوە.

٢ـ راگوێزراوەکان بەو پێیەی هەر گروپێکیان لە ساڵێکدا یاخود ماوەیەکی زەمەنیدا راگوێزراون، میکانیزمی راگواستن و ئەو شوێنەی بۆی رادەگوێزران بەردەوام گۆڕانیان تێدەکەوت، ئەوا هەلومەرجی راگوێزراوەکانیش بەپێی ساڵەکانی راگواستن جیاواز بوو. بۆ زانینی جیاوازی بۆچوونی راگوێزراوەکانی هەر ماوەیەکی زەمەنی لە بۆچوونی راگوێزراوەکانی ماوەکانی دیکە، گۆڕاوی ساڵی راگواستن لەگەڵ گۆڕاوی دیکە لە هەندیّ خشتەدا کۆکراوەتەوە.

٣ـ بەو پێیەی پێش راگواستن ناوچەکانی کوردستان زێتر بەسەر خۆیاندا داخراو بوون و هەر ناوچەیەك تارادەیەك وردە کولتوورێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، ئەوا دانیشتووانی هەر ناوچەیەك روانینیان بۆ دیاردە و مەسەلە جیاوازەکان هەندیّ جیاواز بوو. بۆ زانینی ئەو جیاوازیە لە بیربۆچوونی دانیشتووانی ناوچە جیاوازەکان، گۆڕاوی شوێنی نیشتەجێبوون (پێش راگواستن) لەگەڵ هەندیّ لە گۆڕاوەکانی

دیکەدا بەکارهاتووە.

لەخوارەوە بەجیا و لە هەر خشتەیەکدا پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو روونده‌کرێتەوە:

## ١ـ گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ رادەی گۆڕانیان

خشتەی ژمارە (١٩) وەڵامی دوو پرسیاری تایبەت بە دابونەریتەکان دەداتەوە: پرسیاری یەکەم سەبارەت بە رێژەی گۆڕانی دابونەریتەکان، پرسیاری دوەمیش بۆچوونی نموونەی باسەکە سەبارەت بە باشی و خراپی ئەو گۆڕانە دەخاتەڕوو.

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا ١٥٣ کەس بە رێژەی ٥١٪ دەڵێن: زۆربەی دابونەریتەکانیان لە ئەنجامی راگواستندا گۆڕاون. ٧٣ کەسیش لە نموونەی باسەکە بە رێژەی ٢٤,٣٣٪ پێیان وایە ژمارەیەکی کەمی دابونەریتەکانیان گۆڕاون و زۆربەیان وەکو خۆیان ماونەتەوە. بەڵام ٤٠ کەسی دیکە بە رێژەی ١٣,٣٣٪ وای بۆ دەچن کە هەموو دابونەریتەکانیان کەم تا زۆر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و هیچ کامێکیان وەك خۆی نەماوەتەوە. ٣٤ کەسیش بە رێژەی ١١,٣٣٪ نموونەی باسەکە بە هیچ جۆرێك وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە، رەنگە هۆیەکەشی بۆ یەکێك لەم دوو بۆچوونە بگەڕێتەوە: یان پێیان وایە هیچ گۆڕانێك بەسەر دابونەریتەکانیاندا نەهاتووە کە ئەمەش لە راستیەوە دوورە، یان نەیانتوانیوە بێننە بەرچاوی خۆیان کە چ دابونەریتێکیان گۆڕاوە و کامەیان وەکو جاران ماوەتەوە هەر بۆیەشە بێ وەڵام لێی گەڕاون.

لە وەڵامی ئەوەی کە ئایا گۆڕانەکەیان پێ باشە یاخود پێ باش نییە، دەردەکەوێت زیاتر لەنیوەی نموونەی باسەکە رێژەی ٥٢٪ گۆڕانەکەیان پێ باشە و لەگەڵ گۆڕانەکەدان، بەڵام رێژەی ٣٠,٦٧٪ی

نموونەکە ئەو گۆڕانەیان پێ باش نییە و حەزیان لـەوە بـووە نـەگۆڕێن. ئەوانەی دەمێننەوە ڕێژەی ١٧,٣٣٪ نموونەی باسەکە پێکدەهێنن هیـچ وەڵامێکی ئەو پرسیارەیان نەداوەتەوە و ڕای خۆیان دەرنـەبڕیوە، دەکـرێ هەندێك لەمانە ئەوانەبن کە گۆڕانی هەندێك لە دابونەریتەکانیان پێ باش بێت و گۆڕانی هەندێکی دیکەیان پێ باش نەبێت، بەڵام چونکـە هیچ گۆڕاوێکمان بۆ ئەوە دانەنابوو، هیچ وەڵامێکیان نەداوەتەوە.

خشتەی ژمارە (١٩) گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ ڕادەی گۆڕانیان

| دابونەریتەکانتان گۆڕاون؟ / گۆڕانی دابونەریتەکانم | وەکو خۆیانن | هەموویان گۆڕاون | زۆربەیان گۆڕاون | کەمیان گۆڕاون | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| پـێ بـاشـە | 0<br>0.00% | 26<br>8.67% | 90<br>30.00% | 40<br>13.33% | 156<br>52.33% |
| پـێ بـاش نییە | 0<br>0.00% | 12<br>4.00% | 59<br>19.67% | 21<br>7.00% | 92<br>30.67% |
| بـێ وەڵام | 34<br>11.33% | 2<br>0.67% | 4<br>1.33% | 12<br>4.00% | 52<br>17.33% |
| **کـۆی گشـتی** | 34<br>11.33% | 40<br>13.33% | 153<br>51.00% | 73<br>24.33% | 300<br>100.00% |

## ٢- گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ تێکەڵاوی دانیشتووان

لە خشتەی ژمارە (٢٠)دا، وەڵامی دوو پرسـیار بـەرچاو دەکـەون، یەکەم، ئایا دوای ڕاگواستن دابونەریتەکان گۆڕاون. دووەم، ئایا خەڵکـە

راگوێزراوەکە لە دوای راگواستنیان زێتر تێکەڵاوی خەڵکی ناوچەکانی دیکە بوون و زیاتر شارەزای ناوچەکانی دیکە بوون.

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم، نموونەی تۆژینەوەکە بە رێژەی ٨٥,٣٣٪ بە بەڵێ وەڵامیان داوەتەوە و پێیان وایە لە ئەنجامی راگواستنندا دابونەریتەکانیان گۆڕاون. لە بەرامبەر ئەمانەشدا

ئەوانەی بە نەخێر وەڵامیان داوەتەوە و پێیان وایە دوای راگواستن دابونەریتەکانیان نەگۆڕاون رێژەکەیان تەنیا ١٣,٦٧٪ نموونەکە پێکدێنن، ئەمەش رێژەیەکی کەم نییە.

خشتەی ژمارە (٢٠) گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ تێکەڵاوی دانیشتووان

| دوای راگواستن زێتر لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی دی / دابونەریتەکانتان پێش راگواستن گۆڕاون | تێکەڵاو بوین | تێکەڵاو نەبوین | **کۆی گشتی** |
|---|---|---|---|
| بەڵێ | 245<br>81.67% | 11<br>3.67% | 256<br>85.33% |
| نەخێر | 28<br>9.33% | 13<br>4.33% | 41<br>13.67% |
| نازانم | 3<br>1.00% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% |
| **کۆی گشتی** | 276 | 24 | 300 |

سەبارەت بە پرسیاری دووەم، ئایا راگواستن هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی تێکەڵاویان لەگەڵ خەڵکی دیکە زێتر ببێت و شارەزای ناوچەی زێتر بن؟ رێژەی ٩٢٪ بە بەڵێ وەڵامیان داوەتەوە و تەنیا ٨٪ بە نەخێر

وەڵامیان داوەتەوە و پێیان وایە راگواستن هیچ کاریگەریەکی لەم بوارەدا نەبووە.

ئەوەی گرنگە رێژە زۆرەکەیە (٩٢٪)، ئەم رێژە بەرزە راگواستن بە هۆکاری تێکەڵاوی زێتر و شارەزایی زیاتر لەقەڵەم دەدەن و ئەم رێژەیە چونکە بەرزە ئەوا پێویستە بە هێند وەربگیرێت. هەر وەکو هەمووشمان ئاگادارین خەڵکی کوردستان تا کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردووش لەبەر چەند هۆکارێك تێکەڵاویەکی کەمیان لە نێواندا هەبوو، هەروەها خەڵکێکی کەم لە کوردستان سەفەریان دەکرد نەك تەنیا بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵکو بۆ ئەو شار و شارۆچکانەش کە نزیکیان بوون، بەڵام راگواستن واقعێك بوو هەموو راگوێزراوەکانی ناچار کرد تێکەڵاوی خەڵکی ناوچەکانی دیکە ببن و لە نزیکەوە بە خەڵکی ناوچەکانی دیکە ئاشنا بن.

## ٣- گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ ساڵی راگواستنی نموونەکە

داتاکانی خشتەی ژمارە (٢١) وەڵامی ئەو پرسیارەی دەڵێت ئایا لە دوای راگواستن دابونەریتەکانتان گۆڕاون، بەپێی ساڵەکانی راگواستنی راگوێزراوەکان، روونده‌کەنەوە.

بەگشتی ٢٥٦ کەس بە رێژەی ٨٥,٣٣٪ نموونەی باسەکەمان پێیان وایە لەدوای راگواستن دابونەریتەکانیان گۆڕاون. ئەوانەی پێیان وایە دابونەریتەکانیان نەگۆڕاون ١٣,٦٧٪ نموونەکە پێکدێنن، ئەمەش رێژەیەکی کەم نییە.

لە کۆی ئەوانەی پێشساڵی ١٩٧٦ راگوێزراون و رێژەیان ٨,٣٣٪ نموونەکەیە بە رێژەی ٦,٦٧٪ نموونەکە پێیان وایە دابونەریتەکانیان گۆڕاون. راگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٩ کە ٣٠,٦٧٪ ی نموونەکە پێکدەهێنن، رێژەی ٢٧,٣٣٪ پێیان وایە

دابونەریتەکانیان گۆڕاون. سەبارەت بە راگویزراوەکانی ماوەی نێوان سالانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ رێژەی ١٠,٦٧٪ لە کۆی ١٣,٦٧٪ هەمان رای دوو کۆمەڵەکەی دیکەیان هەیە. راگویزراوەکانی دوو سالی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ کە زۆرترین رێژەی نموونەکە پێکدێنن، زۆرترین رێژەشیان کە دەکاتە ٣٤٪ لە کۆی ٣٩,٦٧٪ دەڵێن لە ئەنجامی راگواستنەوە دابونەریتەکانیان گۆڕاون. لەبارەی راگویزراوەکانی دوو سالی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ کە رێژەیان ٣,٦٧٪ نموونەکەیە ٣٪ هەمان رای ئەوانەی پێش خۆیانیان هەیە. دوا کۆمەڵەش ئەو راگویزراوانەن کە لە ناوچە بەعەرەبکراوەکانەوە لە ماوەی نێوان ١٩٩١ـ٢٠٠١ راگویزراون و تەنیا ٤٪ نموونەکە پێکدێنن. ئەمانەش بە رێژەی ٣,٦٧٪ پێیان وایە دابونەریتەکانیان لەدوای راگواستن گۆڕاون.

خشتەی ژمارە (٢١) گۆڕانی دابونەریتەکان لەگەڵ سالی راگواستنی نموونەکە

| ئایا دابونەریتەکانتان گۆڕان / سالی راگواستن | بێ وەلام | بەلێ | نەخێر | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 1969-1976 | 0<br>0.00% | 20<br>6.67% | 5<br>1.67% | 25<br>8.33% |
| 1977-1979 | 0<br>0.00% | 82<br>27.33% | 10<br>3.33% | 92<br>30.67% |
| 1980-1986 | 1<br>0.33% | 32<br>10.67% | 8<br>2.67% | 41<br>13.67% |

| 1987-1988 | 2 0.67% | 102 34.00% | 15 5.00% | 119 39.67% |
|---|---|---|---|---|
| 1989-1990 | 0 0.00% | 9 3.00% | 2 0.67% | 11 3.67% |
| 1991-2001 | 0 0.00% | 11 3.67% | 1 0.33% | 12 4.00% |
| کۆی گشتی | 3 1.00% | 256 85.33% | 41 13.67% | 300 100.00% |

### ٤- گۆڕانی بیروبۆچوونی نموونەکە لەگەڵ ئاراستەی گۆڕانەکەدا

داتاکانی ناو خشتەی ژمارە(٢٢) رای نموونەکە پیشاندەدەن سەبارەت بەوەی ئایا دوای راگواستن کە تێکەڵاو بوون لەگەڵ خێڵ و عەشرەتەکانی دیکە، ئەو تەسەور و بۆچوونەی بۆ خێڵ و عەشرەتەکانی دیکە هەیانبوو گۆڕا یاخود وەکو خۆی مایەوە و ئەگەر گۆڕاوە باشتر بووە یان خراپتر؟

زۆربەی هەرە زۆری نموونەکە بە رێژەی ٨٩,٣٣٪ لەو بڕوایەدان کە ئەو تەسەور و وێنەیەی بۆ خێڵ و عەشرەتەکانی دیکە هەیانبوو، دوای ئەوەی راگوێزران و تێکەڵاوی خەڵکی ناوچەکانی دیکە بوون گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لە بەرانبەر ئەمەشدا رێژەیەکی کەم کە دەکاتە ١٠,٦٧٪ پێیان وایە تەسەور و بۆچوونیان لە سەر خێڵ و خەڵکی ناوچەکانی دیکە نەگۆڕاوە و وەکو خۆی ماوەتەوە. لێرەدا دەکرێ بڵێین لەبەر ئەوەی خێڵە کوردەکان تاڕادەیەك داخراون و خۆیان لە تێکەڵاوی لەگەڵ خێڵەکانی دیکە و یان هەر کەسێکی دەرەوەی عەشرەتەکەیان

دەپارێزن، هەروەها چونکە سروشتی خێڵ وایە هەمیشە ئەویتر بۆ خۆی دروست دەکات، ئەوا بۆچوونێکـــی ناڕاســتیان لەســەر ئــەوانی دیکــە هەبووە کە دواجار لە دوای راگواستن بــە گوتــەی زۆربــەی هــەرە زۆری نموونەکــە ، گۆڕانــی بەســەردا هــاتووە. هەمیشــە ئــەویتر وێنەیــەکی نێگەتیڤی هەیە لـــە زەینـــی ئێمــەدا ، بــەڵام دوای ئــەوەی خێڵــەکان و خەڵکی ناوچە جیاوازەکان تێکەڵ بەیەکتر دەبن، ناچـــار دەبـــن پێکــەوە بژین و مامەڵە و هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتردا بکەن، لە ئەنجامی ئــەم تێکەڵاویە بۆیان دەردەکەوێت کە پێشـــتر وێنەیـــەکی جوانیـــان لەســـەر ئەوانی دیکە هەبووە ، کەچی دوای تێکەڵاوبوونیان بۆیان دەردەکـــەوێت کە بە هەڵە دا چووبوون.

خشتەی ژمارە (٢٢) گۆڕانی بیروبۆچوونی نموونەکە لەگەڵ ئاراستەی گۆڕانەکە

| بیروبۆچوونمان / بیروبۆچوونتـــان سەبارەت بە خــەڵکی دیکــە گۆڕا | نـــەگۆڕا | گۆڕا و باشـــتر بوو | گۆڕا و خــراپتر بوو | کـــۆی گشـــتی |
|---|---|---|---|---|
| بــــەڵێ | 0 0.00% | 218 72.67% | 50 16.33% | 268 89.33% |
| نـــەخێر | 32 10.67% | 0 0.00% | 0 0.00% | 32 10.67% |
| **کـــۆی گشـــتی** | 32 10.67% | 218 72.67% | 50 16.67% | 300 100.00% |

لەو ٢٦٨ کەســەی کــە ڕێژەیــان دەکاتـــە ٨٩,٣٣٪ نموونەکـــە و بۆچوونیان لەســـەر خــەڵکی ناوچــەکانی دیکــە گۆڕانـــی تێکــەوتووە، ٧٢,٣٣٪ یان پێیان وایە بۆچوونیان گۆڕاوە و بەرەو باشی چــووە، واتــە

پێشتر بۆچوونێکی خراپیان لەسەر خەڵکی دیکە هەبووە و بەرەو باشی چووە. لە بەرامبەر ئەمانیش رێژەیەکی زۆر کەمتر کە دەکاتە ١٦,٦٧٪ وای بۆ دەچن کە پێشتر وێنەیەکی جوانیان لەسەر خێڵ و خەڵکانی دیکە هەبووە و دوای راگواستن و تێکەڵاوبوونیان بە خەڵکی ناوچەکانی دیکە ئەم وێنەیە ناشیرین بووە و بۆچوونیان بەرەو خراپی چووە. بەگشتی ئەو دوو رێژەیەی کە تەسەور و بۆچوونیان گۆڕانی تێکەوتووە، رێژەیەکی زۆر بەرز پێکدێنن.

## ٥ ـ تەمەنی نموونەکەمان لەگەڵ گۆڕانی چەمکەکان دا

خشتەی ژمارە (٢٣) بەپێی تەمەنی نموونەی باسەکە رای ئەوان سەبارەت بەوەی ئایا چەمکەکانی وەك خزمایەتی، برادەرایەتی، میوانداری، پیاوەتی، مەردایەتی و ... تد لەدوای راگواستن گۆڕاون، روونده‌کاتەوە.

٤ کەس بە رێژەی ١,٣٣٪ هیچ وەڵامێکی ئەو پرسیارەیان نەداوەتەوە و لەبەر ئەوەی رێژەکەش کەمە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر وەڵامەکان نابێت. بەڵام زۆرترین رێژەی نموونەکەمان کە دەکاتە ٨٣,٦٧٪ پێیان وایە لەدوای راگواستن چەمکەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەم شێوەیە: ١٤,٦٧٪ ئەوانەن کە تەمەنیان لەنێوان ١٩ـ٢٩ ساڵیدایە، ٢٢٪ ئەوانەن کە تەمەنیان ٣٠ـ٤٠ ساڵیدایە، ١٨,٣٣٪ ئەوانەن تەمەنیان لەنێوان ٤١ـ٥١ ساڵیدایە، ١٥,٦٧٪ ئەوانەن تەمەنیان لەنێوان ٥٢ـ٦٢ ساڵیدایە، ٨,٦٧٪ ئەوانەن تەمەنیان لە نێوان ٦٣ـ٧٣ ساڵیدایە و ٤,٣٣٥ ئەوانەن کە لەنێوان ٧٤ـ٨٤ ساڵیدان.

بەوەی کە رێژەی ئەوانەی پێیان وایە چەمکەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەلایەك و ئەوەش کە رێژەی هەموو کۆمەڵە تەمەنییەکان

ئەوانەی لەو بڕوایەدان لەگەڵ ڕێژە گشتییەکانیان زۆر لە یەکتر نزیکن و جیاوازیەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەو کۆمەڵە تەمەنیانەدا نییە کە شیاوی باس بێت، دەکرێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە چەمکە ناوبراوەکان لەدوای ڕاگواستن گۆڕاون و ڕاگواستن وەك زۆربەی بوارەکانی دیکە کاریگەری لەسەر ئەم بوارەش هەبووە. ئەوانەی پێیان وایە چەمکەکان نەگۆڕاون ١٥٪ نموونەکە پێکدێنن، هەڵبەت ئەمە ڕێژەیەکی کەم نییە، بەڵام ڕەنگە ژمارەیەکی بەرچاوی ئەمانە ئەوانە بن کە لە شار و شارۆچکەکانەوە ڕاگوێزراون و بەوەی کە پێشتر لە شاردا ژیاون و ژیانی شار جیاوازە لە ژیانی لادێ و ئەم چەمکانە پێویستە لە شار بەجۆرێکی دیکە بن و زووتر گۆڕانیان بەسەردا هاتبێت.

خشتەی ژمارە(٢٣) تەمەن لەگەڵ گۆڕانی چەمکەکان

| چەمکە کۆمەڵایەتییەکان گۆڕاون؟ / ساڵی ڕاگواستن | بەڵێ | نازانم | نەخێر | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 19-29 | 44<br>14.67% | 1<br>0.33% | 5<br>1.67% | 50<br>16.67% |
| 30-40 | 66<br>22.00% | 1<br>0.33% | 10<br>3.33% | 77<br>25.67% |
| 41-51 | 55<br>18.33% | 1<br>0.33% | 18<br>6.00% | 74<br>24.67% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 52-62 | 47<br>15.67% | 1<br>0.33% | 7<br>2.33% | 55<br>18.33% |
| 63-73 | 26<br>8.67% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 29<br>9.67% |
| 74-84 | 13<br>4.33% | 0<br>0.00% | 2<br>0.67% | 15<br>5.00% |
| **کۆی گشتی** | 251<br>83.67% | 4<br>1.33% | 45<br>15.00% | 300<br>100.00% |

### ٦ـ گۆڕانی چەمکە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ ڕەگەز

خشتەی ژمارە (٢٤) تایبەتە بە گۆڕانی چەمکەکانی وەك خزمایەتی، برادەرایەتی، پیاوەتی و... تد لەدوای ڕاگواستن لە پەیوەندیدا لەگەڵ ڕەگەزی نموونەکە. ئەگەرچی خشتەی پێشتریش تایبەت بوو بە چەمکەکان، بەڵام ئەویان تایبەت بوو بە چەمکەکان لە پەیوەندیدا بە تەمەنی نموونەکە. لەم خشتەیەدا دەمانەوێت بزانین ئایا جیاوازی هەیە لەنێوان بیرۆڕای ڕەگەزەکان لەبارەی گۆڕانی ئەم چەمکانە لەدوای ڕاگواستن؟

٢٩٪ ڕەگەزی مێ کە کۆی گشتیی ئەو ڕەگەزەیە لەنێو نموونەی باسەکەدا، بە ڕێژەی ٢٤,٦٧٪ پێی وایە لەدوای ڕاگواستن گۆڕان بەسەر چەمکە ناوبراوەکاندا هاتووە. هەروەها بە ڕێژەی ٣,٦٧٪ پێیان وایە ئەم چەمکانە هەمان دەلالەتی پێش ڕاگواستنیان هەیە و ڕووبەڕووی گۆڕان نەبۆنەتەوە.

سەبارەت بە ڕەگەزی نێریش کە زۆرینەی نموونەکەمان ڕێژەی ٧١٪

پێكدێنێت، زۆربەیان بە ڕێژەی ٥٩٪ پێیـــان وایــە لــەدوای ڕاگواســتن چەمكەكان گۆڕاون و وەكو جاران نین، بەڵام بــە ڕێژەیــەكی زۆر كــەمتر ١١,٣٣٪ لەو بڕوایەدان هیچ گۆڕانێك بەسەر چەمكەكاندا نــەهاتووە. لەم خشتەیەشدا وەكو خشتەی پێشوو (تەمـــەن و چەمكــەكان) هیــچ جیاوازیەكی وا كە شیاوی باس بێت، نییە. واتە هەردوو ڕەگەزەكــە بــە ڕێژەی لەیەك نزیك هەمان بیروبۆچوونیان هەیە.

خشتەی ژمارە (٢٤) گۆڕانی چەمكە كۆمەڵایەتیەكان

لەگەڵ ڕەگەز

| ڕەگەز / ئایا چەمكە كۆمەڵایەتیەكان گۆڕاون | نێر | مێ | كۆی گشتی |
| --- | --- | --- | --- |
| بەڵێ | 177 59.00% | 74 24.67% | 251 83.67% |
| نەخێر | 34 11.33% | 11 3.67% | 45 15.00% |
| بێ وەڵام | 2 0.67% | 2 0.67% | 4 1.33% |
| **كۆی گشتی** | 213 71.00% | 87 29.00% | 300 100.00% |

### ٧- بیروبۆچوونی نموونەكە سەبارەت بە خەڵكی ناوچەكانی دیكەو سەردانی خزم و كەسوكار

خشتەی ژمارە (٢٥) وەڵامی دوو پرســیار دەداتــەوە: یەكــەم، ئایــا ئێستا یان پێش ڕاگواستن زیاتر سەردانی خزم و برادەران دەكەن. دووەم،

لەدوای راگواستن بۆچوونیان لەمەڕ عەشـــرەت و خـەڵکی ناوچـەکانی دیکەی کوردستان گۆڕاوە یان نەگۆڕاوە؟

لە خشتەکەدا دەخوێنینەوە کـــە ٢٥٧ کـەس بـە ڕێـژەی ٨٥,٦٧٪ پێیـــان وایــە دوای راگواســـتن بیروبۆچوونیـــان لەســـەر خـــەڵك و عەشرەتەکانی دیکە گۆڕاوە، واتە ئەوان پێشتر وێنەیەکیان لـــە زەینـــی خۆیـاندا هـەبووە، دوای ئـەوەی رادەگوێزرێـن و تێکـەڵاوی خـــەڵکی ناوچەکانی دیکەی کوردستان دەبن، ئەو وێنەیە دەگۆڕێت. کـەچی ٤٣ کەس بە ڕێژەی ١٤,٣٣٪ی نموونەی باسەکە پێیان وایە دوای راگواســتن هیچ گۆڕانێك بەسەر وێنەی ئەوان بۆ خێـــڵ و عەشـرەتەکانی دیکـەدا نەهاتووە، بەڵام ئەم ڕێژەیـــە بـە بـەراورد لەگـەڵ ڕێژەکـەی پێشـتر زۆر کەمە.

لەوانەی کە بۆچوونیـــان گـۆڕاوە و ڕێژەیـان ٨٥,٦٧٪ بـوو، ڕێـژەی ٤٢.٦٧٪ پێیـــان وایـە کـەمتر لـە پێـش راگواسـتن سـەردانی خـزم و برادەرانیـــان دەکـەن، ڕێـژەی ٢٨٪یـش دەڵێـــن دوای راگواســـتن زیـــاتر سەردانی خزم و برادەران دەکەن، تەنیا ٤٥ کەسیشیان بە ڕێـــژەی ١٥٪ پێیان وایە وەکو جاران سەردانی خـــزم و بـرادەران دەکـەن و راگواســتن کاریگەریەکی بەسەر ئەم بوارەوە نەبووە.

بەڵام لـــەو ڕێژەیـەی (١٤,٣٣٪) کـە پێیـــان وایــە بیروبۆچوونیـــان سەبارەت بە خەڵکانی دیکە نەگۆڕاوە، لـــە نیـوە زیاتریـــان بـە ڕێـژەی ٧,٦٧٪ دەڵێن کەمتر سەردانی خزم و برادەرانیـــان دەکـەن. بـە ڕێـــژەی ٤,٣٣٪یش پێیان وایە دوای راگواستن سـەردانەکانیان زیـترن. ئـەوانی دیکە کە ڕێژەیان ٢,٣٣٪ی نموونەکەیە وای بۆ دەچن کە وەکـــو پێـش راگواستن سەردانیان دەکەن.

بە گشتی، ئەوانەی پێیان وایـە کـەمتر سـەردانی خـزم و بـرادەران دەکەن، ڕێژەیان ٥٠,٣٣٪یە واتەزیاتر لە نیوەی نموونەی تۆژینەوەکە.

خشتەی ژمارە (٢٥) بیروبۆچوونی نموونەکە سەبارەت بە خەڵکی ناوچەکانی دیکەو سەردانی خزم و کەسوکار

| سەردانی خزم و برادەران / بیروبۆچوونمان لەمەڕ خەڵکی ناوچەکانی تر | دوای ڕاگواستن زیاتر سەردانیان دەکەین | پێشتر ڕاگواستن زێتر سەرداغان دەکردن | وەکو پێشتر ڕاگواستن سەردانیان دەکەین | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| گـــۆڕا | 84<br>28.00% | 128<br>42.67% | 45<br>15.00% | 257<br>85.67% |
| نـــەگـۆڕا | 13<br>4.33% | 23<br>7.67% | 7<br>2.33% | 43<br>14.33% |
| **کـۆی گشـتی** | 97<br>32.33% | 151<br>50.33% | 52<br>17.33% | 300<br>100.00% |

## ٨ ـ ڕەگەز لەگەڵ هەستکردن بە خۆشویستن یان خۆشنەویستن

خشتەی ژمارە (٢٦) کـە تایبەتـە بـە ڕەگـەزی نموونەکـە لەگـەڵ هەستکردنی نموونەکە بە هاوسۆزی یاخود خۆشنەویستنی خەڵکی ئەو ناوچەیەی بۆی ڕاگوێزراون، دەردەکەوێت کەوا ڕێژەی ٤٥,٨٢٪ لە دوای ڕاگواستنیان هەستیان کردوە خەڵکی ڕەسەنی ئەو ناوچەیـەی ئـەمانی بۆ ڕاگوێزراون، ئەوانیان خۆشناوێن، واتە لە تازە هاتووەکان. لەوانـەی دەڵێن هەستمان بەوە کردووە ڕەگـەزی نـێر ٣٢,١١٪ و ڕەگـەزی مـێ ڕێژەی ١٣,٧١٪ پێکدێنن. ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ترس لە ئـەوانی

دیکە بەتایبەتی ئەوەی کە پێش راگواستن کوردی ناوچە جیاوازەکان زۆر کەم تێکەلاوی یەکتر بوون، یان بگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە راگوێزراوەکان لەسەر زەوی و زاریان نیشتەجێ کراون یاخود راگوێزراوەکان لە دەرفەتەکانی کاریان کەم دەکەنەوە.

خشتەی ژمارە (٢٦) رەگەز لەگەڵ هەستکردن بە خۆشویستن یان خۆشنەویستن.

| خەلکی ئەو ناوچەیەی بۆی راگوێزران / رەگەز | پێمەیان خۆشنەدەویست | پێمەیان خۆشدەویست | هەستمان بە هیچ نەکرد | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| نێر | 96<br>32.11% | 61<br>20.40% | 355<br>18.39% | 212<br>70.90% |
| مێ | 41<br>13.71% | 20<br>6.69% | 26<br>8.70% | 87<br>29.10% |
| کۆی گشتی | 137<br>45.82% | 81<br>27.09% | 81<br>27.09% | 299<br>100.00% |

لە بەرامبەر ئەمانیش رێژەی ٢٠,٤٠٪ ی رەگەزی نێر و ٦,٦٩٪ی رەگەزی مێ کە تێکرا ٢٧,٠٩٪ی نموونەی باسەکە پێکدێنن، هەستیان کردووە خەلکی رەسەنی ئەو ناوچەیەی کە ئەوانی بۆ راگوێزراون، ئەوانیان خۆشدەوێت. پێمان وایە رەنگە زۆربەی ئەوانەی

ئەم هەستەیان هەبێت خەڵکە ئەنفال کراو و لێقەوماوەکان بن، چونکە ئەوان رەوشێکی زۆر نالەباریان هەبوو و خەڵکی دیکە بەزەیی‌یان پێدا دەهاتەوە و یارمەتیان دەدان.

جگە لەم دوو دەستەیەی سەرەوە، دەستەیەکی دیکەمان هەیە کە دەڵێن لەدوای راگواستنیان هەستیان بە هیچ نەکردووە، نە رق لێبوونەوە و نە خوشەویستی. بەگشتی ئەمانە ٢٧,٠٩٪ نموونەکە پێکدەهێنن، واتە هەمان رێژەی ئەوانەی پێش خۆیان. لەم رێژەیەش رەگەزی نێر ١٨,٢٧٪ و رەگەزی مێ ٨,٧٠٪ پێکدێنن.

### ٩- رەگەز لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە

خشتەی ژمارە (٢٧) پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاوی رەگەز و بیروڕای نموونەکە سەبارەت بە گەڕانەوە بۆ زێدەکەیان یاخود شوێنی پێش راگواستنیان روونده‌کاتەوە.

بەپێی خشتەکە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان بیروڕای دوو رەگەزەکە سەبارەت بە گەڕانەوە. سەبارەت بە رەگەزی مێ، ئەوانەی پێیان وایە دەگەڕێنەوە یاخود حەزیان لە گەڕانەوەیە رێژەکەیان کەمە بەرامبەر بە دوو گۆڕاوەکەی دیکە (نزیکەی نیوەی دوو گۆڕاوەکەی تر)، تەنیا ٦,٣٣٪ نموونەی باسەکە پێکدێنن، واتە نزیکەی ١\٥. هەروەها دوو رێژەکەی دیکە لە رەگەزی مێ، ئەوانەی پێیان وایە ناگەڕێنەوە و ئەوانەی مەرجیان هەیە بۆ گەڕانەوە زۆر لە یەکەوە نزیکن (یەکەم ١١٪ و دووەم ١١,٣٣٪). ئەمەش نیشانەی ئەوەیە رەوشی ئافرەتی کورد پێش راگواستن نالەبار بووە.

خشتەی ژمارە (٢٧) ڕەگەز لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە

| بۆ ناوچەکەتان دەگەڕێنەوە / ڕەگەز | دەگەڕێینەوە | ناگەڕێینەوە | مەرجمان هەیە | نازانم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| نێر | 63<br>21.00% | 52<br>17.33% | 89<br>29.67% | 9<br>3.00% | 213<br>71.00% |
| مێ | 19<br>6.33% | 33<br>11.00% | 34<br>11.33% | 1<br>0.33% | 87<br>28.99% |
| **کۆی گشتی** | 82<br>27.33% | 85<br>28.33% | 123<br>41.00% | 10<br>3.33% | 300<br>99.99% |

بەڵام لە وەڵامی ڕەگەزی نێردا دەردەکەوێت ئەوانەی پێیان وایە دەگەڕێنەوە ڕێژەیان ٢١٪ و زێترە لە ڕێژەی ئەوانەی دەڵێن ناگەڕێینەوە یاخود حەزیان لە گەڕانەوە نییە کە ڕێژەکەیان ١٧,٣٣ ٪یە. هەروەها بەپێچەوانەی ڕەگەزی مێ ئەو ڕێژەیەی لە ڕەگەزی نێر مەرجیان بۆ گەڕانەوە هەیە تاڕادەیەکی بەرچاو بەرزترە لە ڕێژەکانی دیکە کە دەکاتە ٢٩,٦٧٪. هەروەها ٣٪ ڕەگەزی نێر بڕیاریان نەداوە و نازانن دەگەڕێنەوە یاخود ناگەڕێنەوە.

بەگشتی، ئەوانەی مەرجیان هەیە بۆ گەڕانەوە لە هەردوو ڕەگەزەکە زۆرترین ڕێژەی نموونەکە پێکدێنن (٤١٪)، مەرجەکانیش بەزۆری گەیاندنی خزمەتگوزاریە جۆراوجۆرەکانە بۆ گوندەکانیان

(ئـاوی بـۆڕی، جـادەی قیرتـاو، قوتابخانـەکان و بنکـەی تەندروسـتی ...تد)، چونکە زۆر ناوچەی کوردستان بەتایبەتی ناوچە سنووریەکان کـە تاڕادەیـەك ئـاوەدانیش کراونەتـەوە بێبەشـن لـە زۆربـەی ئـەم خزمەتگوزاریانە. هەروەها ئەو دوو رێژەیەی پێیان وایـە دەگەڕێنـەوە و ئەوانەی پێیان وایە ناگەڕێنەوە زۆر لێك نزیکن. ئەوانـەی دەگەڕێنـەوە ٢٧,٣٣٪ و ئەوانەی ناگەڕێنەوە ٢٨,٣٣٪ نموونەکە پێکدێنن.

### ١٠ـ رەگەز لەگەڵ زانینی هۆی راگواستن

لە خشـتەی ژمـارە (٢٨)دا کـە پـەیوەندی دوو گـۆڕاوی رەگـەز و هوشـیاری نموونـەی تۆژینەوەکـە سـەبارەت بـەوەی ئایـا دەزانـن بـۆ راگوێزران، دەردەخات. دەردەکەوێت کەوا جیاوازیەکی بەرچاو هەیە لـە نێوان هوشیاری دوو رەگەزەکە.

رەگەزی مـێ ٢٠٪ دەڵێـت: بـەڵێ دەزانم بـۆ حکومـەت ئێمـەیان راگواست، بەڵام ٩٪ی نموونەی باسەکە لە رەگەزی مێ دەڵێت نازانم بـۆ حکومەت ئێمەی راگواست، واتە نزیکەی یەك لە سێی رەگـەزی مـێ ئاگادار نییە لەوەی بۆچی راگوێزراون. ئەمەش بێ باکی رەگـەزی مـێ سەبارەت بە مەسەلە سیاسیەکانی کۆمەڵگاکەمان دەردەخات، ئافرەت لەو کۆمەڵگایانەی وەك کۆمـەڵگای ئێمـەن زۆر بایـەخ بـە مەسـەلە سیاسیەکان نادەن.

٦١٪ی نموونەکە لە رەگەزی نێر وای بۆ دەچن کە ئاگادارن و دەزانن بـۆ حکومـەت ئـەوانی لـە زێدەکـەیان راگواسـتووە، لـە بەرامبـەر ئەمانەشدا ١٠٪ رەگەزی نێر دەڵێن نازانین بۆچـی راگوێزراویـن. واتـە ٦\١ رەگـەزی نـێر هوشـیار نـین بەرامبـەر بـەو پرۆسـەیەی ژیـانی ئەوانی گۆڕی.

خشتەی ژمارە (٢٨) رەگەز لەگەڵ زانینی هۆی راگواستن

| دەزانی بۆ ئێوەیان راگواست / رەگەز | نەخێر | بەڵێ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| نێر | 30<br>10.00% | 183<br>61.00% | 213<br>71.00% |
| مێ | 27<br>9.00% | 60<br>20.00% | 87<br>29.00% |
| **کۆی گشتی** | 57<br>19.00% | 243<br>81.00% | 300<br>100.00% |

بەگشتی ٨١٪ی نموونەی باسەکە لە هەردوو رەگەز دەڵێن دەزانین بۆچی حکومەت ئێمەی راگواست. ئەوانی دیکە کە ١٩٪ نموونەکە پێکدێنن بە نەخێر وەڵامیان داوەتەوە. ١٩٪ رێژەیەکی بەرزە، ئەمە جگە لەوەی نیشانەی بێباکی راگوێزراوەکانە، نیشانەی کەمتەرخەمی هۆکارەکانی راگەیاندن و حزب و رێکخراوە جیاجیاکانیشە کە نەیانتوانیوە نە راگواستن و نە ئەنفال و نە هەڵەبجە بکەن بە یادەوەری تاکەکانی کۆمەڵگا و زۆر کەم بایەخیان بەم مەسەلانە داوە. ئەمە جگە لەوەی شەڕی ناوخۆ لە بایەخی ئەو کارەساتانەی کەم کردووتەوە.

### ١١ـ رەگەز لەگەڵ بۆچی راگوێزران

خشتەی ژمارە (٢٩) بیروڕای راگوێزراوەکان، بەپێی رەگەز لەبارەی هۆی راگواستنیان روون دەکاتەوە.

لە خشتەکەدا دەردەکەوێت کەوا نزیکەی سێیەکی رەگەزی مێ واتە

١٠٪ لە کۆی ٢٩٪، وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە و هۆیەکەش ئەوەیە کە نازانن بۆ راگوێزراون. ئەمەش جگە لەوەی بێباکی رەگەزی مێ لە کوردستانی باشور سەبارەت بە مەسەلە سیاسیەکان پیشاندەدات، نیشانەی ئەوەشە کە ئاستی هوشیاری سیاسی میللەتەکەمان نزمە، وێرای کەمتەرخەمی رێکخراو و حزبەکان و دەزگاکانی راگەیاندن چونکە ٩٪ رەگەزی نێریش نازانن بۆ حکومەت ئەوانی لە شوێنی خۆیان راگواستوون. بەگشتی لە ١٩٪ نموونەی باسەکەمان نازانن حکومەتی بۆچی بەعس ئەوانی راگواستوون. بەلاّم زۆرترین رێژەی نموونەکەمان کە دەکاتە ٣٦٪ وای بۆ دەچن هۆکاری راگواستنیان کوردبوونیان بووە. واتە ئەوان کوردبوون بە فاکتەری راگواستن دەزانن و پێیان وایە ئەگەر نەتەوەیەکی دیکە بوونایە بە تایبەتی عەرەب ئەوا رانەدەگوێزران. رێژەیەکی دیکە کە دیسان رێژەیەکی بەرزە (٢٢,٣٣٪) پێیان وایە حکومەت بۆیە ئەوانی لەسەر مولّك و ماڵەکانیان راگواستووە، چونکە پێشمەرگەیان لە ناودا بوون یاخود بەشەوان و بەدزی هاتونەتە ناویانەوە. ئەگەرچی هاتنی پێشمەرگە بۆ ناو دێ بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی رابردوو پاساوێکی بەهێز بوو بۆ حکومەت تاکو خەڵکی دێیەکە راگوێزێت و دێیەکە کاوڵ بکات، بەلاّم ئەم رێژە زۆرە کە ئەوە بەهۆکاری راگواستنیان لەقەڵەم دەدەن، هەمان رای بەعسیەکان دووبارە دەکەنەوە، ئەمە پاساوی بەعس بوو نەك شتێکی دیکە، چونکە بەو پێیە بوایە خەڵکێکی کەمی کوردستانی باشور رادەگوێزران و شارەکانی وەکو کەرکوك و مووسڵ کە قەت پێشمەرگە نەدەچووە ناویان دانیشتووانە کوردەکانیان رووبەرووی راگواستن نەدەبوونەوە. رێژەی دوای ئەم رێژەیە کە ١٢,٦٧٪ نموونەکەیە وای بۆ دەچن مەبەستی حکومەت لە راگواستنی کوردەکان لەناوبردنی کورد

و دامرکاندنـەوەی شۆڕشـەکەی بـوو. ئەمانـە پێیـان وایـە هـۆی ڕاگواستنیان ئەوە بووە کە حکومەتی بەعس ویستویەتی کـورد وەکـو نەتەوە لەناوبەرێ یاخود بەلای کەمەوە شۆڕشی کـوردی کـە دەمێکـی درێـژ بـوو بـەردەوام بـوو دامرکێنێتـەوە، چونکـە ڕاگواسـتنی گوندنشینەکان، گورزێك دەبێت بـەر شـۆڕش دەکـەوێت، بـەو پێیـەی گوندنشینەکان پاڵپشتێکی گەورەی (مادی و مەعنەوی) پێشمەرگە و شۆڕش بوون. هـەروەها ڕێژەیـەکی کـەمی دیکـە کـە تـەنیا ٢,٦٧% نموونەکەیە وای بۆ دەچن مەبەستی حکومەت لە ڕاگواستنی گوندەکان هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابووریی کوردستان بوو.

خشتەی ژمارە (٢٩) ڕەگەز لەگەڵ بۆچی ڕاگوێزران

| ڕەگـــەز<br>بـۆ ئـێوەیـان ڕاگـواسـت | نـێـر | مـێ | کـۆی گشـتی |
|---|---|---|---|
| نـازانـم | 27<br>9.00% | 30<br>10.00%. | 57<br>19.00% |
| ئـێمـە کـورد بـوویـن | 86<br>28.67% | 22<br>7.33% | 108<br>36.00% |
| پـێشـمـەرگـەمـان لـەنـاو بـوو | 47<br>15.67% | 20<br>6.67% | 67<br>22.33% |
| لـەنـاوبـردنـی کـورد و بـزوتـنـەوەکـەی | 29<br>9.67% | 9<br>3.00% | 38<br>12.67% |

| هەڵتەکاندنی ژێرخانی ئابووری | 6 2.00% | 2 0.67% | 8 2.67% |
|---|---|---|---|
| سەرسنوور بووین | 2 0.67% | 2 0.67% | 4 1.33% |
| بۆ ئەوەی کۆنترۆڵمان بکەن | 15 5.00% | 1 0.33% | 16 5.33% |
| بۆ ئەوەی ژیانمان خوش بکەن | 1 0.33% | 1 0.33% | 2 0.67% |
| **کۆی گشتی** | 213 71.00% | 87 29.00% | 300 100.00% |

ڕێژەیەکی لەویش کەمتر واتە ١,٣٣٪ پێیان وایە لەبەر ئەوەی ناوچەکەیان ناوچەیەکی سەرسنووری (عێراق ـ ئێران) بووە ڕاگوێزراون. بەڵام ڕێژەیەکی تاڕادەیەك بەرچاوی دیکە کە دەکاتە ٥.٣٣٪ نموونەکە وای بۆ دەچن کە ئەو کاتەی ئەوان لە گوندەکان دەژیان ئازادبوون و حکومەت دەسەڵاتی بەسەریاندا نەدەشکا، بۆیە ئەوانیان ڕاگواست تاکو بەتەواوی کۆنترۆڵیان بکات. تەنیا دوو کەسیش بە ڕێژەی ٠,٦٧٪ پێیان وایە حکومەت بە مەبەستی خوشکردنی ژیانیان ئەوانی ڕاگواستووە، ئەگەرچی ڕێژەکە هێندە کەمە کە بەتەواوی دەکرێ پشتگوێ بخرێت، بەڵام ئەم ڕایە بەتەواوی ڕەنگدانەوەی بیروڕای بەعسە و کاریگەری بەعس لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگاکەمان دوای دوازدە ساڵ ڕزگاربوونی لە دەسەڵاتی بەعس دەردەخات.

## ١٢ـ ئازادیی ئافرەت لەگەڵ رەگەز

خشتەی ژمارە (٣٠) وەڵامــی دوو پرسـیار رووندەکاتــەوە. یەکــەم، رەگەزی نموونەکەمان، دووەم، ئایا ئافرەت لە گوند یاخود لە ئوردووگـا و شار ئازادتر بوو لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن؟

بەگشتی دەردەکەوێت کەوا ١٦٥ کەس بە رێژەی ٥٥٪ واتە زێتر لە نیوەی نموونەکەمان بەم شێوەیە ٣٩,٣٣٪ لە رەگەزی نـێر و ١٥,٦٧٪ لە رەگەزی مێ پێیان وایە ئافرەت لە گوند ئازادتر بووە وەك لە شـار و ئوردووگا لەدوای راگواستن. ئەگەرچی ئێمە لەلایەنە تیۆریەکەدا باسی ئەوەمان کـرد کـە ئـافرەت لـە شـاری کـوردی دا پێشـان رەوشـێکی پەشێوتری هەبوو بەتایبەتیش بەهۆی پێچەوە، بەڵام لەدوای راگواسـتن وێڕای ئەوەی کە ئافرەت پەچەی نامێنێت و سەرباری ئەوەی دەخوێنێـت و ئەرکەکانی ماڵەوەی سوکتر دەبن، هێشتاش بە رێژەیەکی گەلێ زۆرتر پێی وایە جاران ئازادیەکی زێتری هەبووە لە ئێسـتا. ئەمـەش گومـان دەخاتــە ســەر هــەموو ئــەو پێشــکەوتنەی کــە بانگەشـــە دەکرێــت کوردستانی باشور بەخۆیەوە بینیویەتی.

ئەو رێژەیەی پێی وایە لەدوای راگواستن ئـافرەت ئـازادترە لـەپێش راگواستن دیسان رێژەیەکی بەرچاوە، بەم شێوەیە: ٢٢٪ رەگەزی نـێر و ٩,٦٧٪ رەگەزی مێ کە پێکەوە ٣١,٦٧٪ نموونەکە پێکدێنێت، وێڕای ئەو پرسیارەی ئایا دەکرێ رای پیاو سەبارەت بە ئازادی ئـافرەت چـەند بە هێند وەربگیرێت.

دوا رێژەش کە پێی وایە لەگەڵ راگواستندا گۆڕان بەسـەر ئـازادیی ئافرەتی کورددا نەهاتووە دەکاتە ٩,٦٧٪ نموونەکـە. ٧,٣٣٪ رەگـەزی نێر و ٢,٣٣٪ رەگەزی مێ لەگەڵ ئەم رایەدان.

ئەو رێژەیەش کە پێی وایە ئافرەت نە لـە گونـد و نـە لـە شـار و ئوردووگا واتە نـە پێـش راگواسـتن و نـەدوای راگواسـتن ئـازاد بـووە،

کـەمترین ڕێـژەی نموونەکــەمان پێکدێنێــت کــە تێکــڕا ٣,٦٧٪ نموونەکەیە. ئەمەش ئەوە دەردەخـات کـە ئـافرەتی کـورد لـە ڕەوشـی کۆمەڵایەتی خۆی ڕازییــە و هەسـت ناکـات دەچەوسـێنرێتەوە یـاخود پیاوەکان پانتایی ئازادی ئەویان زۆر بچـووك کردووتـەوە. ئەمــەش بـۆ ئێمە چاوەڕوان نەکراو بوو بەتایبەتی لــەمڕۆی کۆمەڵگاکـەماندا کـە ڕۆژانە گوێبیستی مافەکانی ئافرەت و ئازادیەکانی دەبین لــە کـەناڵی جیـا و لەلایـەن توێـژ و کەسـایەتیە جیاجیاکانــەوە. ئــەم هەسـت نەکردنەش بەوەی ئافرەتان ئازاد نین، ڕەنگە گەورەترین هۆکارێك بێـت لە سەرهەڵنەدانی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ڕاسـتەقینەی ئافرەتـان. تەنانەت هیچ کۆمەڵە و ڕێکخراوێکی ئافرەتـانیش کـە ئـازاد بێـت و لەلایەن ئافرەتانی کوردەوە پشتگیری بکرێـت و داوای ئـازادی ئـافرەت بکات لە کوردستانی باشوردا سەریهەڵنەداوە.

زۆربەی هەرە زۆری ڕێکخراوەکان، کۆمەڵە و ڕێکخراوە حزبیــەکانن کە خزمەت بە بەرژەوەندی حزبەکان زیاتر دەکەن و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان ئافرەتــانی کوردسـتان وەك بوونــەوەری ئـازاد و خـاوەن مـاف بخەنەڕوو. هەڵبەت ئەمانەش بەوەی کە ڕێکخراوی بەهێزن و پشتگیریی مــادی و مەعنــەویان هەیـە، کاریگـەریان لەسـەر گەلاڵـە کـردن و دارشتنی بیروڕای ئافرەتان کەم نەبووە.

خشتەی ژمارە (٣٠) ئازادی ئافرەت لەگەڵ ڕەگەز

| ڕەگـــەز<br>ئـافـرەت ئـــازادتــر بـــوو | نـێـر | مـێ | کـۆی گشـتی |
|---|---|---|---|
| لـە گـونـد | 118<br>39.33 % | 47<br>15.67% | 165<br>55.00% |

| | | | |
|---|---|---|---|
| لـه ئـۆردووگـا | 66<br>22.00% | 29<br>9.67% | 95<br>31.67% |
| لـه هیـچ کـامـێـکیـان | 7<br>2.33% | 4<br>1.33% | 11<br>3.67% |
| لـه هـەردوو لا وەك یـەك بـوو | 22<br>7.33% | 7<br>2.33% | 29<br>9.67% |
| **کـۆی گشـتی** | 213<br>71.00% | 87<br>29.00% | 300<br>100.00% |

### ١٣ـ مامەڵەی پیاو لە بەرامبەر ئافرەت

داتاکانی ناو خشتەی ژمارە (٣١) بـیروڕای دوو رەگەزەکـە لـەبارەی مامەڵەی پیاو لەگەڵ ئافرەت لە کوردستانی باشور لـە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن روون دەکەنەوە، ئایا ئەم مامەڵەیە لە کام لەم دوو قۆناغە باشتر بووە؟

لە راستیدا بە چاوخشـاندن بـە داتاکـاندا هیـچ پەیوەندیـەك کـە شـیاوی بـاس بێـت دەرناکـەوێت (هـەروەك لـە خشـتەی پێشـوودا ـ پـەیوەندیی رەگـەز و ئـازادیی ئـافرەت ـ پەیوەندیـەکی ئـەوتۆ دەرنەکەوت)، چونکە بەپێی رەگەزەکان جیاوازیـەکی ئـەوتۆ لـەنێوان بۆچوونەکاندا نابینین.

ئەوانەی پێیان وایە پێش راگواستن مامەڵەی پیاو لەگەڵ ئـافرەتدا باشتر بووە رێژەیان ٣٧,٣٣٪ یە، بەم جۆرە: ١٠,٦٧٪ لـە کـۆی ٢٩٪ لە رەگەزی مێ و ٢٦,٦٧٪ لەکۆی ٧١٪ لـە رەگـەزی نـێر. هـەروەها رێژەیـەکی زۆر نزیکیـش لەمـە، واتـە ٣٨,٦٧٪ لەوبڕوایـەدان دوای راگواستن مامەڵـەی پیـاو لەگـەڵ ئـافرەت باشـتر بـووە، بـەم جـۆرە:

١٠,٦٧٪ له ڕەگەزی مێ و ٢٨٪ له ڕەگەزی نێر. ئەوانەش کە پێیـان وایە مامەڵەکە وەکو جاران وایە ڕێژەکەیان بەگشـتی ٢٤٪ ە، ٧,٦٧٪ له ڕەگەزی مێ و ١٦,٣٣٪ له ڕەگەزی نێر.

هەروەك له سـەرەتادا ئاماژەمـان پێکـرد بەبـەراوردکردنی ڕێـژەی گشتیی دوو ڕەگەزەکە لەگەڵ ڕێژەی هـەر یـەك لـه ڕەگەزەکـە بـەجیا پەیوەندیەکی ئەوتۆ کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد، نـابینرێت. ئێمـە لـەو بڕوایەدا بوین کە جیاوازیەك دەبێت لەنێوان بۆچوونی دوو ڕەگەزەکـەدا. ئەمەش دوو ئەگەرمان دەخاتە پێش: یەکەم، یان مامەڵـەی پیاوەکـان سەرەڕای گۆڕانی شوێن و کاتەکـە و ئـەو گۆڕانـەی بەسـەر ژیانیـاندا هاتووە نەگۆڕاوە یاخود بە ئەگەرێکی کەمتر ئافرەتانی کورد ناتوانن بە باشی جۆری ئەو پەیوەندیە دیار بکەن.

خشتەی ژمارە (٣١) مامەڵەی پیاو لە بەرامبەر ئافرەت لەگەڵ ڕەگەز

| ڕەگـەز<br>مامـەڵەی پـیاو<br>لەگـەڵ ئـافرەت | نـێـر | مـێ | کـۆی گشـتی |
|---|---|---|---|
| پێش ڕاگـواسـتن بـاشـتر بـوو | 80<br>26.67% | 32<br>10.67% | 112<br>37.33% |
| دوای ڕاگـواسـتن بـاشـترە | 84<br>28.00% | 32<br>10.67% | 116<br>38.67% |
| وەکـو جـارانـە | 49<br>16.33% | 23<br>7.67% | 72<br>24.00% |
| کـۆی گشـتی | 213<br>71.00% | 87<br>29.00% | 300<br>100.00% |

## ١٤- شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش ڕاگواستن لەگەڵ ڕێژەی خۆکوشتن

خشتەی ژمارە (٣٢)، داتاکانی تایبەت بە شوێنی نیشتەجێبوونی ڕاگوێزراوەکان هاوشان بە بیروڕایان سەبارەت بە زۆری خۆکوشتن لە ناوچەکەیان لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن دەخاتە ڕوو.

زۆربەی هەرە زۆری نموونەی تۆژینەوەکە بە ڕێژەی ٨٧,٣٣٪ پێیان وایە دیاردەی خۆکوشتن لەو ناوچانەی کە ئەوانیان لێ نیشتەجێ بووین دوای ڕاگواستن زێتر بووە وەك پێش ڕاگواستن. خۆکوشتن وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی هاوشان بە ئاڵۆزبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی تاکەکان زێدەدەکات و گومانیشی تێدا نییە کۆمەڵگای کوردی لەدوای ڕاگواستن وەك جاران سادە نییە و ئاڵۆز بووە. بەڵام ئەوانەی پێیان وایە پێش ڕاگواستن خۆکوشتن زێتر بووە، ڕێژەیەکی زۆر کەمی نموونەکە پێکدێنن و تەنیا ٤,٦٧٪ نموونەکەن. بەڵام ئەوانەی بە نازانم وەڵامیان داوەتەوە ڕێژەکەیان بەرزترە و دەکاتە ٨٪ نموونەکە. ڕەنگە هۆی ئەم وەڵامە ئەوەبێت کە تا ئەمڕۆش خۆکوشتن نەبۆتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵکو لە هەندێ ناوچە ئەوانەی خۆیان کوشتوە بۆ ماوەیەکی تاڕادەیەك درێژ ڕەنگە ژمارەکان لە پەنجەی دەست زێتر نەبن.

خشتەی ژمارە (٣٢) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش ڕاگواستن لەگەڵ ڕێژەی خۆکوشتن

| خۆکوشتن / *قەزا* | پێش ڕاگواستن زێتر بوو | دوای ڕاگواستن زۆرترە | نازانم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| هەڵەبجە | 0<br>0.00% | 36<br>12.00% | 1<br>0.33% | 37<br>12.33% |

| پێنجوین | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% |
|---|---|---|---|---|
| سلێمانی | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% |
| شارباژێر | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% | 1<br>0.33% | 8<br>2.67% |
| دوکان | 1<br>0.33% | 5<br>1.67% | 0<br>0.00% | 6<br>2.00% |
| رانیه | 2<br>0.67% | 9<br>3.00% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% |
| چۆمان | 0<br>0.00% | 14<br>4.67% | 1<br>0.33% | 15<br>5.00% |
| شەقڵاوە | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% |
| مێرگەسوور | 4<br>1.33% | 30<br>10.00% | 2<br>0.67% | 36<br>12.00% |
| مەخموور | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% | 2<br>0.67% | 10<br>3.33% |
| هەولێر | 1<br>0.33% | 7<br>2.33% | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% |
| کۆیە | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 2<br>0.67% |
| کفری | 0<br>0.00% | 26<br>8.67% | 1<br>0.33% | 27<br>9.00% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| خانەقین | 0 0.00% | 8 2.67% | 0 0.00% | 8 2.67% |
| کەرکوك | 3 1.00% | 30 10.00% | 7 2.33% | 40 13.33% |
| توزخورماتوو | 0 0.00% | 10 3.33% | 2 0.67% | 12 4.00% |
| زاخۆ | 0 0.00% | 6 2.00% | 1 0.33% | 7 2.33% |
| ئامێدی | 2 0.67% | 30 10.00% | 1 0.33% | 33 11.00% |
| دهۆك | 0 0.00% | 18 6.00% | 1 0.33% | 19 6.33% |
| شنگار | 1 0.33% | 4 1.33% | 1 0.33% | 6 2.00% |
| **کۆی گشتی** | 14 4.67% | 262 87.33% | 24 8.00% | 300 100.00% |

ئەوەی جێی تێبینییە، زۆرترین رێژەی ئەوانەی لەو بڕوایەدان پێش راگواستن خۆکوشتن زێتر بووە، راگوێزراوەکانی دوو قەزای کەرکوك و مێرگەسوورن، بەجۆرێك کە ئەم دوو قەزایە نیوەی ئەوانەی ئەم وەڵامەیان داوەتەوە پێکدێنن و راگوێزراوەکانی ١٨ قەزاکەی دیکەش نیوەکەی تر. بەڵام ئەوانەی بە نازانم وەڵامیان داوەتەوە زۆرترین رێژەیان لەنێو راگوێزراوەکانی قەزای کەرکوکدان واتە ٢,٣٣٪ لەکۆی ٨٪.

### ١٥ـ شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی تۆژینەوە لەگەڵ مەسەلەکانی شەرەف

سێکس و مەسەلە سێکسیەکان لە ناو کورداندا تا ئەمڕۆش حیسابێکی تایبەتیان بۆ دەکرێت. ئەم مەسەلانە پەیرەوی لە چەند یاسا و پرەنسیپێکی تا رادەیەکی بەرچاو جێگیر و چەسپیو دەکەن. سێکس بەوەی کە بە مانایەك لە ماناکان شەرەف و ناموسە لە ناو کورداندا لەسەر ئاستی تاکەکەس، خێزان، بنەماڵە و تەنانەت هەندێ کات عەشرەت. لادان لەو یاسا و بنەمایانەی ئەم مەسەلانە لە سەریان رێکخراون گران دەکەوێتەوە لە هەمان ئەو ئاستانەدا کە لە سەرەوە ناویان هات.

خشتەی ژمارە (٣٣) تیشك دەخاتە سەر زۆری ئەو کێشە کۆمەڵایەتیە (مەسەلەکانی شەرەف) لە پێش راگواستن و دوای راگواستن، ئایا ئەم کێشانە پێش راگواستن یان دوای راگواستن زێترن ئەویش بە پێی شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی باسەکە. هۆی ئەوەش کە لە پەیوەندیدا بە شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە دەیخەینەڕوو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم مەسەلەیە (سێکس) سەرەڕای ئەوەی لە هەموو کوردستانی باشوردا حەساسە، لە هەندێك ناوچە و لە ناو هەندێك عەشرەتدا هەستیارترە وەك لە هەندێ دەڤەر و لەنێو هەندێ خێڵدا.

بەگشتی، ٥٪ی نموونەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارەیان نەداوەتەوە، زۆرترینی ئەمانەش دەکەونە نێو ئەو نموونانەی کە دانیشتووی قەزای کەرکوك بوون و ژمارەیان ٤ کەسە. کەچی ئەوانەی پێیان وایە دوای راگواستن ئەم کێشانە زێترن، زۆربەی هەرە زۆری نموونەکەمانن بە رێژەی ٨١٪، ئەمەش جێگەی تێڕامانە و دەکرێ ئێمە لێرەدا لە

خۆمان بپرسین ئایا کۆمەڵگاکەمان لەم دوو دەیەی کۆتاییدا بەرامبەر بە سێکس هەستیارتر بووە یاخود هۆکارێکی دیکە لە پشت مەسەلەکەوەیە؟ ئایا هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جاران خەڵك کەمتر بایەخیان بەم مەسەلانە دەدا یاخود خەڵکی لەو کاتدا زێتر چاویان لەم مەسەلانە دەپۆشی؟ یان دوای ئەوەی تێکەڵاوی یەکتر بوون و دوای ئەوەی ئافرەت زێتر چووە نێو فەرمانگەکان و خەڵکی لادێی جیاواز یان ناوچەی جیاوازیان لە گەڕەکێکدا کۆکردنەوە ئەم مەسەلانە پەرەیان سەند؟ یان هۆکارێکی دیکەی نادیار هەیە؟ چونکە ئەوانەی پێیان وایە جاران ئەم کێشانە زێتر بوون تەنیا ١٤٪ نموونەی باسەکە پێکدێنن. ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە ژمارەیەکی زۆریان یاخود بەدەستەواژەیەکی دیکە نزیکەی نیوەیان واتە ٢٠ کەس لە کۆی ٤٢ کەس دانیشتووی سێ قەزای کەرکوك، مێرگەسوور و ئامێدین.

خشتەی ژمارە (٣٣) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی تۆژینەوە لەگەڵ مەسەلەکانی شەرەف

| کێشەکانی شەرەف زۆرتر بوون / قەزا | پێش ڕاگواستن | لەدوای ڕاگواستن | نازانم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| هەڵەبجە | 2<br>0.67% | 35<br>11.67% | 0<br>0.00% | 37<br>12.33% |
| پێنجوین | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% |
| سلێمانی | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| شارباژێر | 1<br>0.33% | 6<br>2.00% | 1<br>0.33% | 8<br>2.67% |
| دوکان | 2<br>0.67% | 4<br>1.33% | 0<br>0.00% | 6<br>2.00% |
| رانیه | 4<br>1.33% | 8<br>2.67% | 0<br>0.00% | 12<br>4.00% |
| چۆمان | 1<br>0.33% | 14<br>4.67% | 0<br>0.00% | 15<br>5.00% |
| شەقلاوە | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% |
| مێرگەسوور | 6<br>2.00% | 28<br>9.33% | 2<br>0.67% | 36<br>12.00% |
| مەخموور | 3<br>1.00% | 6<br>2.00% | 1<br>0.33% | 10<br>3.33% |
| هەولێر | 2<br>0.67% | 6<br>2.00% | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% |
| کۆیە | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 2<br>0.67% |
| کفری | 2<br>0.67% | 24<br>8.00% | 1<br>0.33% | 27<br>9.00% |
| خانەقین | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% |
| کەرکوک | 5<br>1.67% | 31<br>10.33% | 4<br>1.33% | 40<br>13.33% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| توزخورماتوو | 1<br>0.33% | 10<br>3.33% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% |
| زاخۆ | 1<br>0.33% | 5<br>1.67% | 1<br>0.33% | 7<br>2.33% |
| ئامێدی | 9<br>3.00% | 23<br>7.67% | 1<br>0.33% | 33<br>11.00% |
| دهۆك | 1<br>0.33% | 17<br>5.67% | 1<br>0.33% | 19<br>6.33% |
| شنگار | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% | 1<br>0.33% | 6<br>2.00% |
| **کۆی گشتی** | 42<br>14.00% | 243<br>81.00% | 15<br>5.00% | 300<br>100.00% |

## ١٦ـ شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش راگواستن لەگەڵ رێژەی منداڵبوون

لە خشتەی ژمارە (٣٤)دا کە داتاکانی تایبەت بە شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی باسەکە بەپێی قەزا و چەندێتی لەدایکبوونی منداڵان لەدوای راگواستن و پێش راگواستن دەخاتە ڕوو، دەردەکەوێت ٢٪ی نموونەی باسەکەمان ئەم پرسیارەیان فەراموش کردووە و هیچ وەڵامێکیان سەبارەت بە رێژەی لەدایکبوونی منداڵان لە پێش راگواستن و دوای راگواستن نەداوەتەوە. کەچی ٤٤٪ی نموونەکە پێیان

## خشتەی ژمارە (٣٤) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش راگواستن لەگەڵ ڕێژەی منداڵبوون

| منداڵ / قەزا | لەدوای راگواستن زێتر لە دایك دەبن | لەدوای راگواستن کەمتر لەدایك دەبن | وەکو جاران لەدایك دەبن | بێ وەڵام | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| هەڵەبجە | 26 8.67% | 3 1.00% | 8 2.67% | 0 0.00% | 37 12.34% |
| پێنجوین | 1 0.33% | 2 0.67% | 1 0.33% | 0 0.00% | 4 1.33% |
| سلێمانی | 1 0.33% | 4 1.33% | 2 0.67% | 0 0.00% | 7 2.33% |
| شارباژێر | 5 1.67% | 2 0.67% | 0 0.00% | 1 0.33% | 8 2.67% |
| دوکان | 0 0.00% | 5 1.67% | 1 0.33% | 0 0.00% | 6 2.00% |
| رانیە | 2 0.67% | 5 1.67% | 5 1.67% | 0 0.00% | 12 4.01% |
| چۆمان | 9 3.00% | 4 1.33% | 2 0.67% | 0 0.00% | 15 5.00% |
| شەقڵاوە | 0 0.00% | 1 0.33% | 2 0.67% | 0 0.00% | 3 1.00% |
| مێرگەسوور | 7 2.33% | 20 6.67% | 8 2.67% | 1 0.33% | 36 12.00% |

| مەخموور | 2<br>0.67% | 4<br>1.33% | 4<br>1.33% | 0<br>0.00% | 10<br>3.33% |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| هەولێر | 3<br>1.00% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% | 0<br>0.00% | 8<br>2.66% |
| کۆیە | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 2<br>0.66% |
| کفری | 13<br>4.33% | 9<br>3.00% | 5<br>1.67% | 0<br>0.00% | 27<br>18.00% |
| خانەقین | 7<br>2.33% | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 8<br>2.66% |
| کەرکوك | 13<br>4.33% | 15<br>5.00% | 10<br>3.33% | 2<br>0.67% | 38<br>13.33% |
| تووزخورماتوو | 5<br>1.67% | 5<br>1.67% | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% |
| زاخۆ | 6<br>2.00% | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% |
| ئامێدی | 17<br>5.67% | 5<br>1.67% | 10<br>3.33% | 1<br>0.33% | 33<br>11.00% |
| دهۆك | 14<br>4.67% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% | 0<br>0.00% | 19<br>6.33% |
| شنگار | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% | 0<br>0.00% | 6<br>1.99% |
| کۆی گشتی | 132<br>44.00% | 88<br>29.33% | 74<br>24.67% | 6<br>2.00% | 300<br>100.00% |

وایە لەدوای ڕاگواستن منداڵ زێتر لەدایك دەبن، ڕەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئافرەتان لەدوای ڕاگواستن کەمتر کاری قورسیان کردووە و کەمتر بەدەست بەدخۆراکییەوە دەناڵێنن. هەروەها نەخۆشخانە و داوودەرمانیش کاریگەریان هەبووە. ژمارەیەکی زۆری نموونەی وەرگیراوی قەزاکانی هەڵەبجە، شارباژێر، کەلار، خانەقین، زاخۆ، ئامێدی، دهۆك و چۆمان نیشانەیان لەبەردەم ئەم گۆڕاوە داناوە.

هەروەها ئەوانەی پێیان وایە لەدوای ڕاگواستن ژمارەی منداڵە لەدایکبووەکان کەمترە ٩,٣٣٪ی نموونەی باسەکەمان پێکدەهێنن، زۆربەشیان دانیشتووی قەزاکانی کەرکوك، سلێمانی، پێنجوین، دوکان و مێرگەسوور بوون پێش ڕاگواستنیان.

کەچی ئەوانەی جیاوازیەکی ئەوتۆ نابینن لە نێوان ڕێژەی لەدایکبوونی منداڵان لەو دوو قۆناغەدا ٢٤,٦٧٪ی نموونەی تۆژینەوەکە پێکدێنن، ئەوانەی ئەم بۆچوونەشیان هەیە زۆربەی نموونەی قەزاکانی ڕانیە، شەقلاوە، مەخموور، هەولێر و شنگار پێکدەهێنن.

لێرەشدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە وەڵامی نموونەکە پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بە شوێنی نیشتەجێبوونەوە، چونکە هەروەکو بینیمان هەر ژمارەیەك قەزا وەڵامێکی تایبەتیان بەسەردا زاڵ بوو.

## ١٧ـ شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش ڕاگواستن لەگەڵ ڕێژەی تەڵاق

لە خشتەی ژمارە (٣٥)دا کە وەڵامی دوو گۆڕاوی شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە لە پێش ڕاگواستن لەگەڵ ڕێژەی تەڵاق لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن دەداتەوە، دیارە ٨٧,٣٣٪ی نموونەی باسەکەمان لەو بڕوایە دان دوای ڕاگواستن ڕێژەی تەڵاقدانی

ئافرەتان لە کۆمەڵگای کوردیدا زیاد بووە. لێرەشدا بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەو ٧ نموونەیەی قەزای سلێمانی، ١٥ نموونەی قەزای چۆمان و ٨ نموونەکەی قەزای خانەقین بکەین کە بە رێژەی ١٠٠٪ پێیان وایە لەدوای راگواستن رێژەی تەڵاقدان رووی لە زیادیە. هەڵبەت هۆی ئەم کێشەیەش جگە لە کاریگەری راگواستن دەگەڕێتەوە بۆ ئاڵۆزبوونی ژیان، گۆڕانی بەها و دابونەریتەکان و کرانەوەی زێتر بەرووی جیهاندا.

بەڵام ئەوانەی پێیان وایە تەڵاق پێشراگواستن زێتر بووە تەنیا ٦,٦٧٪ی نموونەی باسەکە پێکدێنن. لەنێو ئەو نموونانەی نیشانەیان لەبەردەم ئەم گۆڕاوە داناوە، هیچ یەکێك لە نموونە وەرگیراوەکانی قەزاکانی پێنجوین، سلێمانی، شارباژێر، چۆمان، شەقلاوە، مەخموور، کۆیە، خانەقین، توزخورماتوو و زاخۆی تیا نییە. زۆرترین ئەوانەی ئاماژەیان بە زۆری ئەم دیاردەیە کردووە لەپێش راگواستن دانیشتووی سێ قەزای کەرکوك، ئامێدی و کفرین.

هەروەها ئەوانەی پێیان وایە جیاوازیەکی ئەوتۆ نییە لە رێژەی تەڵاق لە پێش راگواستن و دوای راگواستن تەنیا ٦٪ی نموونەی باسەکەمان پێکدێنن. زۆرترینی ئەمانەش دانیشتووی ئەم قەزایانەن، بەم شێوەیە:

کەرکوك ٥ کەس، بۆ هەر یەك لە دوو قەزای مێرگەسوور و رانیە ٢ کەس. هیچ یەکێك لە نموونەی قەزاکانی هەڵەبجە، سلێمانی، دوکان، چۆمان، شەقلاوە، هەولێر، کۆیە و خانەقین نیشانەیان لەبەردەم ئەم گۆڕاوە دانەناوە.

خشتەی ژمارە (٣٥) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش ڕاگواستن لەگەڵ ڕێژەی تەڵاق.

| تەلاق / قەزا | وەکو پێش ڕاگواستنە | پێش ڕاگواستن زێتر بوو | دوای ڕاگواستن زێترە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| هەڵەبجە | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 36<br>12.00% | 37<br>12.33% |
| پێنجوین | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 4<br>1.33% |
| سلێمانی | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% | 7<br>2.33% |
| شارباژێر | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 7<br>2.33% | 8<br>2.67% |
| دوکان | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 5<br>1.67% | 6<br>2.00% |
| ڕانیە | 2<br>0.67% | 2<br>0.67% | 8<br>2.67% | 12<br>4.00% |
| چۆمان | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 15<br>5.00% | 15<br>5.00% |
| شەقڵاوە | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 3<br>1.00% |
| مێرگەسوور | 2<br>0.67% | 1<br>0.33% | 33<br>11.00% | 36<br>12.00% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| مەخمـوور | 1 0.33% | 0 0.00% | 9 3.00% | 10 3.33% |
| هـەولـێر | 0 0.00% | 1 0.33% | 7 2.33% | 8 2.67% |
| كـۆيـە | 0 0.00% | 0 0.00% | 2 0.67% | 2 0.67% |
| كفـری | 1 0.33% | 3 1.00% | 23 7.67% | 27 9.00% |
| خـانەقين | 0 0.00% | 0 0.00% | 8 2.67% | 8 2.67% |
| كـەركـوك | 5 1.67% | 4 1.33% | 31 10.33% | 40 13.33% |
| توزخورماتوو | 1 0.33% | 0 0.00% | 11 3.67% | 12 4.00% |
| زاخـــۆ | 1 0.33% | 0 0.00% | 6 2.00% | 7 2.33% |
| ئـامێـدی | 1 0.33% | 4 1.33% | 28 9.33% | 33 11.00% |
| دهـــۆك | 1 0.33% | 2 0.67% | 16 5.33% | 19 6.33% |
| شـــنگار | 1 0.33% | 1 0.33% | 4 1.33% | 6 2.00% |
| كـۆی گشـتی | 18 6.00% | 20 6.67% | 262 87.33% | 300 100.00% |

## ١٧ـ شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش راگواستن لەگەڵ رێژەی هاوسەرێتی

لە خشتەی ژمارە(٣٦)دا کە داتاکانی تایبەت بەو دوو پرسیارەی کە نموونەکەمان پێشراگواستن لە سنووری چ قەزایەك دادەنیشتن؟ و ئایا پێیان وایە شووکردن و ژنهێنان پێش راگواستن یان دوای راگواستن ئاسانترە؟

خشتەی ژمارە (٣٦) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە پێش راگواستن لەگەڵ رێژەی هاوسەرێتی

| هاوسەرگیری / قەزا | پێش راگواستن ئاسانتر بوو | دوای راگواستن ئاسانتر بوو | وەکو یەك وابوو | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| کەرکوك | 29 9.67% | 10 3.33% | 1 0.33% | 40 13.33% |
| هەڵەبجە | 26 8.67% | 10 3.33% | 1 0.33% | 37 12.33% |
| پێنجوین | 4 1.33% | 0 0.00% | 0 0.00% | 4 1.33% |
| سلێمانی | 2 0.67% | 5 1.67% | 0 0.00% | 7 2.33% |
| شارباژێر | 5 1.67% | 0 0.00% | 3 1.00% | 8 2.67% |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| دوكـان | 3 1.00% | 2 0.67% | 1 0.33% | 6 2.00% |
| رانيه | 10 3.33% | 1 0.33% | 1 0.33% | 12 4.00% |
| چـۆمـان | 9 3.00% | 3 1.00% | 3 1.00% | 15 5.00% |
| شـەقـلاوە | 2 0.67% | 1 0.33% | 0 0.00% | 3 1.00% |
| مـێرگەسوور | 20 6.67% | 13 4.33% | 3 1.00% | 36 12.00% |
| مەخمـوور | 9 3.00% | 0 0.00% | 1 0.33% | 10 3.33% |
| هـەولێر | 6 2.00% | 2 0.67% | 0 0.00% | 8 2.67% |
| كـۆيـە | 2 0.67% | 0 0.00% | 0 0.00% | 2 0.67% |
| كـفـری | 7 2.33% | 18 6.00% | 2 0.67% | 27 9.00% |
| خـانەقین | 6 2.00% | 2 0.67% | 0 0.00% | 8 2.67% |
| تووزخورماتوو | 4 1.33% | 8 2.67% | 0 0.00% | 12 4.00% |
| زاخـۆ | 5 1.67% | 1 0.33% | 1 0.33% | 7 2.33% |

| ئـامێدی | 21<br>7.00% | 7<br>2.33% | 5<br>1.67% | 33<br>11.00% |
|---|---|---|---|---|
| دهـــۆك | 11<br>3.67% | 7<br>2.33% | 1<br>0.33% | 19<br>6.33% |
| شـــنگار | 5<br>1.67% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 6<br>2.00% |
| **کـۆی گـشتی** | 186<br>62.00% | 91<br>30.33% | 23<br>7.67% | 300<br>100.00% |

دەبینین زۆرینەی نموونەی باسەکەمان بە ریــژەی ٦٢٪ پێیــان وایــە پێش راگواستن ئــەم کارانــە ئاســانتر پێکدەهــاتن. بــەڵام ئــەوەی لــەم وەڵامەدا جێگەی سەرنجدانە ئەوەیە کە لە کۆی ئەو ٢٧ نموونەیــەی لــە قەزای کەلار وەرگیراون تەنیا ٧ کەسیان ئەم بۆچوونــەیان هەیــە، واتــە نزیکــەی ٤\١ ، هــەروەها لــەو ١٢ کەســەی وەك نموونــە لــە قــەزای تووزخورماتوو وەرگیراون تەنیا ٤ کەســیان واتــە بــە ریـژەی ٣\١ ئــەم بۆچوونــەیان هەیــە. دەشــێ بڵێــین یــان پێشراگواســـتن مەرجــەکانی هاوســەرێتی لــەو دوو ناوچەیــە زۆر قــورس بوونــە یـــاخود ئێســـتا زۆر سوکن.

بەڵام ئەوانــەی پێیــان وایــە دوای راگواســتن ژنــهێنان و شــووکردن ئاسانترن، رێژەکەیان گەیشتووتە ٣٣,٣٠٪ ، پێشتر ئاماژەمان پێکــرد کە دانیشتووی دوو قەزای کەلار و تووزخورماتوو ژمارەیــەکی زۆریــان لەگــەڵ بۆچوونــی پێشــتردا نــەبوون، ئــەوا زۆرینــەیان لەگــەڵ ئــەم بۆچوونەدان. رێژەیەکی بەرچاوی نموونەکانی قەزای دهۆك، مێرگەسوور و سلێمانیش هەمان ئەم بۆچوونەیان هەیە.

کەمترین رێژەی نموونەکەش ئەوانەن کە پێیـــان وایــە جیاوازیــەکی

ئەوتۆ نییە لەمەڕ ژنـهێنان و شـووکردن لـە پێـش ڕاگواسـتن و دوای ڕاگواستن، تێکڕا ژمارەیان ٢٣ کەسە بـە ڕێـژەی ٧,٦٧٪ی نموونەکـە. هیچ یەکێکیش لــە نموونـە وەرگیراوکـانی ئـەم قەزایانـە: پێنجویـن، سلێمانی، شەقلاوە، هەولێر، کۆیە، خانەقین، تووزخورماتوو و شـنگار لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نین.

## ١٨ـ جلوبەرگی پیاوان لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

سەبارەت بە گۆڕانی جلوبـەرگی پیـاوان لـە ئـەنجامی ڕاگواسـتنی کوردەکاندا، بەپشت بەسـتن بـە خشـتەی ژمـارە (٣٧) دەکـرێ بڵێـین گۆڕانێکی گەورە بەسەر جلوبەرگی پیاودا هاتووە. لە کـۆی ئـەو ٣٠٠ کەسـەی وەك نموونــە وەرگـیراون تـەنیا ٢ کـەس بـــەڕێژەی ٠,٦٧٪ی نموونەکە پێیان وایە هیچ گۆڕانێك بەسەر جلوبەرگی پیاواندا لــە دوای ڕاگواستن نەهاتووە. یەکێك لەو دوو نموونەیە لە سـاڵی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ ڕاگوێـزراوە و ئـــەویتریان لـــەماوەی نێـــوان ١٩٩١ـ٢٠٠١ دەکـــرێ هەردووکیان خـــەڵکی شـارێکی گـەورە و کۆنـی وەك کـەرکوك بـن و دەمێك بێـت ئـەو گۆڕانـە بەسـەر جلوبـەرگیاندا هـاتبێت. هـەروەها لەبەرئەوەی ڕێژەکە زۆر کەمە دەکرێ فەراموش بکرێت.

ئەوانەی کە پێیان وایە جلوبەرگی پیاوان گۆڕانێکی زۆری بەسـەردا هــاتووە، ڕێژەیـان دەکاتـە ٤٦,٤٧٪ی نموونـەی باسـەکە. زۆرترینـــی ئەمانەش ئەوانەن لە دوو ساڵی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ ڕاگوێـزراون. ئەمـەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە: یەکەم، ئەم کۆمەڵەیە زۆرترین ڕێژەی نموونەکە پێکدەهێنن و دووەم، لەبەرئەوەی زۆربەی هــەرە زۆری ئەمانـە ئـەنفال کراوەکان بوون و کەوتنە نێو هەژاریەکی ڕەهاوە، گۆڕانی زۆر گەورەیان لە هەندێ بواردا بە خۆوە بینـی. ئەوانـەی لـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ ڕاگوێـزراون و پێیـان وایــە گۆڕانێکــی زۆر بەسـەر جلوبەرگەکانیاندا هاتووە ڕێژەیان دەکاتـە ١٥٪ی نموونەکـە. ئەمـەش

ڕێژەیەکی بەرزترە لە ڕێژەی کۆمەڵەی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ بەلەبەرچاو گرتنی ڕێژەی گشتیی هەردووکیان. لەدوای ئەمانەش ڕاگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ دێن، ئەوانەی هەمان ڕای ئەوانەی پێش خۆیانیان هەیە ڕێژەکەیان ٥,٣٣٪ نموونەی باسەکەیە. هەریەکە لە ڕاگوێزراوەکانی دوو کۆمەڵەی ساڵانی ١٩٦٩ـ١٩٧٦ و ١٩٩١ـ٢٠٠١، بە ڕێژەی ٣,٣٣ ٪ پێیان وایە جلوبەرگی پیاوان گۆڕانێکی زۆری بەخۆوە بینیوە.

هەڵبەت بەبینینیش دەتوانین تێبینیی کەمبوونەوەی هەندێك جۆری جلوبەرگی پیاوان یان هەندێك پارچە لە جلوبەرگ لە کوردستانی باشوردا بکەین، بۆ نموونە شالوشەپکی ناوچەی بادینان، کەواو سەڵتەی گەرمیان، یاخود ئەوەی لە بادینان پێی دەڵێن چۆخ و لە هەولێر و سلێمانیش پێی دەڵێن پەستەك، هەروەها جامانە زۆر کەم بۆتەوە بەتایبەتی بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە تا ماوەیەکی درەنگ لە زۆر ناوچەی کوردستان سەرکۆتی مایەی شەرم بووە.

لەبەرامبەر ئەمانەی سەرەوەشدا، زۆرینەی ژمارەی نموونەکەمان پێیان وایە گۆڕانێکی کەم بەسەر جلوبەرگی پیاواندا هاتووە. تێکڕا ٥٢,٦٧٪ ی نموونەی باسەکە لەسەر ئەم بڕوایەن. زۆرترین ڕێژە کە دەکاتە ٢١٪ لەوانەی لەسەر ئەم بڕوایەن دەکەونە نێو گروپی ڕاگوێزراوەکانی ساڵانی ١٩٨٧ـ١٩٨٨، لەدوای ئەمانیش بە ڕێژەی ١٥,٦٧٪ لە کۆمەڵەی ڕاگوێزراوەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ پێیان وایە جلوبەرگی پیاو لەدوای ڕاگواستن کەم گۆڕاوە. ئینجا ڕاگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ بە ڕێژەی ٨,٣٣٪ لەسەر ئەم بڕوایەی سەرەوەن. ڕاگوێزراوەکانی ماوەی نێوان١٩٦٩ـ١٩٧٦ بە ڕێژەی ٥٪ لەگەڵ ئەم بۆچوونەی سەرەوە کوکن. ڕێژەی ٢,٣٣٪ ی ڕاگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٩ـ١٩٩٠ یش هەمان ڕایان هەیە.

## خشتەی ژمارە (٣٧) جلوبەرگی پیاوان لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

| جلوبەرگی پیاوان دوای ڕاگواستن / ساڵی ڕاگواستن | نـەگۆڕاون | زۆر گۆڕاون | کـەم گۆڕاون | کـۆی گشـتی |
|---|---|---|---|---|
| 1969-1976 | 0 0.00% | 10 3.33% | 15 5.00% | 25 8.33% |
| 1977-1979 | 0 0.00% | 45 15.00% | 47 15.67% | 92 30.67% |
| 1980-1986 | 0 0.00% | 16 5.33% | 25 8.33% | 41 13.67% |
| 1987-1988 | 1 0.33% | 55 18.33% | 63 21.00% | 119 39.67% |
| 1989-1990 | 0 0.00% | 4 1.33% | 7 2.33% | 11 3.67% |
| 1991-2001 | 1 0:33% | 10 3.33% | 1 0.33% | 12 4.00% |
| کـۆی گشـتی | 2 0.67% | 140 46.67% | 158 52.67% | 300 100.00% |

## ١٩ـ جلوبەرگی ئافرەتان لەگەڵ ساڵی راگواستن

لە خشتەی ژمارە (٣٨)دا بە پێچەوانەی خشتەی ژمارە (٢٩) کە تایبەت بوو بە گۆڕانی جلوبەرگی پیاوان، نموونەی باسەکەمان زێتر پێیان وایە کە جلوبەرگی ئافرەتان گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە. هەروەها هیچ کەسێك نییە پێی وابێت جلوبەرگی ئافرەتان نەگۆڕاوە. بە چاودێریکردنێکی سەرپێیانەش دەردەکەوێ کە جلوبەرگی ئافرەتان زۆر گۆڕاوە، جلوبەرگی مۆدە کە جاران تەنیا لە شارەکان و زیاتر لە لای توێژی گەنج دەبینرا، ئەمڕۆ بەشێوەیەکی زۆر زێتر بڵاوبوتەوە و ئەو گوندانەش زۆر کەمن کە ئەم جلوبەرگەی پێ نەگەیشتبێت تەنانەت ئەگەر لەڕێی مامۆستای قوتابخانەکانیشەوە بێت. پەچە لە چەند شوێنێکی زۆر کەم بەدەگمەن ماوە. هەروەها عەبای رەشی ئافرەتان کە لە زۆربەی ناوچە لادێنشینەکاندا نەبوو، ئێستا لە هەموو شوێنێك هەیە، جگە لەوەی کە مۆدێل و جۆری قوماشی ئافرەتان رۆژانە گۆڕانیان تێدەکەوێت.

تێکڕا ژمارەی ئەوانەی پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتە کوردەکان لەدوای راگواستن زۆر گۆڕاوە، رێژەیان ٥٨٪، زۆرترین ژمارەش دەکەوێتە ناو گروپی راگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ (لەبەر هەمان ئەو هۆیەی لە راڤەی خشتەی پێشتردا باسکرا) لەدوای ئەوان هەروەك خشتەی پێشوو راگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ دێن، رێژەی ئەمانیش ٢٠٪ کە نزیکەی دوو هێندەی ئەوانەن کە لە هەمان ئەو ساڵانەدا وەڵامی گۆڕاوەکەی دیکەیان داوەتەوە. دوای ئەوانیش کۆمەڵەی راگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦، بە رێژەی ٧,٣٣٪ پشتگیری لە بۆچوونی سەرەوە دەکەن. ئەوانەی لەماوەی نێوان ١٩٩١ـ٢٠٠١یش راگوێزراون بە رێژەی ٣,٣٣٪ پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتان زۆر گۆڕاوە. ٨ کەسیش بە رێژەی ٢,٦٧٪ کە دەکەونە نێو

راگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ١٩٦٩ـ١٩٧٦، و لە راگوێزراوەکـانی دوو ساڵی ١٩٨٩ـ١٩٩٠یش بە رێژەی ١,٦٧٪ هەمان بۆچوونیان هەیە.

**خشتەی ژمارە (٣٨) جلوبەرگی ئافرەتان لەگەڵ ساڵی راگواستن**

| جلوبەرگی ئافرەتان / ساڵی راگواستن | زۆر گۆڕاون | کەم گۆڕاون | **کۆی گشتی** |
|---|---|---|---|
| 1969-1976 | 8<br>2.67% | 17<br>5.67% | 25<br>8.33% |
| 1977-1979 | 60<br>20.00% | 32<br>10.67% | 92<br>30.67% |
| 1980-1986 | 22<br>7.33% | 19<br>6.33% | 41<br>13.67% |
| 1987-1988 | 69<br>23.00% | 50<br>16.67% | 119<br>39.67% |
| 1989-1990 | 5<br>1.67% | 6<br>2.00% | 11<br>3.67% |
| 1991-2001 | 10<br>3.33% | 2<br>0.67% | 12<br>4.00% |
| **کۆی گشتی** | 174<br>58.00% | 126<br>42.00% | 300<br>100.00% |

لەلایەکی دیکەشەوە ئەوانەی پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتـان کـەم گۆڕاوە رێژەیان ٤٢٪ـە، رێژەی ١٦,٦٧٪ی راگوێزراوەکانی دوو سـاڵی

١٩٨٧ـ ١٩٨٨ لەم بڕوایەدان. هەروەها ١٠,٦٧٪ی ڕاگوێزراوەکانی سالآنی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ لەسەر هەمان بڕوان. لەدوای ئەوانیش ئەوانە دێن کە لە ماوەی نێوان ١٩٨٠ـ١٩٨٦ ڕاگوێزراون. ٢٢ کەس بە ڕێژەی ١٠,٦٧٪ پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتان کەم گۆڕاوە. ئینجا ئەوانەی لە سالآنی١٩٦٩ـ١٩٧٦ ڕاگوێزراون بە ڕێژەی ٥,٦٧٪ پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتان کەم گۆڕاوە لە ژمارەی ئەوانە زۆرترە یان گەلێ زۆرترە کە پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتان زۆر گۆڕاوە. ئەم کۆمەڵەیە لەم بارەیەوە تەواو بەپێچەوانەی ئەو ڕاگوێزراوانە بیردەکەنەوە کە لە ساڵەکانی١٩٧٧ـ١٩٧٩ ڕاگوێزراون، ئەمەش جێگەی تێڕامانە بەتایبەتیش کاتێك دەبینین ماوە زەمەنییەکەیان زۆر لەیەکتر نزیکە، بۆیە ڕەنگە جیاوازیەکە بگەڕێتەوە بۆ شێوازی ڕاگواستنی ئەم دوو کۆمەڵەیە و ئەو ژینگەیەی ئەمانی بۆ ڕاگوێزراون یان لێی ڕاگوێزراون و بارە ئابووریەکەیان. هەردوو کۆمەڵەی دیکەش بە ڕێژەی ٢٪ لە ڕاگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٨ـ١٩٨٩ هەروەها بە ڕێژەی ٠,٦٧٪ لە کۆمەڵەی ڕاگوێزراوەکانی سالآنی ١٩٩١ـ٢٠٠١ پێیان وایە جلوبەرگی ئافرەتان زۆر گۆڕاوە.

## ٢٠ـ جلوبەرگی گەنجان لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

خشتەی ژمارە (٣٩) تایبەتە بە گۆڕانی جلوبەرگی گەنجەکان لەگەڵ گۆڕاوی ساڵی ڕاگواستنی نموونەکە، جیاوازیەکەی لەگەڵ دوو خشتەکەی پێشوو ئەوەیە، زۆربەی هەرە زۆری نموونەکە پێی وایە جلوبەرگی گەنجان زۆر گۆڕاوە، هەڵبەت هۆکارەکانی گۆڕانی جلوبەرگی گەنجان کەم نین، بەڵام قوتابخانە ڕۆڵێکی زۆری بینیوە لە گۆڕینی جلوبەرگی قوتابییاندا و گەنجەکانیش زۆرینەی ڕەهایان ئەو قۆناغەیان بڕیوە، لە گشت قوتابخانەکان یاخود لە گشت قۆناغەکانی

خوێندندا مەرج نییە قوتابی چ جلوبەرگێك لەبەر بكات، بەڵام وەكو نەریتێكی لێ هاتووە بەتایبەتی لەلای كچان و تەنانەت لە گوندەكانیش جلی رەسمی دەپۆشن و ئەمەش بەرەبەرە رێگەی خۆشكرد بۆ گۆڕانی جلوبەرگی گەنجەكان.

خشتەی ژمارە (٣٩) جلوبەرگی گەنجان لەگەڵ ساڵی راگواستن

| جلوبەرگی گەنجان / ساڵی راگواستن | زۆر گۆڕاون | كەم گۆڕاون | كۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| 1969-1976 | 20<br>6.67% | 5<br>1.67% | 25<br>8.33% |
| 1977-1979 | 80<br>26.67% | 12<br>4.00% | 92<br>30.67% |
| 1980-1986 | 32<br>10.67% | 9<br>3.00% | 41<br>13.67% |
| 1987-1988 | 110<br>36.67% | 9<br>3.00% | 119<br>39.67% |
| 1989-1990 | 11<br>3.67% | 0<br>0.00% | 11<br>3.67% |
| 1991-2001 | 9<br>3.00% | 3<br>1.00% | 12<br>4.00% |
| كۆی گشتی | 262<br>87.33% | 38<br>12.67% | 300<br>100.00% |

بەگشتی، لە خشتەکەدا دەردەکەوێت بە ڕێژەی ٨٧,٣٣٪ نموونەی باسەکە پێیان وایە جلوبەرگی لاوەکان زۆر گۆڕاوە. لەم ڕێژەیەش ٣٦,٦٧٪ لەو ڕاگوێزراوانەن کە لە ساڵەکانی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ ڕاگوێزراون. هەروەها بە ڕێژەی ٢٦,٦٧٪ لەو ڕاگوێزراوانەن کە دانیشتووی پشتێنەی سنووری بوون و لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩دا ڕاگوێزراون. ئەوانەی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦دا ڕاگوێزراون و پێیان وایە جلوبەرگی گەنجان زۆر گۆڕاوە ڕێژەیان ١٠,٦٧٪ی نموونەی باسەکەیە. ٦,٦٧٪ی نموونەکەش لە ڕاگوێزراوەکانی پێش ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ ئەو بۆچوونەی سەرەوە کۆك و تەبان. ئەوەی دەمێنێتەوە بە ڕێژەی ٣,٦٧٪ کە کۆی نموونەی وەرگیراوی ڕاگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٩ـ١٩٩٠ پێکدێنن و ٣٪ی ڕاگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ١٩٩١ـ٢٠٠١ پێیان وایە دوای ڕاگواستن جلوبەرگی گەنجەکان زۆر گۆڕاوە.

لە بەرامبەر ئەمانیشدا تەنیا ١٢,٦٧٪ی نموونەکە پێیان وایە جلوبەرگی گەنجەکان کەم گۆڕاوە. زۆرترین ژمارەی ئەوانەی بەم جۆرەش بیردەکەنەوە لە ڕاگوێزراوە لادێنشینە سەر سنووریەکانن، واتە لە ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩، ڕێژەی ئەمانە دەکاتە ٤٪، دوای ئەوانیش دوو کۆمەڵەی ڕاگوێزراوەکانی ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ و ڕاگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ دێن بەڕێژەی ٣٪ بۆ هەریەکەیان. هەروەها ئەوانەی لە ساڵانی ١٩٦٩ـ١٩٧٦ ڕاگوێزراون بەڕێژەی ١,٦٧٪ هەمان ڕای ئەوانەی سەرەوەیان هەیە، واتە جلوبەرگی لاوان کەم گۆڕاوە.

## ٢١ـ ئاژەڵەکانی نموونەکە لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن

لە خشتەی ژمارە(٤١)دا دەردەکەوێت نموونەی باسەکەمان پێش راگواستن و دوای راگواستن چ جۆرە ئاژەڵێکیان بەخێو کردووە. دەبینین پێشراگواستن زۆرترین رێژەی نموونەکە کە دەکاتە ٣٠٪ مەڕ و بزن و مانگایان بەخێو کردووە، بەڵام ئەوانەی هەمان ئەو ئاژەڵانەیان بەخێو کردوون لە دوای راگواستن رێژەیان تەنیا ٢٪ە، جیاوازیەکە هێندە زۆرە بەراورد ناکرێت. لە دوای ئەوان دەبینین ٢٢٪ی نموونەی باسەکەمان پێشراگواستن تەنیا مەڕ و بزنیان بەخێو کردوون، ئەمانەش بە رێژەیەکی بەرچاو لە دوای راگواستن ژمارەیان کەم بۆتەوە و تەنیا ٦٪ نموونەکە پێکدێنن. و ئەو نموونەیەی پێشراگواستن مەڕ، بزن، چێل و وڵاخ ( بە هەموو جۆرەکانییەوە) یان بەخێو کردووە رێژەیان ١٦٪یە، بەڵام هیچ کەسێك لە نموونەی باسەکەماندا ئاماژەی بەوە نەکردووە کە لەدوای راگواستن ئەم چوار جۆر ئاژەڵەیان پێکەوە بەخێو کردووە. تەنانەت هیچ کەسێکیش ئاماژەی بەوە نەداوە کە وڵاخی لەگەڵ ئاژەڵەکانی دیکە یاخود بەتەنیا بەخێو کردبێت، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە راگواستن رێژەی وڵاخەکانی لە وڵاتەکەماندا بەرەو ئەوپەڕی کەمبوونەوە بردووە. لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاماریدا لەبارەی ئەنفالی بادینان لە ساڵی ١٩٨٨ کە ٥٥٣ خێزان لە پارێزگای دهۆك و ٥٤٠ خێزان لە قەزای مێرگەسوور وەکو نموونە وەرگیراون، دەردەکەوێت برێکی زۆر ئاژەڵیان لەدەست چووە وەك لە خشتەی خوارەوەدا دەردەکەوێت.

خشتەی ژمارە (٤٠) لەدەست چوونی سامانی ئاژەڵی هەندێ لە ئەنفالکراوەکان پیشان دەدات[٢]

| شوێن | پەلەوەر | ژمارەی مانگا و گامێش | ژمارەی مەڕو بزن | ژمارەی وڵاغ | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|---|---|---|
| پارێزگای دهۆك | 8762 | 960 | 4826 | 984 | 553 |
| قەزای مێرگەسوور | 12304 | 1868 | 13221 | 1261 | 540 |

ڕێژەی ١١,٦٧٪ی نموونەی باسەکەمان ئاماژەیان بەوە کردووە کە پێشراگواستن تەنیا مانگایان بەخێو کردووە. ئەم دەستەیە لە دوای ڕاگواستنیش گۆڕانێکی هێندەی بەخۆیەوە نەبینیوە و ڕێژەکەیان ١٠,٦٧٪یە، بەڵام ئەوەی لە هەموویان زێتر گۆڕاوە و ئەوە دەهێنێت هەڵوەستەی لەسەر بکەین ئەوانەن کە هیچ ئاژەڵێکیان بەخێو نەکردووە، ئەمانە پێشراگواستن ١٩,٦٧٪ی ڕێژەی نموونەکە پێکدێنن و دەکرێ زۆربەی زۆریشیان دانیشتووی شار و شارۆچکەکان بن، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە دوای ڕاگواستن خۆی لە قەرەی ٨١,٦٧٪ دەدات، واتە زیاتر لە چوار هێندەی پێش ڕاگواستنیان کە هەڵبەت هەموویان دانیشتووی شار و شارۆچکەکان نین. ڕاستە ئێمە ئەو خەڵکەمان کە بۆ گوندەکانیان گەڕاونەتەوە وەرنەگرتوون، بەڵام زۆربەی زۆری

---

[٢] رؤوف عقراوی، حملة علی البادینان واحوال اللاجئین، دار ئاراس للطباعة والنشر، الطبعة الثانیة، اربیل، ٢٠٠٢، ص ٨٨-٨٩.

نموونەکەمان خەڵکی ئۆردووگـا زۆرەملێکـانن، بەمـەش دەردەکـەوێت ئێستا لە ئوردووگاکانیشدا خەڵکێکی زۆر هەیە ئاژەڵ بەخێو ناکـەن، هەموومانیش ئاگادارین لـە وڵاتەکـەماندا کێلگـەی بـەخێو کردنـی ئاژەڵەکان بۆ سامانی ئاژەڵی نە لە لایەن کەرتی گشتی و نـە کـەرتی تایبەتی بایەخێکی زۆریان پیێ نەدراوە، لە کاتێکدا باشترین ئەتمۆسفێر و ژینگەمان بۆ ئـاژەڵداری مۆدێـرن و کێلگـەی لـەوەڕاندنی ئـاژەڵان هەیە. ئەمەش ئەوە دەگەینێت ئێمە پێویستیمان بە زیادکردنی ژمارەی ئاژەڵەکان هەیە لە کوردستاندا بۆ زۆربوونی سامانی ئاژەڵی.

خشتەی ژمارە (٤١) ئاژەڵەکانی نموونەکە لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن

| ئاژەڵەکان پێش راگواستن / ئاژەڵەکان دوای راگواستن | هیـچ | مـەڕ و بـزن | مـەڕ، بـزن و مـانگـا | مـانگـا | کـۆی گشـتی |
|---|---|---|---|---|---|
| هیـچ | 53<br>17.67% | 3<br>1.00% | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 59<br>19.67% |
| مـەڕ و بـزن | 55<br>18.33% | 9<br>3.00% | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 66<br>22.00% |
| مـەر، بـزن و مـانگـا | 69<br>23.00% | 6<br>2.00% | 4<br>1.33% | 11<br>3.67% | 90<br>30.00% |
| مـەڕ، بـزن، مـانگا و وڵاخەکـان | 39<br>13.00% | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 11<br>3.67% | 50<br>16.67% |
| مـانـگـا | 29<br>9.67% | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 5<br>1.67% | 35<br>11.67% |
| کـۆی گشـتی | 245<br>81.67% | 18<br>6.00% | 6<br>2.00% | 31<br>10.33% | 300<br>100.00% |

**٢٢- لە خواترسی لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن لەگەڵ هۆی لەخواترسی**

لە خشتەی ژمارە (٤٢) دا کە تایبەتە بە وەڵامی دوو پرسیار لەبارەی ئەوەی خەڵکی کوردستان ئێستا یان پێشراگواستن لەخواترسترن؟ لەگەڵ هۆیەکەی، دەردەکەوێت کە ١٩١ کەس بە رێژەی ٦٣,٦٧٪ نموونەی باسەکە پێیان وایە خەڵکی کوردستان پێش راگواستنیان واتە ئەو کاتەی لەسەر رێوشونی خۆیان بوون، دیندارتر و لە خواترستر بوون. بە رێژەی ٩,٦٧٪ نازانن هۆیەکەی چیە، بەڵام زۆرترین رێژە کە دەکاتە ٢٠,٦٧٪ کەس پێیان وایە هۆیەکەی بۆ دڵپاکی و نەبوونی فرتوفێل لای لادێنشینان دەگەڕێتەوە. ٤٣ کەسیشیان بە رێژەی ١٤,٣٣٪ پێیان وایە ئەوەی وای دەکرد خەڵکی لە کاتی خۆیدا لەخواترستر بن هۆکاری کۆمەڵایەتیە (تێکەڵاوی کەم، سەرقاڵی رۆژانە، سەردان و پەیوەندیە خزمایەتییەکان و کاریگەری باوان). لە دوای ئەوانیش بە رێژەی ٨٪ پێیان وایە خەڵکی لە لادێ هوشیاری ئایینیان زێتر بووە و لەدوای راگواستن خەڵکی کەمتر ئاوڕ لە خوێندنی ئایینی دەدەنەوە و کەمتر بایەخ بە مەعریفەی ئایینی دەدەن. بە رێژەی ٦٪ی نموونەکەش هۆیەکەی بۆ کاریگەری مزگەوتەکان و رۆڵی مامۆستای ئایینی لە لادێکاندا دەگێڕنەوە، هەروەك روون و دیاریشە جاران مامۆستای ئایینی رۆڵێکی زۆر بەرچاوی لە لادێ گێڕاوە و ئەم رۆڵەی ئەو تەنیا لە کایەی ئاییندا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو رۆڵێکی بەرچاوی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی لادێدا دەگێڕا. کەمترین ژمارەی ئەوانەش کە پێیان وایە جاران خەڵك لە خواترستر بوون، دەکاتە ١٥ کەس بە رێژەی ٥٪، ئەوان بۆیە وای بۆ دەچن، چونکە ئەو کات راگەیاندن بەتایبەتیش تەلەڤزیونەکان لە کۆمەڵگادا بوونێکی ئەوتۆیان نەبوو، واتە ئەم کەسانە پێیان وایە

راگەیاندن رۆڵێکی سلبی هەبووە لە کەم کردنەوەی دینداری و لە خواترسی بۆیە کەمی تەلەڤزیون رۆڵی هەبووە لە سەر دینداری تاکەکانی کۆمەڵگا لە پێش راگواستن.

لە بەرامبەر ئەمانەی سەرەوەشدا ١٠٩ کەس بە ریژەی ٣٦,٦٧٪ پێیان وایە دوای ئەوەی خەڵکی لە زێدی خۆیان راگوێزران، دیندارتر و لەخواترسترن. ٦,٦٧٪ لە ریژەی سەرەوە نازانن هۆیەکەی چییە، زۆرترین ریژەشیان کە دەکاتە ٢١,٣٣٪ پێیان وایە هۆیەکەی بۆ هۆشیاری ئیسلامی دەگەڕێتەوە، واتە ئەو بێداربوونەوەیەی بەتایبەتی لە دەیەی نەوەدەکانی سەدەی رابردوو کوردستانی باشوری گرتەوە.[٣] هەروەها بە ریژەی ٥,٦٧٪یش پێیان وایە زۆربونی ژمارەی مزگەوت و دەرکەوتنی مامۆستای ئایینی شارەزا و وتاربێژی بەتوانا و راگەیاندنی ئیسلامی وایکردووە دینداری لە کوردستاندا زێدە ببێت. لە ساڵی ١٩٩٢وە تا ساڵی ٢٠٠٠ (٣٢) مزگەوت لەناو شاری هەولێر دروستکراون، ژمارەیەکی زۆری مزگەوتەکانی دیکەش نۆژەنکردنەوە و گەورەکردنیان بەخۆوە بینیوە.٤ بە ریژەی ٢,٦٧٪ نموونەی باسەکەش زیاتر ئاماژە بە ململانێکانی ناو دێ و رۆڵی هۆکارەکانی راگەیاندن دەکەن و پێیان وایە بە کەمبوونەوەی یەکەم و زۆربوونی دووەم (رۆڵی راگەیاندن) لەدوای راگواستن خەڵك دیندارتر بووە.

---

[٣] لە بارەی ئەم بێداربوونەوەیە بگەڕێوە بۆ: ئایین و ناسیۆنالیزم: موسڵح عەبدولقەهار ئیروانی، رۆڵ و کاریگەری و پەیوەندی نێوانیان لەدوای راپەڕینی ١٩٩١ لە هەرێمی کوردستاندا، ماستەرنامە، ل ٨٦ـ٩٤

٤ هەمان سەرچاوە، ل ٨٨. هەروەها لە لاپەرە ٨٩ باس لە کاریگەریی مامۆستا ئایینییەکان کراوە.

خشتەی ژمارە (٤٢) لە خواترسی لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن لەگەڵ هۆی لەخواترسی.

| خەڵك لە خواترستر بوو / هۆیەکەی | پێش ڕاگواستن | دوای ڕاگواستن | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| مزگەوت و مەلاکان زۆرتر بوون | 18 6.00% | 17 5.67% | 35 11.67% |
| هۆشیاری ئایینی بەرزتر بوو | 19 6.33% | 61 20.33% | 80 26.67% |
| دڵەکان پاکتر بوون | 62 20.67% | 3 1.00% | 65 21.67% |
| ڕۆڵی ڕاگەیاندن | 15 5.00% | 2 0.67% | 17 5.67% |
| هۆکاری کۆمەڵایەتی | 43 14.33% | 3 1.00% | 46 15.30% |
| هۆشیاری و خوێندەواری | 5 1.67% | 3 1.00% | 8 2.67% |
| بێ وەڵام | 29 9.67% | 20 6.67% | 49 16.33% |
| کۆی گشتی | 191 63.67% | 109 36.33% | 300 100.00% |

## ٢٣- پیشەی نموونەی باسەکە لەدوای راگواستن لەگەڵ گەڕانەوە

لە خشتەی ژمارە (٤٣)دا پرسیار لە دوو گۆڕاو کراوە، یەکێکیان پیشەی نموونەکە لە دوای راگواستن و ئەویتر ئایا کێ (پیر، لاو، هەردووکیان، هیچ کامێکیان) حەزی لە گەڕانەوەیە بۆ زێدەکەی؟ سەبارەت بە پرسیاری یەکەم، دەبینین فەرمانبەرەکان زۆرترین رێژەی نموونەکەمان پێکدێنن کە دەکاتە ١٩,٦٧٪، لەم گروپە ١٣,٣٣٪ پێیان وایە پیرەکان حەزیان لە گەڕانەوەیە بۆ شوێنی جارانیان، ئەمەش رێژەیەکی بەرزە. هەروەها ئەو ئافرەتانەی کابانن یاخود کاری ماڵەوە دەکەن ١٨,٣٣٪ی نموونەی باسەکە پێکدێنن، ١٤٪ ئەم ئافرەتانەش دەڵێن بەتەمەنەکان حەزیان لە گەڕانەوەیە بۆ زێدەکەیان. لەدوای ئەوان کاسبکارەکان (دوکاندار، ئەوانەی کاری سەرپێیی دەکەن، بارهەڵگر، ئەوانەی کاری جیاجیا دەکەن) سێیەمین دەستەی نموونەکەمان پێکدێنن بە رێژەی ١٦,٦٧٪، لەم دەستەیەشدا رێژەی ١٠,٣٣٪ هەمان رایان بەرامبەر بە گەڕانەوەی بەتەمەنەکان هەیە. بەڵام رێژەی ئەوانەی قوتابین دەکاتە ١٣٪، رێژەیەکی بەرزی ئەمانەش واتە ٩٪ پێیان وایە بەتەمەنەکان حەزیان لە گەڕانەوەیە بۆ شوێنی جارانیان و ژینگەی نوێیان پێ خوش نییە. لەدوای ئەم گروپە پیشەکارەکان دێن بە رێژەی ١٠,٣٣٪، زۆرینەی ئەمانەش بە رێژەی ٧,٦٧٪ هەمان بۆچوونیان سەبارەت بە بەتەمەنەکان هەیە. بێکارەکانیش چ ئەوانەی لەبەر پیری و پەککەوتەیی کاریان پێ ناکرێت یان ئەوانەی هیچ کارێکیان دەست ناکەوێت رێژەیەکی زۆر نزیک لە رێژەی پێشتر (پیشەکارەکان) پێکدێنن، واتە ١٠٪، نزیکەی نیوەی ئەمانیش بە رێژەی ٥,٣٣٪ پێیان وایە بەتەمەنەکان بە تەمای گەڕانەوەن بۆ شوێنی پێش راگواستنیان، رێژەی دواتر کە دەکاتە ٦,٦٧٪ پێشمەرگەکانن، نیوەی ئەمانیش رای ئەوانەی پێش خۆیان

هەیە. دوا ڕێژەش کە کەمترین ڕێژەی نموونەکەیە (٥,٣٣%) ئەوانەن کە خەریکی کاری کشتوکاڵین. کەمتر لە نیوەی ئەم ڕێژەیە، واتە تەنیا ٢,٣٣% پێیان وایە بەتەمەنەکان حەزیان لە گەڕانەوەیە بۆ شوێنی جارانیان.

هەروەکو باسمان کرد زۆرینەی نموونەی باسەکەمان بە ڕێژەی ٦٥,٣٣% لەگەڵ ئەوەدان بەتەمەنەکان بەتەمای گەڕانەوەن ، ئەمەش شتێکی ئاساییە. ئەوانەی زۆربەی تەمەنیان لە شوێنێك بەسەربردووە، زۆربەی یادگاریەکانیان لەوێن و ئەوێ زۆرترین پانتایی خەیاڵی ئەوانی داگیرکردووە و خوویان بە دار و بەردی ئەوێوە گرتووە. حەزیان لە گەڕانەوە دەبێت بۆ ئەوێ.

خشتەی ژمارە (٤٣) پیشەی نموونەی تۆژینەوەکە لەدوای ڕاگواستن لەگەڵ گەڕانەوە

| کێ دەگەڕێتەوە / پیشەی نموونەکە لەدوای ڕاگواستن | بەتەمەنەکان | گەنجەکان | هەردووکیان | هیچ کامیان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| بێکار | 16 5.33% | 3 1.00% | 7 2.33% | 4 1.33% | 30 10.00% |
| کاسبکار | 31 10.33% | 5 1.67% | 12 4.00% | 2 0.67% | 50 16.67% |
| کاری ماڵەوە | 42 14.00% | 3 1.00% | 4 1.33% | 6 2.00% | 55 18.33% |

| جووتیار | 7<br>2.33% | 3<br>1.00% | 5<br>1.67% | 1<br>0.33% | 16<br>5.33% |
|---|---|---|---|---|---|
| قوتابی | 27<br>9.00% | 2<br>0.67% | 6<br>2.00% | 4<br>1.33% | 39<br>13.00% |
| پێشمەرگە | 10<br>3.33% | 0<br>0.00% | 8<br>2.67% | 2<br>0.67% | 20<br>6.67% |
| فەرمانبەر | 40<br>13.33% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% | 6<br>2.00% | 59<br>19.67% |
| پیشەکار | 23<br>7.67% | 3<br>1.00% | 4<br>1.33% | 1<br>0.33% | 31<br>10.33% |
| **کۆی گشتی** | 196<br>65.33% | 20<br>6.67% | 58<br>19.33% | 26<br>8.67% | 300<br>100.00% |

له بەرامبەر ڕێژە زۆرەکەی سەرەوەدا تەنیا ٦,٦٧٪ی نموونەکەمان پێیان وایە لاوەکان حەزیان لە گەڕانەوەیە هۆیەکەش ئەوەیە لەگەڵ ژینگەی نوێ ڕاهاتوون و زەحمەتە بتوانن وەکو دایك و باوکەکانیان لەگەڵ ژینگەی کۆن ڕابێن، چونکە ژینگەی کۆن (لادێ) ژینگەیەکی دیکەی جیاوازە و هەلومەرج و تایبەتمەندی تایبەت بە خۆی هەیە. دوای ئەمانە ڕێژەیەکی بەرزتر کە دەکاتە ١٩,٣٣٪ی نموونەکە پێیان وایە هەردوولا پیر و لاوەکان پێکەوە حەزیان لە گەڕانەوەیە بۆ شوێنی جارانیان. ڕێژەیەکی بەرچاویش کە دەکاتە ٨,٦٧٪ بە پێچەوانەی دەستەی پێشوو پێیان وایە هیچ یەکێکیان نە پیرەکان و نە لاوەکان نایانەوێت بگەڕێنەوە بۆ شوێنی جارانیان و ژینگەی نوێیان پێ خۆشترە.

## ٢٤ـ بەراوردی ژیانی نموونەکە لەنێوان دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن لەگەڵ ساڵی راگواستن

لە خشتەی ژمارە (٤٤)، پەیوندی نێوان ساڵی راگواستن و بەراوردی ژیانی پێش راگواستن و دوای راگواستن دەردەکەوێت. واتە ئایا راگوێزراوەکان چ جیاوازیەك لە نێوان ئەو دوو قۆناغەی ژیانیاندا دبینن. بەر لەوەی داتاکان بخەینە ڕوو پێویست دەکات ئاماژە بەوە بکەین کە لەکاتی تاوتوێ کردنی داتاکان هەستمان کرد خەڵکی ئێمە زۆر کەم دەتوانن بەدەنگ بێن و باسی ژیانیان بکەن، هەر ئەوەشە بۆ نموونە وایکرد ١٤,٦٧٪ی نموونەکەمان تەنیا وشەیەکیشیان پێ نەگوترا و ئەو پرسارەیان بەگشتی فەراموش کرد، ئەوانی دیکەش تەنیا لە سەر یەك دوو شت دەوەستان و بەلای زۆربەی شتەکاندا نەدەچوون.

ڕێژەیەکی بەرزی نموونەی تۆژینەوەکە بە ڕێژەی ٢٥,٣٣٪ پێیان وایە ژیانیان پێشراگواستن خوشتر و ئارامتر بوو، لەمانەش زۆرترینیان بە ڕێژەی ١١,٣٣٪ی راگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ بوون، هۆیەکەشی ڕەنگە زیاتر بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەمانە بەزۆری ئەنفالکراوەکان بوون، ئەنفالکراوەکانیش دوای نیشتەجێ کردنیان لە ئوردووگا زۆرەملێکاندا دووچاری خراپترین ڕەوشی ژیان هاتن. هەروەها لە کۆی ئەوانەی ساڵانی ١٩٦٩ـ١٩٧٦ راگوێزراون، زۆریان واتە ١٠ کەس بە ڕێژەی ٣,٣٣٪ جەخت لەسەر هەمان بۆچوون دەکەنەوە. کەچی لەو ١٢ کەسەی لە دوو ساڵی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ راگوێزراون و خەڵکی ناوچەی قەلادزێ و مێرگەسوورن، تەنیا یەك کەس بە ڕێژەی ٠,٣٣٪ لە کۆی ٤٪ پێی وایە جاران ژیانیان خوشتر و ئارامتر بووە. دوای ئەمانیش بە ڕێژەی ١٤٪ نموونەی تۆژینەوەکە پێیان وایە ژیانیان دوای راگواستن ئارامترە وەك پێش راگواستن، زۆربەی ئەوانەی ئەم

وەڵامەیان داوەتەوە لەو راگوێزراوانەن کە لە دوو ساڵی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ راگوێزراون و رێژەیان ٦,٣٣٪ یە. هەروەها نیوەی ئەوانەی لە دەستەی راگوێزراوەکانی دوای ساڵی ١٩٩١، بە رێژەی ٢٪ پێیان وایە دوای راگواستن ژیانیان خۆشتر و ئارامترە. دەکرێ ئەوەش بەوە لێکبدەینەوە کە ئەوان پێش راگواستن لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەعسدا ژیانیان دەگوزەراند، بە زەحمەتیش خەڵکێك دەدۆزرێتەوە بەتایبەتی لە دوای شەڕی دووەمی کەنداو و ئەگەر کوردیش بێت لەژێر سایەی ئەو رژێمەدا هەستی بە ئارامی کردبێت. کەمترین رێژەش کە ئاماژەیان بەم جیاوازیە کردبێت رێژەیان ٠,٦٧٪ە لەو راگوێزراوانەی لە دوو ساڵی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ راگوێزراون.

رێژەی ١٤٪ی نموونەی باسەکەمان باس لەوە دەکەن کە ئێستا، واتە دوای ئەوەی راگوێزراون شارەزاییان لە بوارەکانی ژیاندا زێتر و شارستانیترن بە بەراورد لەگەڵ پێش راگواستن. زۆرترین رێژەی ئەمانەش کە دەکاتە ٥,٣٣٪ ئەوانەن کە خەڵکی سەرسنوورەکانن و لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ راگوێزراون، رەنگە هۆیەکەشی بۆئەوە بگەڕێتەوە کە ئەمان پێش راگواستن بەتەواوی فەراموشکرابوون لەڕووی خزمتگوزاریەکانەوە و حکومەت بایەخی پێنەدەدان. هەروەها ئەوانەی لە ساڵەکانی ١٩٨٩ و ١٩٩٠یش بە نموونەی باسەکە وەرگیراون زۆرترینیان واتە ١,٦٧٪ ئاماژەیان بەم خاڵە کردوە، دەبێت ئەوەش لەبیرنەکەین کە خەڵکی راگوێزراوی ئەم دوو ساڵەش دیسان دانیشتووی سەرسنوورەکانی عێراق ـ ئێران و عێراق ـ تورکیان، بەڵام تەنیا یەك کەس بە رێژەی ٠,٣٣٪ لە کۆی ٢٥ کەس لەوانەی لەماوەی نێوان ١٩٦٩ـ١٩٧٦ راگوێزراون ئاماژەیان بەم خاڵە کردووە، ئەمەش رەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە بەر لەو ساڵە زیاتر خەڵکی شارەکان و ناوچە بەعەرەبکراوەکان رادەگوێزران هەروەها

ئەوانـەی دەکەوتنـە نـاو قووڵاییـەکانی خـاکی عـێراق وەکـو ناوچـە سەرسنوورییەکان بێبەش نـەبوون لـە خزمەتگوزاریـەکانی وەك جـادە، کارەبا، هەردوو بواری پەروەردە و تەندروستی. لە لایەکی دیکەشەوە بە ڕێژەی ٩,٣٣٪ نموونەکە پێیان وایە لـەدوای ڕاگواسـتن بـەهاکانی وەك ڕاسـتگۆیی، برادەرایـەتی، خزمایـەتی، وەفـاداری و... کەوتونەتـە قەیرانەوە و لەم بارەشەوە بێزاری خۆیان پیشان دەدەن. نیوەی ئەمانە بە ڕێژەی ٤,٦٧٪ نموونەکە لەو ڕاگوێزراوانەن کـە لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٧٧ ـ ١٩٧٩ ڕاگوێزراون، بەڵام هیچ یەکێك لە ڕاگوێزراوەکانی دوو کۆمەڵەی ساڵەکانی ١٩٨٩ و ١٩٩٠ و ئەوانەی ساڵانی ١٩٩١ـ٢٠٠١ ئاماژەیان بەم خاڵە نەکردوە.

### خشتەی ژمارە (٤٤) بەراوردی نێوان پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

| ساڵی ڕاگواستن / بەراوردی نێوان پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن | 1969-1976 | 1977-1979 | 1980-1986 | 1987-1988 | 1989-1990 | 1991-2001 | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بێ وەڵام | 6<br>2.00% | 17<br>5.67% | 7<br>2.33% | 12<br>4.00% | 1<br>0.33% | 1<br>0.33% | 44<br>14.67% |
| دوای ڕاگواستن خەڵك ئارامترە | 1<br>0.33% | 9<br>3.00% | 5<br>1.67% | 19<br>6.33% | 2<br>0.67% | 6<br>2.00% | 42<br>14.00% |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دوای راگواستن مادده بەسەر خەڵکدا زاڵ بووە | 5<br>1.67% | 7<br>2.33% | 3<br>1.00% | 11<br>3.67% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 27<br>9.00% |
| دوای راگواستن کێشەکان زیاترن، خەڵکیش هۆشیارتر و خوێندەوارترن | 0<br>0.00% | 12<br>4.00% | 4<br>1.33% | 8<br>2.67% | 0<br>0.00% | 1<br>0.33% | 25<br>8.33% |
| دوای راگواستن کێشەکان زۆرن | 1<br>0.33% | 2<br>0.67% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% | 1<br>0.33% | 0<br>0.00% | 17<br>5.67% |
| جاران خەڵك راستگوتر بوون، بە وەفاتر بۆ خزم و ناسیاوەکان بوون | 1<br>0.33% | 14<br>4.67% | 3<br>1.00% | 10<br>3.33% | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 28<br>9.33% |
| جاران ژیان خۆشتر بوو، ئێمەش ئارامتر | 10<br>3.33% | 15<br>5.00% | 11<br>3.67% | 34<br>11.33% | 1<br>0.33% | 4<br>1.33% | 75<br>25.00% |
| دوای راگواستن بەهۆی تێکەڵاوی شارەزاترو شارستانیترین | 1<br>0.33% | 16<br>5.33% | 7<br>2.33% | 13<br>4.33% | 5<br>1.67% | 0<br>0.00% | 42<br>14.00% |
| کۆی گشتی | 25<br>8.33% | 92<br>30.67% | 41<br>13.67% | 119<br>39.67% | 11<br>3.67% | 12<br>4.00% | 300<br>100.00% |

هەروەها ڕێژەی ٩٪ی نموونەکە باس لەوە دەکەن کە دوای ڕاگواستن وێڕای ئەوەی خەڵکی هۆشیارترن، بەڵام پارەوپوول بەسەر بیرکردنەوەیاندا زاڵ بووە. لەم بارەیشەوە دیسان دوو کۆمەڵەی ڕاگوێزراوەکانی ساڵانی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ و ١٩٧٧ـ١٩٧٩ زۆرترین ئاماژەیان بەم خاڵە کردووە، یەکەمیان بە ڕێژەی ٣,٦٧٪ و دووەمیان بە ڕێژەی ٢,٣٣٪ . ڕێژەی ٨,٣٣٪ی نموونەکەش دەڵێن وێڕای ئەوەی خەڵکی ئێستا خوێندەوارتر و زیاتر ئاگاداری جیهانن هوشیاریشیان زێترە کێشە و گیروگرفتەکانیش لە جاران زێترن. لەمانەش بە ڕێژەی ٤٪، نزیکەی نیوەی کۆی ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە لەوانەن لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩دا ڕاگوێزراون و هیچ کەسێکیش لەوانەی ساڵەکانی ١٩٨٩ـ١٩٩٠ ڕاگوێزراون ئاماژەیان بەم خاڵە نەکردووە. کەمترین ڕێژەی نموونەکەش بە ڕێژەی ٥,٣٣٪ هەر ئەوەندەیان گوتووە کە ئێستا بەپێچەوانەی پێش ڕاگواستن گیروگرفت زۆرن، زۆربەی ئەمانەش بە ڕێژەی ٤٪ لەوانەن لە دوو ساڵی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ ڕاگوێزراون.

## ٢٥ـ جیاوازیی ژیانی نموونەکە لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

خشتەی ژمارە (٤٥) پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو دەردەخات: یەکەم، ساڵی ڕاگواستن. دووەم، جیاوازی ژیانی ڕاگوێزراوەکان لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن.

ڕێژەیەکی زۆر بەرزی نموونەکەمان کە دەکاتە ٨٤,٣٣٪ پێیان وایە ژیانیان دوای ڕاگواستن جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ژیانیان لەو کاتەی هێشتا ڕانەگوێزرابوون. هەروەها ژمارەیەکی دیکە بە ڕێژەی ١٢,٣٣٪ پێیان وایە ژیانیان دوای ڕاگواستن جیاوازیەکی کەمی هەیە لەگەڵ ژیانیان لە قۆناغی پێش ڕاگواستن. ئەوانەی پێیانوایە ژیانیان وەك پێش ڕاگواستنە یان هیچ جیاوازیەك نییە و هیچ گۆڕانێك ڕووی نەداوە تەنیا ٣,٣٣٪ نموونەی باسەکە پێکدەهێنن.

## خشتەی ژمارە (٤٥) جیاوازیی ژیانی نموونەکە لەگەڵ سالّی راگواستن

| ژیانی ئێستامان / سالّی راگواستن | زۆر جیاوازە لەگەڵ پێش راگواستن | جیاوازیەکەی لەگەڵ پێش راگواستن کەمە | وەکو پێش راگواستن | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 1969-1976 | 19<br>6.33% | 5<br>1.67% | 1<br>0.33% | 25<br>8.33% |
| 1977-1979 | 77<br>25.67% | 11<br>3.67% | 4<br>1.33% | 92<br>30.67% |
| 1980-1986 | 34<br>11.33% | 4<br>1.33% | 3<br>1.00% | 41<br>13.67% |
| 1987-1988 | 104<br>34.67% | 14<br>4.67% | 1<br>0.33% | 119<br>39.67% |
| 1989-1990 | 11<br>3.67% | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 11<br>3.67% |
| 1991-2001 | 8<br>2.67% | 3<br>1.00% | 1<br>0.33% | 12<br>4.00% |
| **کۆی گشتی** | 253<br>84.33% | 37<br>12.33% | 10<br>3.33% | 300<br>100.00% |

ئەوانـەی سـالآنی ١٩٦٩ـ١٩٧٦ راگوێـزراون و ڕێژەیـان ٨,٣٣٪ی نموونەکەیە، ٦,٣٣٪ پێیان وایە ژیانیـان لەگـەڵ پێـش راگواسـتن زۆر جیـاوازە. بـەڵام ئەوانـەی لـە مـاوەی نێـوان سـالآنی ١٩٧٧ـ١٩٧٩دا راگوێزراون لـە کـۆی ٣٠,٦٧٪ نموونەکـە ٢٥,٦٧٪یـان پێیـان وایـە ژیانیان جیاوازیـەکی زۆری هەیـە لەگـەڵ قۆنـاغی پێـش راگواسـتن. سەبارەت بەو نموونەیـەی لـە سـاڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ راگوێـزراون و ١٣,٦٧٪ی نموونەکە پێکدێنن ١١,٣٣٪یان دەڵێـن جیاوازیەکـە زۆرە. راگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ بـەرزترین ڕێـژە (٣٩,٦٧٪) پێکدێنن، نزیکەی ٣٥٪ لەمانەش دەڵێن ژیانی ئێستایان زۆر جیـاوازە لەگـەڵ پێـش راگواسـتن. تێکـڕای راگوێزراوەکـانی دوو سـاڵی ١٩٨٩ـ١٩٩٠ کە ڕێژەیان ٣,٦٧٪ نموونەکەیە، هەموویان ئامـاژە بـە جیاوازیـەکی زۆری ژیانیـان دەکـەن لـەو دوو قۆناغـە جیـاوازەدا. دوا کۆمەڵەش ئەوانەن کە لـەماوەی نێـوان ١٩٩١ـ٢٠٠١ راگوێـزراون و ٤٪ نموونەکە پێکدێنن، ڕێژەی ٢,٦٧٪ی ئەمانەش باس لەو جیاوازیـە زۆرە دەکەن.

## ٢٦ـ خۆشـی ژیـان لـە دوو قۆنـاغی پێـش راگواسـتن و دوای راگواستن لەگەڵ هۆی خۆشیەکە

لە خشتەی ژمارە (٤٦)دا وەڵامی دوو پرسـیار بـەرچاو دەکـەوێت. یەکەم، ئایا پێـش راگواسـتن یـان دوای راگواسـتن ژیانتـان خوشـتر و ئارامتر بوو، دووەم، پرسیار لە هۆی ئەو خوشی و ئارامیە کراوە.

سەبارەت بە پرسیاری یەکەم، ڕێژەیەکی بەرزی نموونەی تۆژینەوەکـە کە دەکاتە ٨٤,٣٣٪ پێیان وایە بەر لەوەی راگوێزرێن ژیانیان خوشتر و ئارامتر بووە. ئەم ڕێژەیە لە بەرامبـەر ئـەو ڕێژەیـەی پێـی وایـە دوای راگواستن ژیانیـان خوشـتر و ئارامـتر بـووە تـەنیا ١٥,٦٧٪ نموونەکـە پێکدێنێت ڕێژەیەکی زۆر بەرزە، لێرەدا بۆمـان دەردەکـەوێت راگواسـتن

یاخود رژێمی بەعس بە پیادەکردنی ئەم سیاسەتەی راگوێزراوەکانی رووبەڕووی چ بارۆدوخێك کردووە یان لە چ ئارامی و خوشیەکی بێبەش کردوون.

لەو رێژە بەرزەی کە پێی وایە پێش راگواستنیان ژیانیان خوشتر بووە، زیاتر لە نیوەیان بە رێژەی ٥٥,٣٣٪ هۆیەکەی بەوە دیار دەکەن کە جاران لەسەر خاك و رێ وشوێنی خۆیان بوون. ئەمەش ئەوە دەگەینێت کە ئەوان شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستایان کە هەندێکیان تەمەنی وەچەیەکە لەوێ دەژین بە شوێن و خاکی خۆیان نازانن و ئینتمایان بۆ شوێنی پێشوویان هەیە، واتە ئەو گوند یاخود شارەی لێی راگوێزراوە. ١٤٪شیان پێیان وایە پێش راگواستن خەم و خەفەتیان کەمتر بووە. کەمی خەم و خەفەتیش نیشانەی ئارامی دەروونییە و دواجار خۆشی ژیانە. بەلاّم بە رێژەی ١٠٪ هۆی خۆشی ژیان لەو کاتەدا دەگەڕێننەوە بۆ باری ئابووری، ئەمانە پێیان وایە پێش راگواستن ژیانیان باشتر دەگوزەرا و وەك ئێستا هەژار نەبوون، ئەم گروپە پەیوەندی لە نێوان باری ئابووری و خوشی و ئارامیی ژیاندا دروست دەکەن.

لەو رێژە کەمەش (١٥,٦٧٪) پێیان وایە دوای ئەوەی راگوێزراون ژیانیان بەرەو ئارامی و خۆشی چووە، رێژەیەکی بەرزیان کە دەکاتە ٥,٣٣٪ هۆیەکەی بۆ باشبوونی باری ئابووری دەگەڕێننەوە، ئەمانە پێیان وایە ئێستا ژیانیان باشتر دەگوزەرێ و لە هەژاری رزگاریان بووە. رێژەیەکی نزیك لەمەش کە دەکاتە ٤,٣٣٪ پێیان وایە دوای راگواستن پانتایی ئازادی تاکەکەسی فرەوانتر بووە و توانیویانە خۆیان پێ بگەینن و زێتر ئاگاداری رەوشی جیهان بن. هەر بۆیە دوای راگواستن بە خۆشتر و ئارامتر لەقەڵەم دەدەن. رێژەیەکی دیکە کە دەکاتە ٣,٦٧٪ وای بۆ دەچن دوای ئەوەی راگوێزراون خەم و خەفەتیان کەمترە، واتە پێش راگواستن خەمیان زێتر خواردووە.

**خشتەی ژمارە (٤٦) خۆشی ژیان لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن لەگەڵ هۆی خۆشیەکە**

| ژیانمان خۆشتر بوو / هۆیەکەی | پێش راگواستن | دوای راگواستن | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| شوێنی خۆمان بوو | 166 55.33% | 1 0.33% | 167 55.67% |
| خەم و خەفەت کەمتر بوون | 42 14.00% | 11 3.67% | 52 17.67% |
| ژیان ئاسانتر دەگوزەرا | 30 10.00% | 16 5.33% | 46 15.33% |
| ئازادیی تاك زیاترە و خۆمان پێگەیاندووە و لە جاران شارەزاترین | 0 0.00% | 13 4.33% | 13 4.33% |
| ئارامی زیاتر بوو هەروەها میهرەبانی | 3 1.00% | 0 0.00% | 2 1.00% |
| بێ وەلام | 12 4.00% | 6 2.00% | 18 6.00% |
| کۆی گشتی | 253 84.33% | 47 15.67% | 300 100.00% |

## ٢٧ـ گۆڕانی هەستی کوردایەتی لەگەڵ ئاراستەی گۆڕانەکە

خشتەی ژمـــارە (٤٧) داتاکـانی تایبـەت بـە دوو پرسـیار لـەخۆ دەگرێت، یەکەم ئایا دوای ئەوەی حکومەت ئێوەیان راگواست هەستی کوردایەتیتان گۆڕا یاخود نەخێر؟ دووەم، ئەگەر گۆڕاوە بەهێز بووە یان بەرەو لاوازی چوو؟

سەبارەت بە وەڵامی پرسیاری یەکەم، رێژەی ٧٢٪ی نموونەکە پێیان وایە لە دوای ئەوەی راگوێزران، هەستی نەتەوەییان گۆڕا. لە بەرامبەر ئەم رێژەیەشدا ئەوانەی ماونەتەوە رێژەیان ٢٨٪ی نموونەکەیە هەموو رێژەکە وای بۆ چووە کە راگواستن هیچ کاریگەریەکی لەسەر هەستی نەتەوەیی ئەوان نەبووە. بێگومان ٢٨٪ی نموونەکە رێژەیەکی زۆرە، بەڵام لە خشتەی ژمارە (٣٨)دا دەردەکەوێت کە ١٩٪ نموونەی باسەکەمان نازانن حکومەت بۆ ئەوانی راگواستووە. کاتێك تۆ هەست بەوە نەکەی بۆیە تۆیان راگواستووە چونکە کورد بووی، ئەوا ئەو هەستە نەتەوەییەی هەتە راگواستن چۆن دەیگۆڕێت.

بەڵام سەبارەت بەو نموونەیەی کە رێژەی ٧٢٪ پێی وایە لە ئەنجامی راگواستنەوە گۆڕان بەسەر هەستی نەتەوەییاندا هاتووە، ئەوا ٥٧,٦٧٪ پێی وایە هەستی نەتەوەییان لەدوای راگواستنیان بەهێزتر بووە، ئەمەش بارێکی ئاساییە، چونکە ئەوانە هەست دەکەن ستەمێکی زیاتریان لێ کراوە. کەچی رێژەی ١٢,٣٣٪ نموونەکە پێیان وایە راگواستن وای کرد هەستی نەتەوەییان بەرەو لاوازی بچێت، دەشێ ژمارەیەك لەمانە ئەوانە بن کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم ژێر دەسەڵاتی حکومەت لەدوای راپەڕینی ١٩٩١ بۆ ناوچە کوردنشینەکان راگوێزرابن، چونکە پێمان وایە لە ئەنجامی زیاتر لە دە ساڵ حوکمرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، خەڵکی بەجۆرێك لە جۆرەکان هەستی نەتەوەییان لاواز بووە.

خشتەی ژمارە (٤٧) گۆڕانی هەستی کوردایەتی لەگەڵ ئاراستەی گۆڕانەکە

| لەدوای راگواستن هەستی نەتەوەییمان / لەدوای راگواستن هەستی نەتەوەییمان | نەگۆڕاوە | بەهێز بووە | بێهێز بووە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| گۆڕاوە | 6<br>2.00% | 173<br>57.67% | 37<br>12.33% | 216<br>72.00% |
| نەگۆڕاوە | 84<br>28.00% | 0<br>0.00% | 0<br>0.00% | 84<br>28.00% |
| **کۆی گشتی** | 90<br>30.00% | 173<br>57.67% | 37<br>12.33% | 300<br>100.00% |

## ٢٨ـ ئاوەدانیی گوند لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە

لە خشتەی ژمارە (٤٨)دا و لە میانەی ئەو داتایانەی کە لە خشتەکەدا خراونەتەڕوو پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاوی، یەکەم، ئایا گوندی نموونەکە ئاوەدانە یاخود هێشتا ئاوەدان نەکراوەتەوە؟ دووەم، ئایا دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی؟ دەردەکەوێت. رێژەی ٥٧,٦٧٪ی نموونەی باسەکە گوندەکەیان ئاوەدانە و رێژەی ٤٢,٣٣٪ هێشتا گوندەکانیان ئاوەدان نەکراونەتەوە.

سەبارەت بەوانەی گوندەکانیان ئـاوەدانن و ڕێژەکـەیان ٥٧,٦٧٪ ە، دەبینین تەنیا ١١,٦٧٪ پێیـان وایـە دەگەڕێنـەوە. بـەڵام نزیکـەی دوو هێندەی ئەوان بە ڕێژەی ٢٢,٦٧٪ پێیان وایە ناگەڕێنـەوە، ڕێژەیـەکی نزیکیش لەم ڕێژەیەی سەرەوە کە دەکاتە ٢٠,٦٧٪ مەرجیان هەیە بـۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ گوندەکەیان.

کەچی ئەو ڕێژەیەی (٤٢,٣٣٪) کە گوندەکانیان ئاوەدان نـین، بـە ڕێژەی ١٥,٦٧٪ دەڵێن ئەگەر گوندەکـەیان ئـاوەدان کـرا دەگەڕێنـەوە بۆی، بەڵام بە ڕێـژەی ٥,٦٧٪ نموونەکـە پێیـان وایـە ناگەڕێنـەوە بـۆ گوندەکەیان، سەبارەت بەوانەی کە مەرجیشـیان هەیـە بـۆ گەڕانـەوە ڕێژەیان لە دوو کۆمەڵەکەی دیکە زیاترە و دەگاتە ٢٠,٣٣٪.

**خشتەی ژمارە (٤٨) ئاوەدانیی گوند لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە**

| بۆ ناوچەکەتان دەگەڕێنەوە؟ / ئایا دەگەڕێنەوە | نازانم | دەگەڕێنەوە | ناگەڕێنەوە | مەرجم هەیە | کۆی گشتی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| بەڵێ | 8 2.67% | 35 11.67% | 68 22.67% | 62 20.67% | 173 57.67% |
| نەخێر | 2 0.67% | 47 15.67% | 17 5.67% | 61 20.3 | 127 42.33% |
| کۆی گشتی | 10 3.33% | 82 27.33% | 85 28.33% | 123 41.00% | 300 100.00% |

## ٢٩ـ رادەی کار لەگەڵ خۆشیی ژیان لە پێش راگواستن و دوای راگواستن

خشتەی ژمارە (٤٩) وەلامی دوو پرسیاری دیکە دەداتەوە: یەکەم، پێش راگواستن زێتر کارت دەکرد یان دوای راگواستن؟ دووەم، ئایا پێش راگواستن یان دوای راگواستن ژیانت خوشتر و ئارامتر بوو؟

٦٨٪ی نموونەی تۆژینەوەکە پێیان وایە پێش راگواستن پڕ ئیش و کارتر بوون وەك دوای راگواستن، ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی نموونەکە پڕکارتر بوون ژیانیشیان خۆشتر و ئارامتر بوو. واتە پڕ ئیش و کاری کە ماندووبوونی جەستەیشی لەگەڵە نابێتە رێگر لەبەردەم خۆشی و ئارامی‌ی ژیان چونکە ئەگەر رێگر بوایە ئەوا زۆربەیان لە وەلامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا ژیانتان پێش راگواستن خۆشتر و ئارامتر بوو؟ بە بەڵێ وەلامیان نەدەدایەوە، چونکە لەو ٦٨٪ بەوە وەلامیان داوەتەوە کە جاران پڕ ئیش و کارتر بوون، ٦٠٪ ئەوانەن کە پێیان وایە ژیانیان پێشراگواستن خوشتر و ئارامتر بوو.

خشتەی ژمارە (٤٩) رادەی کار لەگەڵ خوشی‌ی ژیان لە پێش راگواستن یان دوای راگواستن.

| زێتر کارت دەکرد / ژیانتان خۆشتر بوو | پێش راگواستن | دوای راگواستن | کۆی گشتی |
| --- | --- | --- | --- |
| پێش راگواستن | 182 60.67% | 22 7.33% | 204 68.00% |

| دوای راگواستن | 47 15.67% | 18 6.00% | 65 21.67% |
| --- | --- | --- | --- |
| جیاوازیەکی وا نەبوو | 24 8.00% | 7 2.33% | 31 10.33% |
| کۆی گشتی | 253 84.33% | 47 15.67% | 300 100.00% |

ئەوانەی پێیان وایە دوای راگواستن پڕکارتر بوون ڕێژەیان ٢١,٦٧٪ی نموونەکەیە. ١٥,٦٧٪ ئەوانەن کە پێیان وایە پێش راگواستن ژیانیان خۆشتر و ئارامتر بوو، ٦٪ ئەوانەن کە پێیان وایە پێش راگواستن ژیانێکی خوشتر و ئارامتریان دەگوزەراند. لەو لاشەوە تەنیا ١٠٪ی نموونەی تۆژینەوەکە پێی وایە جیاوازیەکی ئەوتۆ نەبووە لەنێوان رێژەی کاری نموونەی باسەکە لە پێش راگواستن و دوای راگواستن، ٨٪ ئەم گرووپە ئەوانەن کە پێیان وایە پێشراگواستن ژیانیان خۆشتر و ئارامتر بووە و ٢,٣٣٪ شیان ئەوانەن کە دەڵێن دوای راگواستن ژیانیان خوشتر و ئارامترە.

**٣٠- باری ئابووریی نموونەکە لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە**

خشتەی ژمارە (٥٠) پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاوی باری ئابووریی نموونەکە و مەیلی گەڕانەوەیان بۆ گوند پیشاندەدات. لەمیانەی داتاکانەوە دەردەکەوێت ئەوانەی باری ئابوورییان باشە ڕێژەکەیان ١٦٪یە، لەم ڕێژەیەش ئەو دوو گرووپەی دەڵێن دەگەڕێینەوە و ناگەڕێینەوە، هەر یەکەیان ٤٪ی نموونەکە پێکدێنن. کەچی ئەوانەی

باری ئابووریان مامناوەندیە زۆرترین ڕێژە پێکدێنن کە دەکاتە ٦٤,٦٧٪ی نموونەی تۆژینەوەکە بەم جۆرە: ١٧٪ دەگەڕێنەوە، ٢٠,٣٣٪ ناگەڕێنەوە و ٢٥,٦٧٪ مەرجیان بۆ گەڕانەوە هەیە. واتە ئەوانەی دەگەڕێنەوە ڕێژەیان لە هەموویان کەمترە. گرووپی سێیەم ئەوانەی باری ئابووریان خراپە ١٩,٣٣٪ی نمووونەکەن. ڕێژەی ٤٪ ناگەڕێنەوە، ٦٪ دەگەڕێنەوە و ٨٪ مەرجیان هەیە بۆ گەڕانەوە. واتە ئەوانەی ناگەڕێنەوە ڕێژەیان لە هەموویان کەمترە. واتە چەند باری ئابووری خراپتر بێت ئەگەری گەڕانەوە بۆ گوند زێترە.

**خشتەی ژمارە (٥٠) باری ئابووریی نموونەکە لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە**

| بۆ ناوچەکەتان دەگەڕێنەوە؟ / باری ئابووریتان | نازانم | دەگەڕێنەوە | ناگەڕێنەوە | مەرجمان هەیە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| باشە | 2 0.67% | 12 4.00% | 12 4.00% | 23 7.67% | 49 16.33% |
| مامناوەندی | 5 1.67% | 51 17.00% | 61 20.33% | 76 25.33% | 193 64.33% |
| خراپە | 3 1.00% | 19 6.33% | 12 4.00% | 24 8.00% | 58 19.33% |
| کۆی گشتی | 10 3.33% | 82 27.33% | 85 28.33% | 123 41.00% | 300 100.00% |

## ٣١ـ گۆڕانی باری خوێندەواری لەگەڵ ئاراستەی گۆڕانەکە

داتاکانی ناو خشتەی ژمارە (٥١) وەڵامی دوو پرسیار دەخەنە ڕوو: یەکەم، ئایا لەئەنجامی ڕاگواستندا باری خوێندەواری منداڵەکانتان گۆڕانی تێکەوت. دووەم، ئەگەر گۆڕانی تێکەوتووە، گۆڕانەکە بە کام ئاراستە بووە، بەرەو باشی یاخود بەرەو خراپی؟

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا نموونەکەمان ڕێژەی ٩٣٪ پێی وایە ڕاگواستن کاریگەری هەبووە لەسەر گۆڕانی باری خوێندەواری منداڵەکانیان. لەبەرانبەر ئەمەشدا تەنیا ٧٪ی نموونەکەمان پێیان وایە ڕاگواستن هیچ کاریگەرییەکی لەسەر باری خوێندن نەبووە و منداڵەکانیان وەکو پێش ڕاگواستن بەردەوامیان بە خوێندنی خۆیان داوە، ئەگەر گۆڕانیش ڕووی دابێت هۆیەکەی ڕاگواستن نەبووە.

لە وەڵامی پرسیاری دووەمدا، دەبینین لەو ٩٣٪ پێیان وایە باری خوێندنی منداڵەکانیان گۆڕانی تێکەوتووە، بە ڕێژەی ٨١,٣٣٪ نموونەی تۆژینەوەکەمان پێی وایە گۆڕانەکە بە ئاراستەی باشتر بووە. هەڵبەت ئەمە تارادەیەکی زۆر چاوەڕوانکراو بوو، چونکە زۆر لەم ڕاگوێزراوانە خەڵکی ئەو گوندانە بوون کە دوور بوون لە شار و شارۆچکەکان و حکومەت بایەخێکی ئەوتۆی بە خزمەتگوزارییەکانی وەك پەروەردە و تەندروستی نەدەدا لەو ناوچانەدا. هەروەها بەشێکی زۆری ڕاگوێزراوەکانیش بۆ شار و شارۆچکەکان هاتن لەدوای ڕاگواستن و لەوێ پێویستی دەکرد زیاتر بایەخ بە خوێندن بدەن و هەلومەرجی خوێندن لە شارەکان لەبارتر بوو و دەرفەتەکانیش زێتر بوون، سەرەڕای ئەوەی کە منداڵ لە لادێ هەمیشە دەکرێ بە کاروبارەکانی ماڵەوە و پارمەتیدانی گەورەکانەوە سەرقاڵ بێت، بەڵام لە شار یاخود ئوردووگا ئەو کارانەی نییە و دەبێت بخوێنێت، جگە لەمەش ڕاگوێزراوەکان هەستیان بە گرنگیی خوێندن کردبوو.

**خشتەی ژمارە (٥١) گۆڕانی باری خوێندەواری لەگەڵ جۆری گۆڕانەکە**

| باری خوێندەواری منداڵەکانتان لە دوای ڕاگواستن / لە دوای ڕاگواستن | وەکو خۆی مایەوە | بەرەو باشی چوو | بەرەو خراپی چوو | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| باری خوێندەواری منداڵەکانمان گۆڕا | 0 0.00% | 244 81.33% | 35 11.67% | 279 93.00% |
| باری خوێندەواری منداڵەکانمان نەگۆڕا | 21 7.00% | 0 0.00% | 0 0.00% | 21 7.00% |
| کۆی گشتی | 21 7.00% | 244 81.33% | 34 11.33% | 300 100.00% |

هەروەها ١١,٦٧٪ی نموونەکە پێیان وایە دوای ڕاگواستن باری خوێندەواریی منداڵەکانیان بەرەو خراپی چووە، ئەگەرچی بەبەراورد لەگەڵ ڕێژەکەی پێشوو ڕێژەیەکی کەمە بەڵام هێشتاش زۆرە، و ئەمانە ئەوانەن کە ڕاگواستن بارودۆخێکی تایبەتی بۆیان هێناوەتە ئاراوە و لە ئەنجامدا لە خوێندن دابڕاون. هەندێك لەمانە ڕەنگە خەڵکی ئەو ناوچانەبن کە پێشتر بە عەرەبی خوێندویانە و کاتێ ڕاگوێزراون بۆ ئەو ناوچانەی خوێندن بە کوردیە تووشی گرفت هاتوون.

ئەو ڕێژەیەی دیکەش کە دەمێنێتەوە واتە ٧٪ ئەوانەبوون کە دەڵێن هیچ گۆڕانێك سەبارەت بە باری خوێندنی منداڵەکانیان ڕوی نەداوە.

### ٣٢ـ باری دارایی نموونەکە لەگەڵ ساڵی راگواستن

لە خشتەی ژمارە (٥٢)دا کە تایبەتە بەوەی ئایا لەدوای راگواستن باری داراییتان باشتربوو یاخود پێش راگواستن؟ ئەویش بەپێی ساڵەکانی راگواستن. دەبینین زۆرترین رێژەی راگوێزراوەکان کە دەکاتە ٦٦,٦٧٪ پێیان وایە پێش راگواستن لەڕووی داراییەوە ژیانیان باشتر دەگوزەرا. واتە بەوەی کە راگوێزراوەکان لەسەر رێوشونیان راگوێزراون لەڕووی داراییەوە زیانیان پێکەوتووە. دەشێ زۆربەی راگوێزراوەکان لەبەر ئەوە لەڕووی داراییەوە پێشراگواستن ژیانیان باشتر بوو بێت، چونکە ئەوکات خاوەنی خانووی خۆیان بوون و بەزۆری بە کاری کشتوکاڵی و بەخێوکردنی ئاژەڵەکانەوە خەریك بوون، بەڵام دوای ئەوەی رادەگوێزرێن جگە لەوەی پیشەکەیان و مەڕ و ماڵاتیان لە دەست دەدەن، بەشێکی ئەو پارەیەی کە هەشیانە لە خانووی نوێی خەرج دەکەن هەروەها دەبنە کەسی بەکاربەر زیاتر لەوەی بەرهەمهێن وەك لە لادێ.

لەلایەکی دیکەشەوە ٢٣,٦٧٪ نموونەی تۆژینەوەکەمان پێیان وایە لەدوای راگواستن باری داراییان بەرەو باشتر چووە. زیاتر لە نیوەی ئەمانە واتە ١٢,٦٧٪ لەو راگوێزراوانەن کە لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ راگوێزراون و بەجۆرێك قەرەبووکرانەوە کە هیچ راگوێزراوێکی دیکە بەختی ئەمانەیان نەبوو ئەوانیش بەزۆری پێشبینی ئەو جۆرە قەرەبووکردنەوەیەیان نەکردبوو، وێڕای ئەوەی کە حکومەت لە ئوردووگاگەلێکدا خانووی بۆ دروست کردبوون کە بەزۆری باشتر بوون لە خانووە کۆنەکانیان.

رێژەی سێیەمیش، واتە ئەوانەی پێیان وایە لەو دوو قۆناغەدا (پێش راگواستن و دوای راگواستن) جیاوازیەکی ئەوتۆ نەبووە سەبارەت بە باری داراییان، دەکاتە ٩,٦٧٪.

ئەوانەی پێش ساڵی ١٩٧٦ ڕاگوێزراون زۆربەیان پێیان وایە پێش ڕاگواستن ژیانیان لەڕووی داراییەوە باشتر بووە، واتە بە ڕێژەی ٦,٣٣٪ی کۆی ٨,٣٣٪ی ئەو ڕاگوێزراوانە. بەڵام سەبارەت بە ڕاگوێزراوەکانی ساڵەکانی ١٩٧٧ـ١٩٧٩، ئەگەرچی ڕێژەیەکی بەرچاویان کە دەکاتە ١٤,٦٧٪ نموونەکە هەمان ڕای گرووپی سەرەوەیان هەیە، بەڵام ئەمانە کەمترن لە نیوەی ئەو ڕاگوێزراوانەی بە نموونەی ئەم ماوەیە وەرگیراون. لەلایەکی دیکەشەوە لە کۆی ١٣,٦٧٪ نموونەکە کە لەماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩٨٠ـ١٩٨٦ وەرگیراون، ١٠٪ ئەوانە پێیان وایە پێش ڕاگواستن ژیانیان لەڕووی داراییەوە باشتر بووە نەك دوای ڕاگواستن. ڕاگوێزراوەکانی دوو ساڵی ١٩٨٧ـ١٩٨٨ کە زۆرترین ڕێژەی نموونەی باسەکەمان پێکدەهێنن بە ڕێژەی ٣٩,٦٧٪، ڕێژەیەکی بەرز، واتە ٣٠٪ ئەو نموونەیەش لەگەڵ ڕای ئەوانەی پێش خۆیان کۆك و تەبان. سەبارەت بە ڕاگوێزراوەکانی دو گرووپی ساڵەکانی ١٩٨٩ـ ١٩٩٠ و دوای ساڵی ١٩٩١، لە نیوە زێتری هەر یەکێك لەم دوو کۆمەڵەیەش پێیان وایە پێش ڕاگواستن ژیانیان لەڕووی داراییەوە باشتر بووە.

خشتەی ژمارە (٥٢) باری دارایی‌ی نموونەکە لەگەڵ ساڵی ڕاگواستن

| کۆی گشتی | جیاوازیەکی وا نەبوو | دوای ڕاگواستن باشتر بوو | پێش ڕاگواستن باشتر بوو | باری داراییمان / ساڵی ڕاگواستن |
|---|---|---|---|---|
| 25 8.33% | 2 0.67% | 4 1.33% | 19 6.33% | 1969-1976 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 1977-1979 | 44 14.67% | 38 12.67% | 10 3.33% | 92 30.67% |
| 1980-1986 | 30 10.00% | 6 2.00% | 5 1.67% | 41 13.67% |
| 1987-1988 | 90 30.00% | 18 6.00% | 11 3.67% | 119 39.67% |
| 1989-1990 | 8 2.67% | 3 1.00% | 0 0.00% | 11 3.67% |
| 1991-2001 | 9 3.00% | 2 0.67% | 1 0.33% | 12 4.00% |
| **کۆی گشتی** | 200 66.67% | 71 23.67% | 29 9.67% | 300 100.00% |

## ٣٣- زۆریی نەخۆشی لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن لەگەڵ هۆی زۆریان

خشتەی ژمارە (٥٣) بۆمان روونەکاتەوە کە ئایا پێش راگواستن یان دوای راگواستن نەخۆشیەکان زیاتر بوون، هەروەها هۆی زۆری ئەم نەخۆشیانە لە هەر یەکێك لەم دوو قۆناغەدا بۆچی دەگەڕێتەوە؟

لەمیانەی داتاکاندا دەردەکەوێت کە ٨٢٪ی نموونەی باسەکە لەو بڕوایەدایە کە دوای راگواستن نەخۆشیەکان لەڕووی چەندێتیەوە لە کۆمەڵگادا زیادیان کردووە. تەنیا ١٨٪ی نموونەکەش پێیان وایە جاران واتە پێش راگواستن نەخۆشیەکان زێتر بوون.

سەبارەت بەوەی کە هۆی زۆربونی نەخۆشیەکان چیە لە هەر یەکێك لەو دوو قۆناغەدا بە پێی رای راگوێزراوان، (٩) وەڵامی

جیاجیامان له نموونه‌که دەستکەوتووه، بەم شێوەیە: ١١٪ی نموونەکە هیچ وەڵامێکیان نەداوەتەوە و گوتویانە ئێمە هۆیەکەی نازانین. کەچی ١٣,٦٧٪ی نموونەکە کە پێیان وایە دوای ڕاگواستن نەخۆشیەکان زیاترن، هۆیەکەی دەگەڕێننەوە بۆ بەدخوراکی. ئەوان پێیان وایە دوای ئەوەی لە چیاکان یان لە سروشت دوور کەوتوونەتەوە و کەمتر گژوگیا دەخۆن نەخۆشیەکان زیادیان کردووە. هەروەها ١٨,٣٪ نموونەکەش هۆیەکەی بۆ پیسی ژینگە دەگەڕێننەوە لەدوای ڕاگواستن، ئەوان پێیان وایە ژینگە لە لادێ زۆر خاوێن بووە، بۆیە کەمتر تووشی نەخۆشی هاتوون. ڕێژەیەکی دیکە کە دەکاتە ١٠.٦٧٪ پێیان وایە زۆربوونی ژمارەی خەڵك و چڕی دانیشتووان هۆی زێدەبوون و بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکانن لەدوای ڕاگواستن، چونکە دوای ئەوەی لادێکان چوڵ کران، ڕووبەرێکی زۆری خاکی کوردستانی باشور بێ مرۆڤ مایەوە و چڕی دانیشتووانیش لە ناوچەگەلێکی دیکە زیادی کرد. ٦٪ی نموونەکەش زۆربوونی نەخۆشیەکان بۆ دوو هۆکاری بەدخوراکی و پیسبوونی ژینگە دەگەڕێننەوە. ڕێژەیەکی بەرزی دیکەی نموونەکەشمان کە ١٤,٣٣٪ یە زێدەبوونی خەم و خەفەت لەدوای ڕاگواستن و جێهێشتنی زەوی و زاریان بە هۆی زێدەبوونی نەخۆشیەکان لەقەڵەم دەدەن. ئەمان پێیان وایە خەم و خەفەت کە پەیوەندیی بەباری دەروونیی مرۆڤەوە هەیە دەتوانێ مرۆڤ تووشی نەخۆشی جەستەیی بکا. ئەو ڕێژەیەی دەمێنێتەوە بەشێکی هۆیەکەی دەگەڕێننەوە بۆ کەمیی هوشیاریی تەندروستی و بەشێکی دیکەی بۆ بەکارهێنانی گازە ژەهراویەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە .

خشتەی ژمارە (٥٣) زۆری نەخۆشی لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن لەگەڵ هۆی زۆریان.

| نەخۆشییەکان / هۆی زیندەبوونیان | دوای راگواستن زیاتر بوون | پێش راگواستن زیاترن | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| خواردەمەنیی پاك نییە | 41 13.67% | 3 1.00% | 44 14.67% |
| پیسی ژینگە | 55 18.33% | 2 0.67% | 57 19.00% |
| زۆربوونی دانیشتووان | 32 10.67% | 0 0.00% | 32 10.67% |
| پیسیی ژینگە و بەدخۆراکی | 18 6.00% | 1 0.33% | 19 6.33% |
| کەمیی هوشیاریی تەندروستی | 12 4.00% | 37 12.33% | 49 16.33% |
| زۆریی خەم و خەفەت و پیسی ژینگە | 7 2.33% | 2 0.67% | 9 3.00% |
| زۆریی خەم و خەفەت | 43 14.33% | 5 1.67% | 48 16.00% |
| بەهۆی گازە ژەهراویەکانەوە | 5 1.67% | 0 0.00% | 5 1.67% |
| نازانم | 33 11.00% | 4 1.33% | 37 12.33% |
| کۆی گشتی | 246 82.00% | 54 18.00% | 300 100.00% |

## ٣٤ـ باری ئابووریی نموونەکە پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستن

لـە خشـتەی ژمـارە (٥٤)دا کـە پـەیوەندیی دوو گـۆڕاوی بـاری ئابووریی ئێستای نموونەکە و ڕەوشی ئابوورییان لە دوو قۆناغی پێش ڕاگواستن و دوای ڕاگواستندا ڕوندەکاتەوە، دەردەکەوێت کـە ٤٨ کـەس بە ڕێژەی ١٦٪ دەڵێن باری ئابووریان باشە. زۆرترین ڕێـژەی نموونەکـە (٦٤,٦٧٪) دەڵێن باری ئابووریان مامناوەندیە. ٥٨ کەسیش بە ڕێژەی ١٩,٣٣٪ پێیان وایە باری ئابووریان خراپە. بەگشتی ئەوانـەی پێیـان وایە باری ئابووریان مامناوەندیە زۆرترین ڕێژەی نموونەکـە پێکدێنـن، ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگاکـەمان کـە چینی ناوەندی زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگا پێکدێنن. بەڵام سـەبارەت بە گۆڕاوەکەی تر کە ئایا پێـش ڕاگواسـتن یـان دوای ڕاگواسـتن بـاری ئابووریان باشتر بووە، دەردەکەوێت دوو لەسـەر سـێی نموونەکـە، واتـە ٢٠٠ کەس بـە ڕێـژەی ٦٦,٦٧٪ پێیـان وایـە پێـش ڕاگواسـتن بـاری ئابووریان باشتر بووە نەك دوای ڕاگواسـتن. ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کە دوای ڕاگواستنی لادێنشینان و دوای ئەوەی کەمتر پشت بـە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەبەستن، لە جیاتی ئەوە ڕوویان لـە پیشـەکانی تر کردووە یاخود ژمارەیەکیان بێکار ماونەتەوە، زیتر بەکاربەرن تـاکو بەرهەمـهێن، چونکـە لادێ بەپێچەوانـەی ئوردووگـا ژینگـەی کار و بەرهەمە.

**خشتەی ژمارە (٥٤) باری ئابووریی نموونەکە لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستن**

| باری ئابووریمان / باری دارایی ئێستامان | پێش راگواستن باشتر بوو | دوای راگواستن باشتر بوو | جیاوازیەکی وا نیە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| باشە | 28<br>9.33% | 16<br>5.33% | 4<br>1.33% | 48<br>16.00% |
| مامناوەندیە | 126<br>42.00% | 48<br>16.00% | 20<br>6.67% | 194<br>64.67% |
| خراپە | 46<br>15.33% | 7<br>2.33% | 5<br>1.67% | 58<br>19.33% |
| **کۆی گشتی** | 200<br>66.67% | 71<br>23.67% | 29<br>9.67% | 300<br>100.00% |

٧١ کەسیش بە رێژەی ٢٣,٦٧٪ی نموونەی تۆژینەوەکە لەو بڕوایەدان لەگەڵ راگواستن باری ئابووریان بەرەو باشتر چووە، واتە لەڕووی داراییەوە لەدوای راگواستن باشترن وەك پێش راگواستن. رەنگە زۆربەی ئەمانە لەو راگوێزراوانە بن کە سالآنی ١٩٧٧ـ١٩٧٩ لە

ناوچە شاخاویە سەختەکان راگوێـــزران و قـــەرەبووی دارایـــش کرانـــەوە. خەڵکی ئەم ناوچانە لەبەر چەند هۆکارێك زۆربەیان هەژار بوون، بەڵام دوای راگواستن و نیشتەجێ کردنیان لە نزیك شارەکان لـــە هەمووشـــی بـــەرچاوتر ئـــەو بڕە پارەیـــەی وەك قـــەرەبووی بەروبوومـــەکانیان پێیـــان بەخشرا، کەم نەبوو هەروەها رەوشێکی بەرەو باشتری لەڕووی ئابووریەوە باڵی بەسەر عێراقدا کێشا. هەموو ئەمانە وایانکردووە باری ئـــابووری ئەم گرووپەی نموونەکەمان دوای راگواستن باشتر بێت. دواجاریش تـــەنیا ٩,٦٧٪ لـــەو بڕوایـــەدان لـــە هـــەردوو قۆناغـــەکـەدا بـــاری ئابووریـــــان جیاوازیەکی وای نەبووە.

### ٣٥- سیخوری لەگەڵ ترس لە رژێمی بەعس

خشتەی ژمارە ( ٥٥ ) کە لێرەدا خراوەتەڕوو، پەیوەندیی نێـــوان دوو گۆڕاومـان بـــوو رووندەکاتـــەوە یـــاخود وەڵامـــی دوو پرســـیار دەداتـــەوە: یەکەم، ئایا سیخوری لە کوێ ( لادێ، ئوردووگا ـ شارـ) زێـــتر بـــووە؟ دووەم، ئایا لە سەردەمی رژێمی بەعس هەستت بە ترس دەکرد.

سەبارەت بە وەڵامـــی پرســـیاری یەکـــەم، زۆرتریـــن رێـــژە ٧٣,٦٧٪ نموونەی باسەکەمان پێیان وایە لە ئوردووگا و شارەکان سیخوری زێـــتر بـــووە وەك لـــە لادێکـــان. لێرەشـــدا دەکـــرێ بڵێـــین لەگـــەڵ راگواســـتنی لادێنشینان، حکومەت هەوڵی دەدا خەڵکانێك بکڕێت و لەدژی خزم و ناسیاوەکانیان بیانخاتە کار. حکومەت بەڕادەیەك بایەخی بەم کارە دەدا و هێندە کاری لەسەر ئەم بنەمایە دەکرد کە خەڵك بەگشتی هەراســـان دەبوون.* تەنانەت هەندێ کات بەدگومانی و نادڵنیاییەکی بـــەردەوام

---

* ترس و سیخوری دەکرێ لەوێدا راڤەیان بۆ بکرێت کە لە شاشـــەی تەلەفزیونەکانـــەوە بینیمان هاوڵاتیەکی عێراقی بۆ ماوەی بیست و یـــەك ســـاڵ لـــە ژوورێکـــی زۆر بچوکـــی ماڵەکەیدا خۆی حەشار دەدات و جگە لە دایك و باوکی هیچ کەسێکی دیکە هەست بە بوونی ئەو کەسە لە ماڵەکەیدا ناکەن. هـــەروەها دوای تێپـــەڕبوونی زێـــتر لـــە مـــانگێك بەسەر رووخانی رژێمی بەعسدا ئەوجا لەو ژوورە هاتە دەر و خۆی ئاشکرا کرد.

بەرامبەر کەسە نزیکەکانیشیان تەنگی بە هاوولاتیان هەڵدەچنی.

لەلایەکی دیکەوە ١٠٪ نموونەکە وای بۆ دەچن جیاوازیەکی وەها نەبووە لەنێوان ئوردووگا و لادێ لەڕووی بوونی سیخوڕەکانەوە. ٤٢ کەسیش بە ڕێژەی ١٤٪ پێیان وایە پێش ڕاگواستن واتە ئەو کاتەی لەسەر ڕێوشونی جارانیان بوون سیخوڕی لەلادێ زێتر بووە نەك لە ئوردووگا، دەکرێ ژمارەیەکی ئەمانە ئەو ڕاگوێزراوانە بن کە لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لە ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەعس ڕەوانەی ناوچە ڕزگارکراوەکان کرابن. هەروەها ڕەنگە ئەم دوو گرووپەی سەرەوە دانیشتووانی ئەو گوندانە بن کە بەردەوام بنکەی پۆلیس لەوێ هەبووە و لەبەر ئەوەی سنوورەکە بچووك بووە هیچ شتێکیان لەبەر چاو ون نەبووە یاخود گوندەکانیان نزیك بوونە لە شار و شارۆچکەکان و حکومەت توانیویەتی زووتر خۆی بخزێنێتە ناویانەوە. ١,٦٧٪ی نموونەکەش هیچ وەلامێکی ئەو پرسیارەیان نەداوەتەوە.

سەبارەت بە گۆڕاوی دووەم، واتە ترس، دەبینین ڕێژەیەکی زۆر بەرز کە دەکاتە ٧٨٪ی نموونەکە دەڵێن دوای ڕاگواستنیان و لە ئوردووگا یاخود شارەکان هەمیشە هەستیان بە ترس کردووە. هەروەها ٥٤ کەس بە ڕێژەی ١٨٪ دەڵێن هەندێ کات هەستیان بە ترس کردووە. تەنیا ٤٪ی نموونەی باسەکەش پێیان وایە لە سەردەمی بەعس هەستیان بە ترس نەکردووە. وێڕای کەمیی ئەم ڕێژەیە بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەکانی پێش خۆی، جێگەی تێڕامانە، چونکە ترس لە سەردەمی حکومەتی بەعس هێندە سەرتاپاگیر بوو کە تەنانەت بەعسیەکانیش زۆر کات لە خۆیان دڵنیا نەبوون.

خشتەی ژمارە (٥٥) سیخوری لەگەڵ ترس لە رژێمی بەعس

| لە سەردەمی بەعس / سیخوری زۆرتر بوو | بەردەوام دەترسایین | هەندێ کات دەترسایین | هەستمان بە ترس نەدەکرد | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| لە گوند | 34 11.33% | 4 1.33% | 4 1.33% | 42 14.00% |
| لە ئوردووگا ـ شار ـ | 176 58.67% | 41 13.67% | 4 1.33% | 221 73.67% |
| وەك یەك وابوو | 21 7.00% | 7 2.33% | 4 1.33% | 32 10.67% |
| بێ وەڵام | 3 1.00% | 2 0.67% | 0 0.00% | 5 1.67% |
| **کۆی گشتی** | 234 78.00% | 54 18.00% | 12 4.00% | 300 100.00% |

## ٣٦ـ تەمەنی نموونەی باسەکە لەگەڵ هاوسەرێتی

لە خشتەیژمارە (٥٦)دا، کە پەیوەندی نێوان دوو گۆڕاو دەخاتەڕوو: یەکەم، هاوسەرێتی پێش راگواستن یان دوای راگواستن ئاسانتر بووە یاخود هیچ جیاوازیەك نەبووە، هەروەها وەڵامی ئەم گۆڕاوە بەپێی تەمەنی نموونەکە روونکراوەتەوە.

له خشته‌که‌دا ده‌رده‌که‌وێت که‌وا ئه‌وانه‌ی پێیان وایه پێش راگواستن هاوسه‌رێتی ئاسانتر بووه رێژه‌که‌یان ده‌کاته ٦٢٪ی نموونه‌ی باسه‌که، رێژه‌یه‌کی به‌رزی ئه‌وانه‌ی له‌سه‌ر ئه‌م باوه‌ڕه‌ن که ١٥٪ی نموونه‌که‌ن ته‌مه‌نیان له‌نێوان ٤٠ـ٤٩ ساڵیدایه. هه‌روه‌ها هه‌ر یه‌کێك له دوو کۆمه‌ڵه‌ی ئه‌وانه‌ی ته‌مه‌نیان له‌نێوان ٣٠ـ٤٠ ساڵی و ٥١ـ٦١ ساڵیدایه، ١٣٪ ئه‌وانه‌ن که پێیان وایه پێش راگواستن هاوسه‌رێتی ئاسانتر بووه وه‌ك له‌دوای راگواستن. ئه‌وانه‌ش که ته‌مه‌نیان له‌نێوان ١٩ـ٢٩ ساڵیدایه و به‌گشتی ١٦٪ نموونه‌که‌ن ١٠٪یان هه‌مان رای ئه‌وانه‌ی پێشه خۆیانیان هه‌یه. سه‌باره‌ت به به‌ته‌مه‌نه‌کانیش واته ئه‌وانه‌ی له ٦٠ به‌سه‌ره‌وه‌ن و به‌گشتی ١٥٪ نموونه‌که پێکدێنن ٩٪یان له‌گه‌ڵ رای ئه‌وانه‌ی پێشوو کوکن.لێره‌شدا به پشت به‌ستن به‌وه‌ی زۆرینه‌ی هه‌موو کۆمه‌ڵه ته‌مه‌نییه‌کان پێیان وایه پێشراگواستن هاوسه‌رێتی ئاسانتر بووه، ده‌کرێ هۆیه‌که‌ش بگه‌ڕێنینه‌وه بۆ ئه‌و ئاڵۆزی و گۆڕانه‌ی به‌سه‌ر کۆمه‌ڵگای کوردیدا هاتووه. جاران واته پێش راگواستن که هاوسه‌رێتی ته‌واو کاری خێزان بوو نه‌ك ئه‌وانه‌ی ده‌بوون به هاوسه‌ر و زۆر جار کوڕ و کچه‌که تا کاره‌که پێك نه‌ده‌هات یه‌کتریان نه‌ده‌بینی. هه‌روه‌ها زۆربه‌ی هه‌ره زۆری هاوسه‌ره‌کان خزم بوون و داواکاریه‌کانی ماڵی کچه‌ش ده‌کرێ بڵێین که‌متر بوون و نه‌ریته‌کانی وه‌کو ژن به ژنێ و گه‌وره به گچکه‌و شیربایی زێتر ره‌واجیان هه‌بوو، هاوسه‌رێتی ئاسانتر بوو. که‌چی ئه‌مڕۆ ئه‌وانه‌ی ده‌بن به هاوسه‌ر که زێتر ده‌رفه‌تی بینین و هه‌ڵبژاردنی یه‌کتریان هه‌یه و ئه‌و نه‌ریتانه‌ی له‌سه‌ره‌وه ناویان هات به‌ره‌و پاش ده‌چن و ژیان ئاڵۆزتر ده‌بێت، هاوسه‌رێتیش قورستر ده‌بێت.

## خشتەی ژمارە (٥٦)

## تەمەنی نموونەی باسەکە لەگەڵ هاوسەرێتی

| هاوسەرێتی<br>تەمەن | پێش ڕاگواستن ئاسانتر بوو | دوای ڕاگواستن ئاسانتر بوو | وەکو یەک وایە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| 19-29 | 31<br>10.33% | 15<br>5.00% | 4<br>1.33% | 50<br>16.67% |
| 30-40 | 40<br>13.33% | 30<br>10.00% | 7<br>2.33% | 77<br>25.67% |
| 41-51 | 46<br>15.33% | 23<br>7.67% | 5<br>1.67% | 74<br>24.67% |
| 52-62 | 39<br>13.00% | 13<br>4.33% | 3<br>1.00% | 55<br>18.33% |
| 63-73 | 20<br>6.67% | 6<br>2.00% | 3<br>1.00% | 29<br>9.67% |
| 74-84 | 10<br>3.33% | 4<br>1.33% | 1<br>0.33% | 15<br>5.00% |
| کۆی گشتی | 186<br>62.00% | 91<br>30.33% | 23<br>7.67% | 300<br>100.00% |

لەلایەکی دیکەشەوە ئەوانەی پێیان وایە دوای راگواستن ژنهێنان و شووکردن (هاوسەریتی) ئاسانترە رێژەیان کەم نییە، بەڵکو ٣٣,٣٠٪ی نموونەکە پێکدێنن. زۆربەی ئەم رێژەیەش کە دەکاتە سێیەکی، واتە ١٠٪ لەو کۆمەڵەیەن کە تەمەنیان لەنێوان ٣٠ـ٤٠ ساڵیدایە، رێژەی دوای ئەمەش کە دەکاتە ٧,٦٧٪ ئەوانەن کە تەمەنیان لەنێوان ٤١ـ٥١ ساڵیدایە، لە کۆمەڵەی تەمەنی ١٩ـ٢٩ ئەوانەی لەگەڵ ئەم بۆچوونەدان رێژەکەیان ٥٪ ە، بەڵام گروپەکانی دیکەی تەمەن واتە ئەوانەی تەمەنیان دەکەوێتە نێوان ٥٢ـ٦٢، ٦٣ـ٧٣، ٧٤ـ٨٤ رێژەی زۆر کەمتر، واتە کەمتر لە ١\٤یان لەگەڵ ئەم رایەدا کوك و تەبان، واتە تا نموونەکەمان بەتەمەنتر دەبێت کەمتر پێی وایە دوای راگواستن هاوسەریتی ئاسانترە. ئەوان بەراوردی پرۆسەی بە هاوسەربوونی خۆیان کە زۆر سادە بووە لەگەڵ بەهاوسەربوونی ئێستا دەکەن کە نەك تەنیا بەهاوسەربوون بەڵکو هەڵبژاردنەکەش زۆر زەحمەتە.

رێژەیەکی دیکەی نموونەکەشمان کە ٧,٦٧٪ی نموونەکە پێکدێنێ، جیاوازیەکی ئەوتۆ نابینن لە نێوان ئاسانیی هاوسەرگیری لە هەردوو قۆناغەکەدا.

## ٣٧ـ تەمەنی نموونەکە لەگەڵ خواستی خەڵك بۆ گەڕانەوە

لە خشتەی ژمارە(٥٧)دا پەیوەندیی نێوان دوو گۆڕاوی گەڕانەوە بۆ شوێنی پێش راگواستن و تەمەنی نموونەکە روونەکاتەوە، تیایدا دەردەکەوێت کە رێژەیەکی بەرچاوی نموونەکە مەرجیان هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ شوێنی جارانیان (بەتاییەتی لادێکان). بەبەراوردکردنی

ڕێژەکـان بـەپێی تەمـەنیان لەگـەڵ ئـەو ڕێژەیـەی مـەرجیان هەیـە، دەردەکەوێت کەوا نزیکەی نیوەی ئـەو نموونەیـەی تەمـەنیان لـەنێوان ٦٣ـ٧٣ ساڵیدایە، واتە ٩٪ لە کـۆی ١٨,٣٣٪ مـەرجیان هەیە بـۆ گەڕانـەوە. هـەروەها ١٠.٣٣٪ نموونەکـە لـە هـەر یـەکێك لـــە دوو کۆمەڵەی ئەوانەی تەمەنیان لـە نێـوان ٣٠ـ٤٠ و ٤١ـ٥١ سـاڵیدایە مەرجیان بۆ گەڕانەوە هەیــە. کۆمەڵـە تەمەنییـەکانی دیکـەش بـەم جـۆرەی خـــوارەوە لەســـەر هـــەمان بـیروڕای ئەوانـــەی پێشـــوون: ٦,٦٧٪ئەوانەی تەمەنیان لە نێـوان ١٩ـ٢٩ سـاڵ، ٣,٦٧٪ ئەوانـەی تەمەنیان لەنێوان ٦٠ـ٦٩سـاڵ و ١٪ ئەوانـەی تەمـەنیان لـە نێـوان ٧٤ـ٨٤ ساڵیدایە.

هەروەها ٢٨,٣٣٪ی نموونەی باسەکەش پێیـان وایـە ناگەڕێنـەوە، بـەم شێوەیە: ٣,٣٣٪ی ئەوانـــەی تەمـــەنیان لـەنێوان ١٩ـ٢٩ سـاڵ، ٧,٣٣٪ی ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان ٣٠ـ٤٠ ساڵ، ٧,٦٧٪ی ئەوانەی تەمـــەنیان لـە نێوان ٤١ـ٥١ سـاڵ، ٤,٦٧٪ ئەوانـەی تەمـەنیان لـەنێوان ٥٢ـ٦٢ سـاڵ، ٢,٣٣٪ی ئەوانـەی تەمـەنیان لـەنێوان ٦٣ـ٧٣ سـاڵدایە، بـەڵام ئەوانـەی لەسەروو ٧٠ ساڵیەوەن ٣٪یان لەکۆی ٥٪یـان کـە نموونـەی باسـەکەمانن پێیان وایە ناگەڕێنەوە بۆ شوێنی جارانیان، ئەمەش جێگـای تێڕامانـە کـە بۆچـی بەتەمەنـەکان نایانـەوێ بگەڕێنـەوە بـۆ شـوێنی جارانیـان، ئایـــا هۆیەکەی ئەوەیە کە پێیان وایە ژیانی ئەوێ سەختە و چیدی ناتوانن لـــەوێ کاریکەن و خۆیان بژێنن هۆیەکی دیکەی لە پشتەوەیە. ئەوانـــەی بەتـەمای گەڕانەوەشن بەگشتی ٢٧,٣٣٪ی نموونەکەن و تەنیا دوو گرووپـــی ئەوانـەی تەمـــەنیان لـــەنێوان ١٩ـ٢٩ سـالّی و ئەوانـــەی تەمـــەنیان لـــەنێوان

٧٤ـ٨٤سالّیدایە نەبێت، ئەوانیتر لە هەموو کۆمەڵە تەمەنییەکان ڕێژەکانیان زۆر نزیکن لەگەڵ ئەوانەی لەهەمان کۆمەڵەی تەمەنیاندان و بەتەمای گەڕانەوە نەبوون (کە پێشتر خرانە ڕوو)، بەلاّم ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٩ـ٢٩ ساڵیدایە بە ڕێژەی ٥,٦٧٪ پێیان وایە دەگەڕێنەوە، واتە نزیکەی ٣١١ و ئەوانەی تەمەنیشیان لەنێوان ٧٤ـ٨٤سالّیدایە بە ڕێژەی ١٪ لەگەڵ گەڕانەوە دان، واتە ١\٥. هەردوو بارەکەش پێچەوانەی پێشبینی ئێمە بوون.

دوا ڕێژەش کە دەکاتە ٣,٣٣٪ بڕیاری گەڕانەوەیان نەداوە و بە نازانم وەلاّمیان داوەتەوە.

**خشتەی ژمارە (٥٧) تەمەنی نموونەکە لەگەڵ خواستی خەڵک بۆ گەڕانەوە.**

| بۆ شوێنی جاران / تەمەن | نازانم | دەگەڕێنەوە | ناگەڕێنەوە | مەرجمان هەیە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| 19-29 | 3<br>1.00% | 17<br>5.67% | 10<br>3.33% | 20<br>6.67% | 50<br>16.67% |
| 30-40 | 2<br>0.67% | 22<br>7.33% | 22<br>7.33% | 31<br>10.33% | 77<br>25.67% |
| 41-51 | 0<br>0.00% | 20<br>6.67% | 23<br>7.67% | 31<br>10.33% | 74<br>24.67% |
| 52-62 | 2<br>0.67% | 12<br>4.00% | 14<br>4.67% | 27<br>9.00% | 55<br>18.33% |

| 63-73 | 3<br>1.00% | 8<br>2.67% | 7<br>2.33% | 11<br>3.67% | 29<br>9.67% |
|---|---|---|---|---|---|
| 74-84 | 0<br>0.00% | 3<br>1.00% | 9<br>3.00% | 3<br>1.00% | 15<br>5.00% |
| کـــۆی گشـــتی | 10<br>3.33% | 82<br>27.33% | 85<br>28.33% | 123<br>41.00% | 300<br>100.00% |

# بەشی حەوتەم

## ئەنجام و راسپاردەکان

### باسی یەکەم: ئەنجامەکان

راگواستنی کوردان سیاسەتێکی دوژمنکارانە و لەهەمان کاتیشدا درێژخایەن و سەرتاپاگیر بوو. ئەم سەرتاپاگیری و درێژخایەنییەی کە تیایدا دانیشتووانی نزیکەی ٤٥٠٠ گوندی کوردستان، ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتووانی شار و شارۆچکە کوردی و عێراقیەکان راگوێزران، ئاکامگەلێکی کۆمەلایەتی، دیمۆگرافی، دەروونی، سیاسی و کولتووری ... تد بەدوادا هاتن. هەڵبەت رژێمی بەعس بۆ کۆمەڵێك ئامانج کە لە بەشەکانی سەرەتادا ئاماژەمان پێکردن ئەم سیاسەتەی لە کوردستانی باشور و عێراقدا پیادە کرد. ئامانجەکانیش ستەمکارانە و دوژمنکارانەبوون. کەچی ئەو ئاکامانەی لەو سیاسەتە کەوتنەوە مەرج نیە هەموویان سلبی بن، بەڵکو دەشێ ئاکامی پۆزەتیڤی جیاجیاشی بەدوادا هاتبن بە پێچەوانەی ویستی ئەنجامدەرانی. لە خوارەوە هەوڵدەدەین ئەو ئەنجامانەی لە میانەی پرسیارنامەکەدا یاخود لە رێگەی چاودێریکردنەوە پێیان گەیشتووین و پێمان وایە شیاوی ئەوەن ئاوڕیان لێ بدرێتەوە، دەخەینە ڕوو:

١ـ ئوردووگای زۆرەملێ ئەمڕۆ شێوەیەکی نیشتەجێبوونی دانیشتووانی کوردستانی خواروەوە. ئوردووگا دەرهاوێشتەی سیاسەتی

راگواستن و شوێنگۆڕکێی دانیشتووانە. لەبەر ئەوەی ژیانی ناو ئوردووگا جیاوازی زۆرە لە شێوازی ژیانی گوند، راگوێزراوەکان رەنجی زۆریان کێشا تاکو لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانە راهاتن. ئوردووگا تاماوەیەك بۆ راگوێزراوان نیمچە گرتووخانەیەك بوو و کاریگەریەکی نێگەتیڤی کردە سەر دەروونی تاکەکەسان.

ئەمڕۆ ئوردووگاکان بوون بە واقعێك و نەمانی راگواستن نەبووە هۆی لەناوچوونی ئەوان. ئوردووگاکان گەورە بوویین و زۆریان لە ستاتووسی گوندەوە گۆڕاون بۆ ناحیە یاخود قەزا. کێشە و گیروگرفت لە ئوردووگاکان زۆرن. وێڕای کێشە کۆمەلآیەتیەکان، کەمی خزمەتگوزاریەکان و بایەخپێنەدانیان لەلایەن دەسەلآتی کوردی و کێشەی کەمی خانوو و چڕی دانیشتووان ( بەتایبەتی لەو ئوردووگایانەی لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی رابردوو دروست کران) ئەو کێشە سەرەکیانەن کە دانیشتووانی ئوردووگاکان بەدەستیانەوە دەناڵێنن.

٢ـ زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستانی خوارو لە ئەنجامی کۆچی راگوێزراوەکانەوە ژمارەی دانیشتووانیان بەشێوەیەکی نائاسایی و ناسروشتی زیادی کرد، بەجۆرێك کە بووە هۆی ئەوەی شێوازی ژیانی لادێییانە لە زۆربەی شارەکاندا زاڵ ببێت و پرۆسەی شارنشینی لە کوردستانی خوارو دوابکەوێت. هەر لەمیانەی ئەم کۆچە بەربلآوەوە چەندین کێشەی جۆراوجۆر لە شارەکان سەریانهەڵدا. هیچ پلانێك لەلایەن دەسەلآتی بەعسەوە دانەرێژرابوو بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری پێویست بۆ تازەهاتووەکان، لە ئەنجامدا چەندین کێشەی وەك کەمی خانوو، زۆربوونی چڕی دانیشتووان، لاساریی کۆمەلآیەتی، گەڕەکە دواکەوتووەکان... هتد پەرەیان سەند. هەروەها لەدوای نەمانی رژێمی بەعسیش، دەسەلآتی کوردی نەیتوانی ئەم

کێشانە چارەسەر بکات، بەڵکو کێشەکان بەبەردەوامی مانەوە، تەنانەت ئەو پارچە زەویانەی لە گەڕەکەکانیشدا بۆ باخچەی گشتی و خزمەتگوزاری دیکە دەستنیشانکرابوون، بەرپرسە حکومیەکان لە زۆر شاردا یان بەسەر خۆیاندا دابەشیان کردن یاخود بە دەوڵەمەندەکانیان فرۆشتن.

٣ـ لەدوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بەرە بەرە خەڵکی راگوێزراو گەڕانەوە شوێنی جاران. گەڕاوەکان هەوڵیاندا گوندەکانیان ئاوەدان بکەنەوە. لەئەنجامدا بەشێکی زۆری گوندەکان ئاوەدانکرانەوە. بەڵام رێژەی ئاوەدانی گوندەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە، هەروەها گوندە سەر لەنوێ ئاوەدانکراوەکان ریتمێکی یەکدەستیان نییە و جیاوازی هەیە لەنێوانیاندا. ئەم جیاوازیەش زێتر دەگەڕێتەوە بۆ بایەخپێدانی دەسەڵاتی کوردی بە هەندێ ناوچە و کەمتر بایەخدان بەهەندێ ناوچەی دیکە، هەروەها هەڵکەوتی جوگرافی ناوچەکەش لەم بارەیەوە رۆڵی خۆی بینیوە.

بەگشتی ژیان لە گوندی سەرلەنوێ ئاوەدانکراودا وەکو جاران سەخت نییە. هەڵسوکەوت و رەفتاری کۆمەلایەتی و پەیوەندی نێوان لادێنشینەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. گوندی سەرلەنوێ ئاوەدانکراوە جیاوازە لە گوندی کۆن.

٤ـ ژیانی کۆمەلایەتیی کوردەکان بەر لە چارەگە سەدەیەك هەروەك پێشتر باسمان کرد (بگەڕێوە بەشی سێیەمی باسەکە) زۆر سادە و ساکار بوو، بەتایبەتی لە لادێ ـ خانووی سادە و بچووك، ناومالێکی کەم و هەژارانە، جلوبەرگی زۆرجار نارێك ... بەلام دوای راگواستن و تێکەلاوبوونیان کە هاوکات بوو بە باشتربوونی باری ئابووری عێراق، هاتنی ئوتومبێل و کەرەستەی کارەبایی بە رێژەیەکی بەرچاو... ژیانی کۆمەلایەتیش گۆڕانی تێکەوت. زۆربەی هەرە زۆری

نموونەکەمان بە ڕێژەی ٨٤,٣٣٪ پێیان وایە ژیانی کۆمەڵایەتیان لەو دوو قۆناغەدا زۆر لێك جیاواز بووە.

٥- پیشەی ڕاگوێزراوەکان لە دوای ڕاگواستن گۆڕانێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە. پیشەکانی ئاژەڵداری و جووتیاری کە پێش ڕاگواستن لە زۆرترین و باوترین پیشەکانی کۆمەڵگاکەمان بوون، دوای ڕاگواستن لەو پیشانە لەقەڵەم دەدرێن کە ڕاگوێزراوان زۆر کەم لەسەری ماونەتەوە. لەجیاتی ئەوە ڕوویان لە فەرمانبەری حکومی، کاسبکاری و پیشەکاری کردووە. ئەو پیشانەی جاران خەڵکی کوردستان خەریکیان بوون، خەڵکێکی زۆر کەم ئێستا مژوولیانن. ئەمەش ئەنجامی ویستی بارودۆخ و ڕەوشی بابەتی بوو نەك ویستی خۆیی ڕاگوێزراوان.

٦- پێشتر باسمان کرد لەگەڵ ڕاگواستن ڕێژەی جووتیارە ڕاگوێزراوەکان بەرەو کەمبوونەوەیەکی توند دەچێت، بەوەی کە جووتیاران چیتر زەویەکیان نییە بیکێڵن یاخود ڕەزێکیان نییە بیڕننەوە. ڕاگواستن هەمان بارودۆخی بۆ ئاژەڵدارەکانیش هێنایە پێش. ڕێژەی ئەوانەی لەدوای ڕاگواستن هیچ ئاژەڵێکیان بەخێونەکردووە چوار هێندەی ڕێژەی ئەوانەیە کە پێش ڕاگواستن هیچ ئاژەڵێکیان بەخێو نەکردووە. لەلایەکی ترەوە ڕاگوێزراوان لەدوای ڕاگواستن بەبەراورد لەگەڵ پێش ڕاگواستن زۆر کەم لە جۆرە ئاژەڵێك زیتر بەخێو دەکەن، وێڕای ئەوەش ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی هەر خێزانێك پێش ڕاگواستن بەخێویان کردوون لەگەڵ ئەوانەی دوای ڕاگواستن بەخێویان دەکەن بەراورد ناکرێت ، چونکە هێندە لە کەمیان داوە. بەکورتی سامانی ئاژەڵی لە کوردستانی باشوردا لەدوای ڕاگواستن بە توندی ڕووی لە کەمی کردووە.

٧ـ ئاین و سرۆتە ئایینیەکان بەوەی پەیوەندیەکی راستەوخۆیان بە تاکەکانی کۆمەڵگاوە هەیە، دەکرێ بە دیاردەی کۆمەڵایەتی لەقەڵەمیان بدەین. ئایین یاخود ئاییندارى و لەخواترسی وەك دیاردەی کۆمەڵایەتی هەمیشە پێشبینی ئەوەیان لێ دەکرێت بەهێز بن و رەواجیان هەبێت یاخود بەپێچەوانەوە. ئەو رووداو و بارودۆخانەی کۆمەڵگا پێیاندا تێدەپەڕێت هەر وەك چۆن کار لە دابونەریت، بەها و چەمکە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن، بەهەمان شێوەش کاریگەریان لەسەر بۆچوونی تاکەکان لەمەڕ ئایین و دینداری هەیە و ئایین یاخود بۆچوونی تاکەکان بۆ ئاین بە تێپەڕینی کات گۆڕانی بەسەردا دێت.

راگواستن وەك هەر دیاردەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر دینداری و لەخواترسی تاکەکان هەبووە. ئەو راگوێزراوانەی بەبەر چاوانیانەوە گوندەکانیان خاپوور کران و مزگەوتەکان تەقێنرانەوە یاخود تا سنووری مەرگ چوون، بیروبۆچوونیان سەبارەت بە زۆر شت گۆڕا، یەکێك لەو شتانەش ئایین بوو. بەگشتی رێژەی ئەوانەی پێیان وایە خەڵك پێش راگواستن لەخواترستر بووە گەلێك زێترە لەوانەی پێیان وایە دوای راگواستن خەڵکی لەخواترسترن، وێڕای ئەو رابوونە ئیسلامیەی کوردستانی باشور لە دەیەی رابردوودا بەخۆیەوە بینی.

٨ـ راگواستنی کوردەکان لە عێراقدا بەوەی کە زێتر لە شێوازێك و لە جۆرێکی هەبوو، بەشێوەی جۆراو جۆریش دانیشتووانی کوردستانی باشوری تێکەڵ بەیەکتر کرد. واتە هەندێك لە راگوێزراوەکان لە شوێنی نیشتەجێبوونی پێشوویان زۆر دوور خرانەوە، هەندێکیشیان لە شوێنی نزیك لە ناوچەکەیان نیشتەجێکرانەوە، بەڵام ئەم دوور و نزیك بردنەیان هیچی لەو راستیە نەگۆڕی کە کوردەکانی باشور زۆر کەم تێکەڵاوی یەکترن و کەمیش یەکتر دەناسن. دەکرێ بڵێین راگواستن

توانـی زۆرتریـن خـەڵکی کوردسـتانی باشـور بەیـەکتر ئاشـنا و تێکەڵیان بکات.

بەگشتی، ٨٩,٣٣٪ی نموونەکەمان پێیان وایە دوای راگواستن ئـەو وێنەیەی ئەوان بۆ خێـڵ و خـەڵکی ناوچـەکانی دیکـە لـە زەینیـاندا کێشابوو گۆڕانی تێکەوت و ٧٢,٦٧٪ ی رێـژەی سـەرەوە پێیـان وایـە وێنەکە جوان بووە. ئەمـەش ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات کـە کوردەکـان بەزۆری بۆچوونێکی نێگەتیڤیان بەرامبەر یەکتر هەبووە. دەکرێ بڵێـین گۆڕانی ئەم وێنـە ناشـیرین و بۆچوونـە نێگەتیڤـە لـەدوای راگواسـتن یەکێکە لەو خاڵە ئیجابییانەی لە راگواسـتن کەوتوونەتـەوە. گریمانـەی دووەمـی تۆژینەوەکـەش جـەخت لـەو بـارە دەکـات کـە لـە سـەرەوە ئاماژەی پێکرا.

لەلایەکی دیکەوە، رێژەیەکی زۆری راگوێزراوەکـان (٤٥,٨٢٪) دان بەوەدا دەنێن کەوا هەستیان کردووە خەڵکی ئەو ناوچەیەی ئـەوانی بـۆ راگوێزراون خۆشیان نەویستوون، دەکرێ بەشێکی زۆری ئەمەش بۆ ئەو وێنەیە بگێڕینەوە کە لە زەینیاندا بوو. لەبەرامبەر ئەمانەشـدا تـەنیا ٢٧,٩٪ راگوێزراوەکـان پێیانوایـە خـەڵکی ئـەو ناوچەیـەی بـۆی راگوێزراون ئەوانیان خۆشویستووە. ئەمە رێژەیەکی زۆر کەمـە ئەگـەر دوو خاڵ لەبەر چاو بگرین: یەکەم، بەشێکی راگوێزراوەکان لە هـەمان ناوچەی خۆیـان و لـە ئوردووگایـەکدا کۆکرانـەوە کـە هـەر خـەڵکی ناوچەکـەی خۆیـان و خـەڵکی خێڵەکـەیان بـوون. دووەم، بەشـێکی بەرچاوی راگوێزراوەکان ئەنفالکراوەکان بـوون و لـە سـەفەری مـەرگ گەڕابوونەوە و خراپترین رەوشی ئابووری، کۆمەڵایـەتی، تەندروسـتی و دەروونیان هەبوو، ئەمەش سۆزی خەڵکی بۆ لای ئەوان رادەکێشا.

دواجاریش ٩٥,٣٣٪ی نموونەکەمان پێیان وایە راگواستن هۆکارێك بوو ئەوانی زێتر تێکەڵاوی خەڵکی ناوچە و خێڵەکانی دیکە کرد و لەدوای راگواستن ئەوان زێتر شارەزای کوردستان و خەڵکەکەی بوون.

٩ـ جلوبەرگ، وەك رەگەزێکی گرنگی ناو کولتووری هەرکۆمەڵگایەك، پەیوەندیەکی توندوتولی هەیە بە ژینگەی سروشتیی کۆمەڵگا و باری دەروونیی تاکەکان. جلوبەرگ لە کوردستانی باشور لەدوای راگواستنی کوردان لە عێراقدا بەتایبەتیش راگواستنی خەڵکی لادێنشین، رووبەڕووی گۆڕانێکی گەورە هات. ئەم گۆڕانەش سەبارەت بە پیاو، ئافرەت و توێژی لاو جیاوازیی هەیە بەم شێوەیە: ٨٧٪ی نموونەکەمان پێیان وایە جلوبەرگی لاوان و ٥٨٪جلوبەرگی ئافرەتان و ٤٦٪ جلوبەرگی پیاوان زۆر گۆڕاوە. ئەوانی دیکەش پێیان وایە گۆڕانێکی کەم بەسەر جلوبەرگ دا هاتووە. ئەوەشیان کە جلوبەرگی گەنجان ئینجا ئافرەتان و دواجار هی پیاوان زێتر گۆڕاوە شتێکی پێشبینی کراوە و هەمیشە گەنج و دواتریش ئافرەت ئەگەری گۆڕانیان زێترە لە پیاو.

١٠ـ منداڵبوون وەك بابەتێکی دیمۆگرافی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە. لەدایکبوونی منداڵان ئەگەرچی مەسەلەیەکی فیسیۆلۆجیە، بەڵام دابونەریت و بەها و پێودانگە کۆمەڵایەتیەکان وێڕای باری تەندروستی رۆڵێکی زۆر دەبینن لە زۆربوونی رێژەی لەدایکبوون یاخود سنووردارکردنی رێژەکەیان. کۆمەڵگای کوردی بەوەی کۆمەڵگایەکی تارادەیەکی زۆر نەریتخواز و ئایینیە سنووردارکردنی رێژەی لەدایکبوونی منداڵان لەدوای راگواستن بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە رێژەیەکی زۆرتری نموونەکەمان (٤٤٪) پێیان وایە دوای راگوستن منداڵ زێتر لەدایك دەبن لە بەرامبەر ٢٩٪ کە پێیان وایە پێش راگواستن زێتر منداڵ لەدایك دەبوون. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە باری تەندروستیی

دایکان، کەمبوونەوەی کاری قورس و کەمبوونەوەی ڕێژەی مردنی منداڵان لەلایەك و کەمی هوشیاریی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی لەلایەکی ترەوە کاریگەریان هەبووە لەسەر زێدەبوونی ئەو ڕێژەیە.

١١ـ هاوسەرێتی وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕێسا و پرەنسیپی تایبەت بەخۆی هەیە و کەم تا زۆر لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دیکە جیاوازی هەیە. هاوسەرێتی ئەگەرچی ئەمڕۆ لە جیهاندا لە شێوەی فۆرمی جیاوازدا خۆی دەردەخات و گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە، بەتایبەتی لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان، بەڵام لە کوردستانی باشوردا وێڕای چەند گۆڕانکاریەکی کەم کە بەسەر میکانیزمی بەهاوسەربووندا هاتوون، هاوسەرێتی وەکو خۆی ماوەتەوە.

بەگشتی ٦٢٪ی نموونەی باسەکەمان پێیان وایە ئەم پرۆسەیە (بەهاوسەربوون) پێش ڕاگواستن ئاسانتر پێکدەهات. لە بەرامبەریشدا کەمتر لە نیوەی ڕێژەی سەرەوە، واتە ٣٠,٣٣٪ی نموونەکەمان لەو بڕوایەدان لەدوای ڕاگواستن ژنهێنان و مێردکردن ئاسانترن.

١٢ـ کێشە کۆمەڵایەتیەکانی وەك تەڵاق، خۆکوشتن، مەسەلەکانی شەرەف هتد لەدوای ڕاگواستن بەپێی گوتەی زۆرینەی نموونەکە (تەڵاق ٨٧,٣٣٪، خۆکوشتن ٨٧,٣٣٪، مەسەلەکانی شەرەف ٨١٪) زیادیان کردووە. ئەم خاڵەش ڕاستی گریمانەی پێنجەمی تۆژینەوەکە دەسەلمێنێت. هۆی زۆربوونی ئەم کێشە کۆمەڵایەتیانە بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵاوبوونی خەڵك، ئاڵۆزتربوونی ژیان، نەبوونی پرۆگرامێکی چاکسازی کۆمەڵایەتی، ستەمی سیاسی وڵات، ئەو شەڕانەی عێراق و کوردستانی باشور بە خۆیانەوە بینیان و خراپ بوونی باری ئابووری لە دەیەی ڕابردوو.

١٣ـ کارکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە. مرۆڤ لە هەموو سەردەمێك و لە هەموو کۆمەڵگایەکدا بۆ ئەوەی بژیت پێویستی بە

کارکردنه. کەچی ڕێژەی کارکردنی تاکەکان نەك لە نێو کۆمەڵگا جیاوازەکاندا، بەڵکو لەنێو کۆمەڵەیەکی چەند کەسیشدا ( وەك خێزان) جیاوازی هەیە. زۆرینەی نموونەکەمان بە ڕێژەی ٨٤,٣٣٪ پێی وایە پێش ڕاگواستن زێتر کاریان کردووە. بەشێکی ئەم مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی تایبەتی لادێنشینی، بەوەی لادێنشینان خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین و ئەم دوو بوارەش هەم دەستی کاری زێتر و هەم ڕێژەی کاری زێتریان پێویستە. بەشێکی دیکەی بەتایبەتیی سەبارەت بە ڕاگوێزراوەکانی بەر لە ساڵی ١٩٨٠، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو بارە ئابووریەی عێراق کە هێشتا گەشەیەکی بەرچاوی نەکردوون کە تێکڕای تاکەکانی وڵاتی عێراقی لێ سوودمەند بن. بەشێکی دیکەشی ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو بێکاریە زۆرەی لە دەیەی کۆتایی سەدەی ڕابردوودا باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا.

١٤ـ یەکێك لە ئامانجەکانی ڕاگواستن لاوازکردنی هوشیاریی نەتەوەیی‌ی کوردەکان و لەناوبردنی شۆڕشی کورد بوو. ڕەنگە لە لاوازکردنی شۆڕشدا هەندێك سەرکەوتووبێت، بەڵام سەبارەت بە هەستی نەتەوەیی وەك لە ئەنجامەکاندا دەردەکەوێت ڕاگواستن کاریگەریەکی ئیجابی هەبووە، چونکە ٥٧,٦٧٪ نموونەی باسەکەمان پێیان وایە لەدوای ڕاگواستن هەستی نەتەوەییان بەهێز بووە، لە بەرامبەردا تەنیا ١٢,٣٣٪ نموونەکە پێیان وایە دوای ڕاگواستن هەستی نەتەوییان بەرەو لاوازی چووە. لەلایەکی دیکەشەوە ئەو تێکەڵاویەی لە ئەنجامی ڕاگواستندا ڕوویدا سایکۆلۆژیەت و هەست و خۆلیای نەتەوەیی تاکەکانی کۆمەڵگای کوردی لێك نزیك خستنەوە. جگە لەوەش وردە کولتووورە جیاوازەکان بەیەکتر کاریگەر بوون و زۆرترین خەڵك توانیان ئاشنای دیالێکت و شێوەزارەکانی دیکە بن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە بەرژەوەندی پرۆسەی بەنەتەوەبوونی کورد دا بوو.

١٥ـ خوێندن و خوێندەواری وەك چالاكیی كۆمەڵایەتی پەیوەندیەكی توندیان هەیە بە سستەمی سیاسی وڵات، دامەزراوە پەروەردەییەكان، باری ئابووری و هوشیاری كۆمەڵایەتیەوە. هەر وەك روون و دیاریشە هەموو ئەو رەگەزانەی سەرەوە لە كۆمەڵگای كوردی بەتایبەتیش لە لادێكاندا یارمەتیدەر نەبوون لە بەرزكردنی ئاستی خوێندەواری ، بەڵام وەكو راگوێزراوەكان دانیپێدادەنێن راگواستن كاریگەریی لەسەر ئەم بوارەش هەبووە وەك زۆر لە بوارەكانی دیكە، ٩٣٪ نموونەكەمان پێیان وایە راگواستن كاری لە خوێندنی منداڵەكانیان كردووە. رێژەیەكی بەرچاوی ئەمانە، واتە ٨١,٣٣٪ پێیان وایە كاریگەریەكە ئیجابی بووە و باری خوێندنیان بەرەو باشی چووە.

١٦ـ باری تەندروستی لە ئۆردووگا و شارەكان لەرووی بوونی پزیشك و داوودەرمانەوە بەراورد ناكرێ لەگەڵ لادێ یاخود لەگەڵ دەیەی حەفتاكان. لەگەڵ ئەوەشدا نموونەی باسەكەمان بە رێژەی ٨٢٪ پێی وایە دوای راگواستن نەخۆشیەكان (جەستەیی، دەروونی) لە كۆمەڵگای كوردیدا زیادیان كردووە.

ئەو هۆكارانەی ئەوان دەستنیشانیان كردوون، ئەوانەن كە راگواستن رۆڵی هەبووە لە دروستكردنیاندا. واتە زۆربەی راگوێزراوەكان ئەو هۆكارانە بە هۆی نەخۆشیەكان دەزانن كە لە ئاكامی راگواستنەوە سەریانهەڵداوە وەك پیسبوونی ژینگە، زۆربوونی چڕی دانیشتووان، بەدخۆراكی و خەم و خەفەت ... لێرەشدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە راگواستن كاریگەریەكی سلبی لەم بوارەدا هەبووە.

١٧ـ نموونەی باسەكەمان بە رێژەی ٦٦,٦٧٪ پێیان وایە پێش راگواستن باری ئابووریان باشتر بووە، لە بەرامبەر ٢٣,٦٧٪ كە پێیان وایە دوای راگواستن باری ئابووریان باشترە. رێژەیەكی كەمی راگوێزراوە كوردەكان لەلایەن حكومەتەوە قەرەبوو كرانەوە، ئەوانی تر جگە لە

ماڵوێرانی و هەندێ جار سەرگەردانیەکی زۆر شتێکی دیکەیان لە ڕاگواستن چنگ نەکەوت. ڕاگوێزراوەکان زۆربەی زۆریان نەخوێندەواربوون و تەنیا پیشەیەك کە تیایدا شارەزاییان هەبوو کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون، ئەو پیشانەش بە کەلکی ژیانی ئوردووگا و شار نەهاتن.

١٨ـ دیاردەیەکی دیکە کە بەهۆی ڕاگواستنەوە بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر پەرەی سەند، سیخوڕی و دەست تێکەڵکردن بوو لەگەڵ بەعسیەکان. نموونەکەمان بە ڕێژەی ٧٣,٦٧٪ پێیان وایە ئەم دیاردەیە لە ئوردووگا ـ شار ـ زێتر بوو، لە بەرامبەردا تەنیا ١٤٪ پێیان وایە لە گوند زێتر بوو. ئەم دیاردەیە لەدوای ڕزگاربوونی بەشێکی زۆری کوردستانی باشور لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ نەك هەر بنەبڕ نەبوو، بەڵکو لەناو دامودەزگا حزبی و حکومیەکاندا پەرەی سەند و وەکو خوویەك کە پێشتر فێری ببوون وازیان لێ نەهێنا، چونکە پاڵنەرەکانی فێربوون و بەردەوامبونی لەدوای ڕاپەڕین زێتر بوون.

١٩ـ ئازادیی ئافرەت یەکێکە لەو چەمکانەی ماوەیەکی درێژە جێگەی باس و پرسی کۆمەڵناس، فەیلەسوف و بیریارانە. ئازادیی ئافرەت لەم سەردەمەدا بەزۆری وەك نیشانەیەکی پێشکەوتنی میللەتان سەیر دەکرێت. لەم بارەیەوە ڕاگواستن لێدانێك بوو بەر ئازادی ئافرەتە ڕاگوێزراوەکان کەوت. نموونەکەمان بە ڕێژەی ٥٥٪ پێی وایە پێش ڕاگواستن ئافرەت لە کۆمەڵگای کوردیدا ئازادتر بوو. تەنیا ٣١,٦٧٪ نموونەکە لەو بڕوایەدان لەدوای ڕاگواستن ئافرەت ئازادترە. ئەمە لە کاتێکدایە کە دانیشتووانی کوردستان خوێندەوارتر و هۆشیارترن لە پێش ڕاگواستن و حکومەتی هەرێم و حزبەکان پێیانوایە دەرفەتی گەورەیان بۆ ئافرەت ڕەخساندووە، هەروەها ئافرەت زێتر لە جاران بۆی ڕێدەکەوێ بچێتە نێو فەرمانگە جیاجیاکانەوە، بەڵام دیارە هەموو ئەمانەی لەسەرەوە باسکران ڕێگەیەك نین بۆ ئازادیی ئافرەت.

سەبارەت بە مامەڵەی پیاویش لەگەڵ ئافرەت بەپێی رای نموونەکە گۆڕانێکی وای بەخۆوە نەبینیوە کە شایانی باسکردن بێت. دەکرێ ئاماژە بەوەش بکەین کە لەمەڕ دوو خاڵی سەرەوە (ئازادی ئافرەت و مامەڵەی پیاو لەگەڵ ئافرەت) بۆچوونی دوو رەگەزەکە زۆر لە یەکتر نزیکە و ناتوانین هەست بە جیاوازیەك کە شیاوی باسکردن بێت، بکەین.

٢٠ـ دابونەریتەکانی کۆمەڵگای کوردی لە دوو قۆناغی پێش راگواستن و دوای راگواستندا گۆڕانێکی زۆریان بەخۆوە بینیوە. ئەمەش راستی گریمانەی چوارەمی تۆژینەوەکەمان دەردەخات. ئێمە ناتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە راگواستن تاکە فاکتەری ئەو گۆڕانەیە، یاخود بەدەر لە هۆکاری راگواستن دابونەریتەکان ئەو گۆڕانەیان بەخۆوە نەدەبینی، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەکرێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە راگواستن رۆڵێکی سەرەکی بینیوە لە گۆڕان و خێراکردنی ئەو پرۆسەیە. هەروەها ئەو گۆڕانەی بەسەر دابونەریتەکاندا هاتووە ئەگەرچی لەگەڵ حەز و ویستی رێژەیەکی بەرچاوی راگوێزراوەکاندا رێك نایەتەوە، بەڵام زۆرینەی راگوێزراوەکان پێیان باشە، بەرای ئێمە هەر ئەو بۆچوونەی دووەمیشە وای کردووە رادەی خێرایی‌ی گۆڕانەکە زیاتر بێ.

٢١ـ نموونەکەمان بە رێژەی ٨٣,٦٧٪ پێیان وایە دوای ئەوەی رادەگوێزرێن و تێکەڵاوی خەڵکانی دیکە دەبن و دابونەریتەکانیان دەکەونە بەر هەڕەشەی گۆڕان و بە شێوازێکی تارادەیەك جیاواز لە شێوازی پێش راگواستن دەژین، چەمکەکانی وەك مەردایەتی، پیاوەتی، برادەرایەتی، وەفاداری، مەردایەتی... هتد دەگۆڕێن و دەلالەتێکی نوێیان دەبێت. ئەمەش تاڕدەیەکی زۆر لەگەڵ گریمانەی سێیەمی تۆژینەوەکەمان یەکدەگرێتەوە.

## باسی دووەم: ڕاسپاردە و پێشنیار

ڕاگواستن کردەیەکی سیاسی ی ڕووت نەبوو، بۆیە لەگەڵ نەمانی ڕژێمی بەعس ، ناکرێ دۆسیەی ڕاگواستن و کۆچپێکردن دابخرێت. ڕاگواستن سیاسەتێکی فرە ڕەهەندی فرە مەبەست بوو، هەروەها سەرتاپاگیر و درێژخایەن. لەئەنجامی ئەم سیاسەتەدا گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی و تەنانەت ژینگەیی بەسەر کوردستانی خوارووددا هاتووە. دیمۆگرافیای کوردستانی باشور، بونیادی کۆمەڵایەتی، شار و لادێکان، ژێرخانی ئابووری، پێکهاتەی کولتووری و و زۆر لایەنی دیکە ڕووبەڕووی گۆڕان بوونەتەوە.

لەمیانەی تۆژینەوەکە (بەتایبەتی ئەنجامەکان)دا، هەندێ لە لایەنە نێگەتیڤەکانی ئەم سیاسەتە بەرچاوخران. بەشێکی ئەو لایەنە سلبیانە هێشتا ئامادەییەکی بەردەوامیان هەیە. بۆکەمکردنەوەی ئەم لایەنانە و گێڕانەوەی ئەو بارانەی پێشتر باسکران بۆ حاڵەتی سروشتیان، بەپێویست دەزانین هەندێك پێشنیار بخەینەڕوو بەو هیوایەی سوودمەندبن:

١ـ لەئەنجامی سیاسەتی ڕاگواستندا دیمۆگرافیای کوردستانی باشور گۆڕاوە، گۆڕانەکەش لەدژی بەرژەوەندی نەتەوەیی کوردە. سنوورەکانی کوردستانی باشور سەرەتا لە ئەنجامی بەیاننامەی ١١ی ئادار و دواتریش بە کردەوە بەهۆی سیاسەتی ڕاگواستنی کوردان و نیشتەجێکردنی عەرەبەکان و گرتنەبەری ڕێوشونە جیاجیاکانی بەعەرەبکردن تەسك کراونەتەوە. یەکێك لە میکانیزمەکانی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش دەرکردنی عەرەبە هاوردەکانە بۆ بەخشینەوەی ناسنامەی کوردی بەو ناوچانە. هەرچەند جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیە لەم بارۆدوخەی ئێستادا هەندێك قورسە، بەڵام زۆر گرنگە و تا زووە دەبێت بکرێت. بۆیە پێویستە لەسەر دەسەڵاتی

کوردی بەوردی بیر لەم مەسەلەیە بکاتەوە و هەر چۆنێك بێت بارەکە ئاسایی بکرێتەوە و کوردەکان بۆ شوێنەکانیان بگەڕێنرێنەوە.

٢ـ ڕاگواستن وەکو ئەنفال و کیمیاباران تاوانێکە دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت، واتە سەرەڕای نەمانی بەعس لە دەسەڵاتدا، یاخود سزادانی ئەنجامدەران، تاوانەکە لە ئەستۆی دەوڵەتی عێراقدا هەر دەمێنێتەوە. پێویستە دەوڵەت ناچار بکرێت قەرەبووی مادی و مەعنەوی ڕاگوێزراوەکان بکاتەوە.

٣ـ هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و داتا، دەکومێنت و نووسراوی تایبەت بە ڕاگواستن لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە ئەنجامدانی ئامارێکی وزد و تایبەت بە ڕاگوێزراوەکان و گوندە خاپوورکراوەکان، هەروەها هاندانی توێژەران بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاگواستن و ڕەهەندەکانی لە بوارە جیاجیاکاندا، چونکە ڕاگواستن بەشێکی گرنگی مێژووی هاوچەرخی ئێمە پێکدێنێت ، لەسەرێکی دیکەشەوە هەست بە کەمتەرخەمی تەواو دەکرێت لەلایەن دەسەڵاتی کوردیەوە.

٤ـ لە ئەنجامی کۆچی زۆرەملێی خێرا و بەلێشاوی لادێنشینان بۆ شارەکان، شار و شارۆچکەکان تەنیا گەورە نەبوون و چڕی دانیشتووانیان زیادی نەکرد، بەڵکو کۆمەڵە کێشە و گرفتێکی کۆمەڵایەتی لێ کەوتنەوە. هۆی سەرەکی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی ئەم کێشانەش بێ توانایی و کەمی خزمەتگوزاریەکان بوو لە شارەکاندا. بۆیە دەستەبەرکردنی خزمەتگوزاریە جیاجیاکان بۆ دانیشتووی شارەکان و کاراکردنی دامەزراوە و ڕێکخراو و سەندیکاکان دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەو کێشەو گرفتانە.

٥ـ ئۆردووگا زۆرەملێکان زۆرترین خەڵکی ڕاگوێزراو لەخۆدەگرن، ئەم ئۆردووگایانە نەلەلایەن ڕژێمی بەعسەوە و نە لەلایەن دەسەڵاتی کوردیەوە، بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەدراوە. بۆیە کێشە و گرفت لەم ئۆردووگایانەدا زۆرن. پێویستە دەسەڵاتی کوردی بایەخێکی تایبەتی

به ئۆردووگاکان بـدات و خزمـەتگوزاری جیاجیـا بـۆ دانیشـتووانیان دەستەبەر بکات. وێڕای دابەشکردنی پارچەزەوی بەسـەر دانیشـتووانی ئـەم ئوردووگایانـە، چونکـە کێشـەی خانووبـەرە بـە ئاشـکرایی لـە ئوردووگاکاندا هەستی پێدەکرێت.

٦ـ لەدوای ڕاگواستن ژمارەیەکی بەرچاو گوند سـەرلەنوێ ئـاوەدان کرانـەوە. ئـەم گونـدە ئاوەدانکراوانـە لـەڕووی بایەخپێدانـەوە لـە ناوچەیەکـەوە بـۆ ناوچەیـەکی دیکـە جیـاوازن، پێویسـتە لەسـەر حکومەتی هەرێم بەچاوێکی یەکسـان سـەیری لادێنشـینان بکـات ، بەچاوپۆشـیکردن لـە ئینتیمـای حزبییـان. هـەروەها کـاربکرێت بـۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو گوندانەی دیکەش بەشێوەیەکی مۆدێـرن کـە تـا ئێستا ئاوەدان نەکراونەتەوە.

٧ـ لەسەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکـان، زۆر گرنگـە ڕەچـاوی جۆر و شێوەی سروشت و ژینگەکانیان بکرێ و کەلوپـەل و کەرسـتەی بیناکردنی لەبار و گونجاو دابین بکرێ.

٨ـ بـۆ چاکـتر کـردن و بـەرەو پێشـەوەبردنی شـێوازی ژیـان، بەتایبـەتیش لـە گونـد و شـارۆچکە و ئوردووگاکـان، پێویسـتە پرۆگرامێکی زانستیانەی کۆمەڵایەتیی چڕ و بەتێن پیـادەبکرێت بـۆ فـێرکردن و هوشـیارکردنەوەی خـەڵك ... بـۆ نموونـە: چەسـپاندنی کولتووری دارچـاندن، پـاك و خـاوێنی، کـارکردن بـەپێی پلانێکـی زانستیانەی بیناکردن.

# پێرست

| | |
|---|---|
| پێشەکی ........................... | ٣ |
| **دەروازەی یەکەم: لایەنی تیۆری** | ٨ |
| بەشی یەکەم: میتۆدو رەهەندەکانی تۆژینەوە......... | ١١ |
| بەشی دووەم: چەمکەکانی تۆژینەوە.................. | ١٩ |
| بەشی سێیەم: کۆمەڵگای کورد پێش راگواستن.......... | ٥٧ |
| بەشی چوارەم: قۆناغەکانی راگواستنی کوردان لە عیراقدا | ١٠١ |
| **دەروازەی دووەم: لایەنی مەیدانی** | ١٦٣ |
| پێشەکییەکی میتۆدی بۆ کاری مەیدانی ............ | ١٦٥ |
| بەشی پێنجەم: دوای راگواستن، ئۆردوگا زۆرەملێکان، شارو لادێ........................... | ١٧٢ |
| بەشی شەشەم: خستنە روو و خەسڵەتە گشتییەکانی تۆژینەوە............................ | ٢٢٩ |
| بەشی حەوتەم: ئەنجام و راسپاردەکان.............. | ٣٣٥ |